## پێشکەشە

پێشکەشە بەئامۆزای شەهیدم ئەنوەر حەمە ئەمین قەرەداخی (هیوا) و هاوەڵەکانی تری کە لەبەندیخانەی موسڵ لەسێدارە دران.

# پێشەکی

رەنگە رێکەوتێکی سەیر بێت، نووسەرێکی گەورەو ناسراو، لەلایەن کەسێکەوە پێشکەش بەخوێنەرانی ئازیز بکرێت، کە وەکو ئەو ناسراو نەبێت. نووسینە کوردیەکانی کاك حەمە دۆستان، کە بەشێکی زۆری لێرەدا بلاو دەکرێتەوە، نەپێشەکی دەوێ و نە بەخەڵك ناساندنی دەوێ. .

رەنگە لای بەشێك لەخوێنەران حەمە دۆستان یان حەمە قەرەداخی، ناوێکی نوێ بێت. ئەم ناوە تەنیا لای رووناکبیرانی دەرەوەی وڵاتو بەتایبەتی لەسوید ناسراوبێتو لای خۆمان ژمارەیەکی زۆر کەم ئەم ناوەیان بەرگوێ کەوتبێت.

ئەوەندەی پێبزانمو ئاگاداربم، ئەو بەسویدی دەنووسێتو لەسویدیەوە بۆ زمانەکانی تر، کارە گەورەکانی وەردەگێڕدرێتو بلاودەکرێتەوە. رەنگە یەکەمین جار بێت دەزگایەکی کوردی ـ رووناکبیری بایەخ بەنووسینەکانی ئەو بدات. دیارە ناوەڕۆکی نووسینەکان هاندەر بوون بۆ کۆکردنەوەو چاپکردنی لەلایەن ئێمەوە، چونکە ژمارەیەکی زۆر لەخوێنەران پەیوەندییان پێوەکردینو هیوایان دەربڕی هەموو نووسینەکان پێکەوە بلاوکەینەوە، ئێمەش نەمانتوانی دڵیان بشکێنین.

**جەعفەر**

# کۆمەڵ و سیستمی دیموکراتی

## حەمە دۆستان ـ سوید

### ئیدیۆلۆگی Ideologi

Descartes دەڵێ: "بیر بینینێکە یاخود ئەو ڕوانینانەیە کە لەکاتی بەئاگاییدا دەردەکەوێ. کانت (Kant) دەڵێ: "بیر ئەوبنچینانەیە کە زانیاریەکان بەجۆرێك ڕێکدەخات و بەکاردەهێنێ کە لەگەڵ هەڵسوکەوتی ڕۆژانەمان دا بگونجێ." ئەفلاتوون (Platon) دەڵێ: "بیر بەرزترین لووتکەی حەقیقەتە."

Ideologi لە وشەیەکی لاتینییەوە هاتووە بەمانای زانستی بیروبیرکردنەوە دێت. بۆ یەکەمین جار لەساڵی ١٦٩٨ دا فەیلەسووفی فەرەنسی دیتراسی (Destutt de Tracy) لەگۆڤارێکدا باسی Ideologi کردووە، لایەنگیرەکانی دیتراسی لەسەردەمی شۆڕشی فەرەنسیدا بە "ئیدیۆلۆگەکان" ناسراو بوون.

لەسەدەی ١٨دا گرنگیەکی گەورە بەئیدیۆلۆگی درابوو لەلایەن: کارل، مارکس و، ئەنجلس و فەیلەسووفەکانی تری هاوچەرخیانەوە. ئیدیۆلۆگی پێك هاتوە لە٣ بەش: بەشی یەکەمین شیکردنەوەیە: هەر ئیدیۆلۆگیەك بگریت بەوردی باسی بەڕێوەبردنی کاروباری کۆمەڵی کردووەو وەڵامی ئەو پرسیارانەی داوەتەوە کە چۆن ئەتوانرێت کۆمەڵگاییەك لەسەر بنچینەی ئەو ئیدیۆلۆگیە دابمەزرێنرێت.



بەشی دوهەمین کۆمەڵگای نموونەییە: ئامانجی ئیدیۆلۆگی گەیشتنە بەو کۆمەڵە نموونەیەی کە لەئیدیۆلۆگیەکدا مەبەستە ڕۆژێ لە ڕۆژان پێیی بگەن. بەشی سێهەمین ستراتیگییە: هەموو ئیدیۆلۆگیەك پەیڕەوو پڕۆگرامی سیاسیی تایبەتی خۆی هەیە بۆ ئەوەی چۆن بیگەیەنێتە ئەو کۆمەڵە نموونەیەی کە ئیدیۆلۆگییەکە مەبەستیەتی.

### سۆسیالیزم Socialism

سۆسیالیزم ئیدیۆلۆگییەکی سیاسیی و ئابووریە، ئامانجی بەدیهێنانی کۆمەڵگایەکی یەك چینە کە ئامرازی بەرهەمهێنانی کۆمەڵ موڵکی چینی کرێکاران بێت و کەس بۆی نەبێت سوودی تایبەتی وەربگرێ لەهێزی کاری کەسێکی تر. هەمووکەس بۆیان هەبێت بەپێی توانا بەشداربن لە بەرهەمهێنانداو بەپێی پێویستی تایبەتی خۆیان و پێداویستیەکانی ژیانیان سوود لە بەرهەمی کۆمەڵ وەربگرن. مێژووی موڵکایەتی هاوبەش کۆنە، ئەفلاتون (Platon) ٣٤٧ ـ ٤٢٧ (پ. ز) باسی کردووە، هەروەها لەسەردەمی شۆڕشی فەرەنسیدا ١٧٨٩ باسی بیری مۆڵکایەتیی هاوبەش کراوە. بەڵام ئەمانە ناکۆکیان لەناو خۆیاندا هەبووە لەسەر چۆنێتی گەیشتن بەکۆمەڵێکی سۆسیالستی. هەندێکیان بڕوایان بەگۆڕانی ئاشتی خوازانە هەبووە، بۆ ئەوەی بیانگەیەنێتە کۆمەڵگای سۆسیالیزم ئەوانی تر بڕوایان بە بەکارهێنانی توندوتیژی هەبووە.

ئیدیۆلۆگی سۆسیالیزم لەلایەن مارکس و ئینگلسەوە گەشەی پێدراوە، بەتایبەت کاتێك مانوفێستی کۆمۆنیستیان لەساڵی ١٨٤٨دا بڵاوکردەوە. مارکس لەوبڕوایەدا بووە کە بارودۆخی بەرهەمهێنان لە وڵاتی سەرمایەداریدا کەمایەتیەکی بچووکی خاوەن موڵك دێنێتە کایەوە کەدەبنە خاوەنی ئامرازی بەرهەمهێنان. بەشی

**هەرە زۆری چینی ناوەڕاستو چینی جوتیاران لەنێوان چینی کرێکاران داو بەشێکی کەمیان لەچینی بۆرجوازی دا دەتوێنەوە. بەپێی مارکسو ئینگلس لەنێوان هێزی بەرهەمهێنەرو ئامرازەکانی بەرهەمهێنان کێشەی سەخت دێنێتەکایەوە کە ڕێگا بۆ شۆڕشی کرێکاران خۆش دەکاتو لەڕێگای چینی کرێکارەوە دەست بەسەر ئامێرەکانی بەرهەمهێنانی کۆمەڵەکە دەگیرێتو بەو جۆرە کۆمەڵگایەکی سۆسیالیست دادەمەزرێت کە هەرکەس بەقەدەر توانای خۆی ئیش کاتو بەقەدەر پێویستی خۆی سوود لەبەرهەمی کۆمەڵی سۆسیالیزم وەردەگرێ.**

## **لینینیزم** Leninism

**لینین لەشاری** "Simbirsk" **"رووسی لەدایك بووە. باوکی پشکنەری قوتابخانە بووە. لەزانکۆی** Kazan **دەستی کردووە بەخوێندنو پاشماوەیەك بۆتە ئەندامی ئۆپۆزسیۆن کە ئەو سەردەمە ڕێکخراوێکی نهێنی بووە. ساڵی ١٨٩١دا قانوونی تەواو کردووە وەکو پارێزەر کاری کردووە. لەساڵی ١٨٩٥سەندیکای چینی کرێکارانی ئازادی دامەزراندووە. پاشماوەییەکی کورت لینین گیراو ساڵێك خرایە زیندانەوەو دوو ساڵیش دوای ئەمە نەفی کرا بۆسیبیریا. لەو سەردەمەدا لینین کتێبی "گەشە کردنی سەرمایەداری لەرووسیادا" بڵاوکردەوە. لەساڵی١٩٠٠ڕۆیشت بۆسویسرا دواتر بۆ پاریس. لەوێ لەگەڵ پەنابەرە سۆسیالیستەکاندا ڕۆژنامەی** (Iskra ) **پزیسکیان[*] دەرکرد. لینین گەشەی دا بەتیۆری شۆڕشێکی سۆسیالیست بە سەرکردایەتیی چینی کرێکار. ئەوەی شایەنی باسە کە لینین ئیزافەیەکی گرنگی خستە سەر ئەو ئیدیۆلۆگیەی کەوەختی خۆی مارکسو ئینگلس ئیشارەیان بۆ نەدابوو. بەپێی بینینی لینینیزم شۆڕشی "پرۆلیتاری" لەڕێگای پارتێکی ڕێکخەرەوە**

---

[*] **واتای پریشکی ئاگرە، بەزمانی عەرەبی واتا (شرارە)**



**سەردەکەوێت کەبتوانی ڕێپیشاندەری چینی پرۆلیتاریای رووسی بکات.. لینین بڕوای بەوە بوو کە ئەبێت پارتێکی شۆڕشگێڕ دابمەزرێت کە بتوانێ جەماوەر کۆبکاتەوە، سەرکردایەتیان بکات. ناکۆکییەکانی نێوان بزوتنەوەی سۆسیالیستی ساڵی ١٩٠٣ لە لەندەن مەنشیفیكو بەلشیفیکی لێهاتەکاییەوە. بەلشیفیکییەکان سەر بەلینین بوونو بڕوایان بەشۆڕشی چینی کرێکار بوو، بۆ گەیشتن بە سۆسیالیزم، مەنشیفیکییەکانیش بڕوایان بەریفۆرمکردنو کاری پەرلەمەنتاریزم بوو.**

**لە ١٦ نیسانی ١٩١٧ دوای کەوتنی قەیسەر، لینین گەڕایەوە بۆ** Petrograd **. لەشکری سوور خۆی کرد بە** Vinterpalatset **کاتێك کە حکومەتی رووسی کۆبوونەوەی هەبوو . .** Vladimir Antonov-Ovsejenko **بەناوی دەسەڵاتی سەربازی سۆڤیەتیەوە لە** petrograd) **رایگەیاند کە حکومەتە کاتیەکە دەوری تەواو بووەو هەرچەندە ١٧ ئۆکتوبەر ناوی شۆڕشی لێنرابوو، بەڵام لەراستیدا ئینقلابێکی سەربازی بوو. لینین کرا بەسەرۆکی سۆڤیەتو ساڵی ١٩٢٤ بە وەستانی دڵ مرد.**

**لەرووسیا توانرا سەرکەوتنێکی سیاسی بەدەست بهێنرێت، بەڵام لەهەمان کات دا لەجێبەجێکردنی پرۆگرامی کۆمۆنیستی شکستی تەواویان هێنا. سیستیمی مووچە وەرگرتن هەر وەکو سەردەمی کۆنی قەیسەر وابوو، کەرەسەی بەرهەمهێنان لەدەست خاوەن موڵکەکان سەنرانەوەو کرابوونە موڵکی دەوڵەت.. بەو جۆرە سیستمی ئابووری دەوڵەتی جێگای سیستیمی ئابوری بازاڕی گرتبۆوە.**

## **ستالینیزم** Stalinism

**ستالین ساڵی ١٨٧٩ لە شاری** Gori **لە جۆرجیا لەدایك بووە لە ١٩ ساڵییەوە بۆتە ئەندامی سۆسیال دیموکرات کە لەوسەردەمەدا ڕێکخراوێکی قەدەغە بووە. ستالین وەکو وتارنووسێك لەژێر ناوی**"Koba" **خۆی بەخەڵکی ناساندووە.**

"Koba" بەمانای کەسێك دێت کە نەبەزێت، یاخود بڕوایەکی پۆلاینی هەبێت.

لەکاتی دووبەرەکیدا ستالین دوای گروپی بۆلشیفیك کەوتوەو ساڵی ١٩١٢ لینین ستالینی بەئەندامی بیرۆو دەستەی باڵا هەڵبژارد. لەساڵی ١٩١٧ دا ستالین بوو بەئەندامی کۆمیتەی ناوەندی. ساڵی١٩٢٢ کرا بەسکرتێری گشتی، بەو جۆرە بووە سێهەمین کەسی دەسەلاتدار لەسۆڤیەت دوای لینین‌و ترۆتسکی.

پێش ئەوەی لینین بمرێت وەسێتی کردبوو کە ئەبێت ستالین دووربخرێتەوە لەدەسەلات. لینین لە وەسێتەکەی دا نووسیبووی " ستالین کەسێکە رێزی لەلا نییەو هەڵەکانی لەئاستێکی حیزبی نزمدا تەحەمول دەکرێت. من ئەو پێشنیازەم هەیە کە ڕێگەیەك بدۆزرێتەوە، بۆ ئەوەی ستالین لاببرێت‌و بخرێتە جێگایەکی تر، جێگەکەشی بدرێت بەیەکێکی بەوەفا کە بەتواناو ئارامتر بێت، رێز لەخۆی‌و دەوروبەری بگرێت‌و هەستی مەسئولیەتی بەرزبێت."

دوای مردنی لینین ناکۆکی دەسەلاتی سیاسی‌و ئیدیۆلۆگی لەناو پارتی کۆمۆنیست دا بەرپابوو. بەلام ستالین لەگەڵ هەموو نارەزایی‌و ناکۆکییەکانیشدا دەستی بەسەر دەسەلات دا گرت‌و هەموو ئەو کەسانەی کە رکەبەری بوون، کوژران یا لەبەندیخانە توونەدکران. ستالین بە پێچەوانەی لینین‌و ترۆتسکیەوە بڕوای بەوە بوو کە سۆسیالیزم لەروسیا بەبێ کۆمەککردنی شۆڕشی پرۆلیتاریا لەدەوڵەتە پیشەسازییەکاندا دائەمەزرێت ... ئامانجی ستالین ئەبوو سۆڤیەت بکات بەولاتێکی پیشەسازی‌و زلهێزی عەسکەری. ستالین لەکۆبونەوەیەکدا رای گەیاندبوو:" ئێمە پەنجا ساڵ یاخود سەد ساڵ لەدوای ولاتە سەناعیەکانەوەین، بەلام لەماوەی دە ساڵدا ئەبێت بەولاتانە بگەینەوە."

لەسەردەمی ستالیندا نزیکەی هەشت ملیۆن" Gulag "



لەکاتی ریفۆرمی کشتوکاڵیدا لەگەڵ ملیۆنان خەڵکانی تردا گیران‌و زۆربەیان لەسەربازگەی کارە قورسەکاندا لەناوچوون، کاتێك لەو سەرماو سۆڵەی رووسیادا بەزۆر کاریان پێدەکردن بۆ نموونە لەدروستکردنی هێڵی شەمەنەفەرو کاری نێو کانەکان. . . بە هەزاران کەس لەئەنجامی نەخۆشی‌و برسێتی دا مردن یاخود لەسەرما رەقبوونەوە.

ستالین لەگەڵ ئەوەشدا کە لێپرسراوی راستەوخۆ بووە لەمردنی ملیۆنان کەسی بێ گوناە، بەلام توانی سۆڤیەت لەولاتێکی دواکەوتووەوە بۆ ولاتێکی پیشەسازی بگۆڕێ بەتایبەت لەڕوی پیشەسازی سەربازیەوە.

## **ماویزم** mauismen

ماو Mao Zedong ساڵی ١٨٩٣ لەشاری Shaoshan لەناوچەی Hunan لەخێزانێکی جووتیار لەدایك بووە. ساڵی ١٩٢١ لەپەکین فەرمانبەری کتێبخانە بووە، هەر ئەو ساڵە پارتی کۆمۆنیستی چینی دامەزراند. لەساڵی ١٩٢٨ دا ماو لەشکری سووری رێکخست‌و شۆڕشی چەکداریی کۆمۆنیستی لەچەند ناوچەیەکدا هەڵگیرساند.

ساڵی ١٩٤٩ماو توانی دوای شەڕی براکوژی سیستیمی کۆمۆنیزم دابمەزرێنێت. خۆیشی بوو بەسەرۆکی دەوڵەتەکە. ئیدیۆلۆگی ماویزم لەتێکەڵییەك لەمارکسیزم‌و کۆمۆنیزم بەشێکە لەئیدیۆلۆگی ستالین‌و لینین. بەڕای ماو، چینی جووتیارانی چینی لەگەڵ کرێکارە پیشەسازەکاندا، ئەتوانن کۆمەڵ بگۆڕن بەرەو کۆمەڵێکی کۆمۆنیستی. بۆ بەدەستهێنانی ئەم ئەرکە لەچین دا هەمیشە شۆڕشی کەلتووری بەردەوام بکرێت، بۆ ئەوەی رێگا لەهێزە دژ بەشۆڕشەکان بگیرێت، کە ئەیانەوێ شۆڕشی چینی بەرەو دواوە بەرن. ئەوەی شایەنی باسە لە شۆڕشە بەناو کەلتورییەکاندا بە ملیۆنان خەڵکی چینی بێگۆناە گیانی خۆیان لەدەست دا.

## **فاشیزم** Fascismen

لەئیتالیادا فاشیزم رەگی قووڵی هەر لەکۆنەوە داکوتاوە. Cola di Rienzi لەساڵی١٣٤٠ دا بە یەکەمین فاشیستی دونیا ئەژمێرێت. ئەم کابرایە پارێزەر بووەو بەرۆمانسییەتییەکی سەیرەوە باسی گەورەیی رۆمەکانی کردووە. ئەم بیروڕایانەی Coladi Rienzi بۆتە هۆی هەڵگیرساندنی شۆڕشێك لەساڵی ١٣٤٧ دا لە رۆم.

فاشیزم وەك ئیدیۆلۆگییەك لەسەرەتای سەدەی هەژدەهەم دا گەشەی پێکرا. فاشیزم میللەت بە نەتەوەیەکی سەربەخۆی سروشتی دادەنێت. ئەندام بوون تێیدا وجودێکی زگماگی هەیەو ئەرکی سەرشانی ئەندامەکانی خزمەتکردنی میللەتەکەیانە نەك بە پێچەوانەوە. ئەم بۆچونانە لەلایەن Rocco و Gentile وە. پەرەی سەند.

چەمکی بنەڕەتی فاشیزم، بوونی میللەتە کە خراوەتە قاڵبێکی مێژووییەوە. بنچینەی فاشیزم لەسەر بنەمای تیۆری ئابوریو لایەنی کۆمەڵایەتی دروست نەبووە. ئەم ئیدیۆلۆگییە پێویستی بەقەناعەت پێکردن بەجەماوەر نەبووە لەرووی مەنتیقیو زانیارییەوە بەڵکو لەرووی هەستەوە. بزووتنەوەی فاشیزم پێچەوانەی پەرلەمەنتاریزمو دیموکراتی بووە.

فاشیزم بوو بەجولانەوەیەکی سیاسی بەهێز لەئیتالیادا، ئەم ئیدیۆلۆگییە لەزۆر ولاتی تردا گەشەی پێدرا. ناسیۆنالیزمی ئەڵمانیو فاشیزمی ئەسپانیو "بەعس" سێ جۆرن لەم ئیدیۆلۆگییە...

Benito Mussolini ساڵی ١٩١٩ دا فاشیزمی ئیتالی نوێی دامەزراندو خۆیشی بوو بەسەرۆکی ئەم بزوتنەوەیە. لەساڵی ١٩٢١ دا پارتەکە، لەسەرانسەری ئیتالیادا ٧ لەسەد دەنگیان هێنا لەهەڵبژاردنی گشتی دا. ئەم پارتیە رۆژ بەرۆژ بەهێزتر دەبوو و ئەندامو لایەنگیرانی لەزۆربوون دا بوون. ئەندامانی گروپو



رێکخراوە بۆرجوازییو راستڕەوەکان مەترسیان هەبوو لەوەی گرووپو رێکخراوە چەپەکان دەست بگرن بەسەر ولات دا.

شەش ساڵ دوای دامەزراندنی پارتی فاشیزم، ساڵی ١٩٢٥دا Mussolini دەوڵەتێکی فاشیستی لەئیتالیا دامەزراند. مۆسۆلینی لەگەڵ هیتلەردا یەکی گرتو لەساڵی ١٩٤٠ بەشداری کرد لەجەنگی جیهانی دووهەم دا: لەشکری هاوپەیمانان ساڵی ١٩٤٣ کۆتایی بەم سیستمە هێنا.

## **نازیزم** Nazismen

نازیزم خۆی کورتکراوەی ووشەی ناشونالسوسیالیزمە nationalsocialism ساڵی ١٩١٩ دامەزراوەو "ئادولف هیتلەر" سەرۆکایەتی کردووە. ساڵی ١٩٣٣ دەسەلاتی دەوڵەتیان گرتۆتە دەستو بوونە تەنها پارتی دەسەلاتدار. هیتلەر بو بەخودای ئەڵانییەکانو هەروەها زۆربەی خەڵکی ئەڵانی ئیدیۆلۆگی نازیان پەرستووە. هیتلەر جەنگی دووهەمی جیهانی هەڵگیرسانو بووە هۆی کوشتنی دەیان ملیۆن کەس. بێجگە لەشەش ملیۆن جوولەکەو ملیۆنێك قەرەجو خەڵکی ئۆپۆزسیۆنی ئەڵانی کە لەسەربازگە نازییەکاندا لەناو چوون. بەشێکیان بەبرسێتیو نەخۆشی بەشێکی تریشیان بەغاز کوژراونو لاشەکانیان لەفڕنی گەورەدا سووتێنراون. خۆی نازیزم لەخۆیدا جۆرێکە لەفاشیزمی ئیتالی. نازیەکان فاشیزمی ئیتالیان بەقیبلەی خۆیان دانابوو. بەپێی ئەم ئیدیۆلۆگییە رەگەز لەسەرووی هەموو شتێکی ترەوەیە. ولات دەبێت لەژێر دەسەلاتی مەرکەزدا بێت. خەڵکیو گشت گروپەکانی کۆمەڵیش دەبێت لەژێر دەسەلاتی دەوڵەتدا بن. پاراستنی رەگەزو دەوڵەت ئەرکی سەرشانی تەنها کەس بووە.

بیرکردنەوەو ئیدیۆلۆگی نازیزم بانگەشەی بۆ پاکردنەوەی رەگەزی ئاری لەتوخمی جیاوازو غەریبو کەسانی نووقسانو شێتو دەروون نەخۆش کردووە، کە بارن بەسەر ڕەگەزی ئارییەوە. خەباتی مانەوە بەلای نازیەکانەوە بریتی بووە لەخەباتکردن لەنێوان رەگەزە جیاوازەکاناو بە لەناوبردنی توخمە لاوازەکان. لەناوچوونی رەگەزە جیاوازەکانو کەسە لاوازەکان بەپێی ئەم ئیدیۆلۆگیە بەقازانجی رەگەزی ئاری دەگەڕێتەوە.

هیتلەر بڕوای وابوو کە مێژووی گەشەکردنی مرۆڤایەتی، گەشەکردنی بایلۆگییەو خەباتکردنی مانەوەی توخمە بەهێزەکانە. هیتلەر دەڵێت:" تەنها کەسانی ساغو سەلیم رەگەزی ئاری بۆیان هەیە بژینو نەوەیان لێبێتەوە."،"ئەرکی سەرشانی کەسە بەهێزەکان ئەوەبووە کە حوکم کەربن نەوەك بتوێنەوە لەنێو "کەسە لاوازەکاندا". مەبەستی هیتلەر ئەوە بووە کە مرۆڤ بەشکراوە بەرەگەزی جیاوازەوە رەگەزی بەهێزو لاواز. بۆ مانەوەو گەشەکردنی رەگەزە بەهێزەکان ئەبێت بێهێزەکان لەناو ببرێن.

یەکێك لەناسنامەی ئەم ئیدیۆلۆگیە بەکارهێنانی توندو تیژیو کوشتنوخەڵك ترساندن بووە. ڕێکخراوی هەواڵگری SS کەترسناکترینو توندوتیژترین باڵی پارتی نازی بووە. SS دەورێکی باڵای بینیووە لەتۆقاندنو ئەشکەنجەدانو کوشتنو راونانی ئۆپۆزسیۆنی ئەڵمانیدا.

هیتلەر لەسەرەتای دەسەڵاتیدا کەوتە پاکردنەوەی رەگەزی ئاری لەخەڵکە نەخۆشو نوقسانەکان. ئەم کەسانە بەزۆر لە خێزانەکانیان سەنرابوونەوەو تێرابوون بۆ دامەزراوەی تایبەت، کە لەوێ خزمەت بکرێن، بەڵام لەوێ بەشرینقە لەناویان بردبوونو نامەشیان بۆ کەسوکاریان ناردبوو کە بەمردنی سروشتی مردبوون .

دامودەستگای راگەیاندنی نازی، لەڕێگای شانۆوگەرییو فیلمەوە، بەجۆرێکی سەرکەوتوانە لەسەرانسەری ئەڵمانیادا قەناعەتیان بەزۆربەی گەلی ئەڵمانی هێنابوو کە کوشتنی کەسە لاوازەکان، تەنها لە رووی بەزەییو ئینسانیەوەیە.



## سۆسیال دیموکرات Socialdemokrat

سۆسیال دیموکرات ڕێکخراوێکی سیاسیە کە لەڕێگای دیموکراتیو پەرلەمانیو ریفۆرم کردنەوە ئامانجیانە کۆمەڵ بەرەو سۆسیالیزم راکێشن. لەساڵی١٨٦٩دا بۆ یەکەمین جار ناوی سۆسیال دیموکرات لەئەڵمانیادا هاتووە. خۆی ئەم ئیدیۆلۆگیە لەمارکسیزمەوە گەشەی کردووە. بەڵام هەر لەسەرەتای دروست بوونیانەوە ئەمان لەخەباتی چینایەتی لایان داوە. Ferdinand Lasalle بیریارو دروستکەری سۆسیال دیموکراتی ئەڵەمانی رای وابووە کە بەتەنها لەڕێگای ئاشتیو پەرلەمەنتاریزمەوە ئەتوانرێت کۆمەڵگای سۆسیالیزم دابمەزرێنرێت.

سۆسیال دیموکراتەکان کاردەکەن بۆ بەدی هێنانی کۆمەڵگایەك کە ئەندامەکانی وەك یەك نرخیان هەبێت. کۆمەڵگایەکە کە ئەندامەکانی لەنرخی بازاڕ بەنرختر بێت. هەمووکەس مافی کارکردنو نیشتەجێبوونی هەبێت. هێمنیو ئاسایشو مافی مرۆیی خۆی هەبێت. لەقوتابخانەیەکدا کە توانای زیرەکی قووتابیەکانی جیاوازە ئەرکی سەرشانی لێپرسراوانی قووتابخانەکەیە کە دەرس بدەنە قووتابیەکان بەپێی توانایان. خەستەخانە جێگای هەمووان بێت. هەموو کەس بتوانێ روویان تێبکات نەك بەتەنها هەر ئەوانەی کەدەوڵەمەندو خاوەن توانان. کۆمەڵگایەك بێ زەمانی دەستەبەری ژیانی خانەنشینەکانی بکات، بەتایبەت لەکاتێکدا کە هەڵئاوسانی ئابووری تووشی وڵاتەکەیان دەبێت.

بۆ ئەوەی ئەم جۆرە پێداویستیانە پێشکەشی جەماوەر بکرێت، پێویستە ئەندامەکانی کۆمەڵ لە جێبەجێ کردنی ئەرکی سەرشانیاندا بەشداربن. ئەم ئەرکەش بریتییە لەو باجەی کە لەموچەکانیان دەبڕێتو لەکارە هەرەوەزییەکانی کۆمەڵ دا بەکاردێت. تەنها لە ڕێگای باجدانەوە کۆمەڵ دەتوانێت ژیانێك بۆ هەموو کەس، لەگەنجەوە بۆ پیر لەنەخۆشەوە بۆ ساغ دابین بکات. . هەر لەبەر ئەم هۆیەشە

که سۆسیال دیموکراتەکان خەریکی ریفۆرم کردنن لەگشت لایەنەکانی کۆمەڵدا بۆ ئەوەی بگەنە کۆمەڵگایەکی یەکسان کە نرخی مرۆڤایەتی تیا وەك یەك وا بێت.

هەرچەندە زۆربەی وڵاتەکانی رۆژئاوای ئەوروپا بزوتنەوەی سۆسیال دیموکراتی تیا بەهێزەو لەزۆر وڵاتەکان دەسەڵاتی پەرلەمانیو سیاسەتیان بەدەستەوەیە، کەچی ناهەقی کۆمەڵایەتی هەر بەردەوامەو ڕۆژ بەڕۆژ ئەم ناهەقیانە گەورەتر دەبنو روو بەڕووی خەڵکی هەژار دەبنەوە. نامۆیی لەزیادبووندایەو جیاوازی مووچە وەرگرتن لەنێوان فەرمانبەرانو لێپرسراواندا زۆرە . . لەگەڵ ئەم خاڵە لاوازانەشدا سۆسیال دیموکرات رۆڵێکی گرنگی مێژوویی بینیوە لەزۆربەی وڵاتە ئەوروپیەکاندا.

## **لیبرالیزم** Liberalism

ئەم ئیدیۆلۆگییە ئازادی تەنها کەس دەخاتە سەروو هەموشتێکی ترەوە. ووشەی Liberal مانای ئازادی دەگرێتەوە. ئەوەی سەر بەم ئیدۆلۆگییە بێت ئەشقی ئازادییەو بڕوای بەوە هەیە کە مروڤ دەبێت ئازاد بژێت، چۆن بیەوێت بەو جۆرە ژیان بەرێتە سەرو بڕیار لەسەر ژیانی خۆی بدات. بەلای ئەمانەوە هەموو کەسێك کەسێکی بێ وینەیەو هەمان مافی بێ هیچ جیاکردنەوەیەك کەسانی تری هەیە.

ئەم ئیدیۆلۆگییە لەسەدەی هەژدەهەم دا دروست بووە. زۆربەی نوێنەرەکانی کەسانی سەر بەبۆرجوازی بوون. ئەم ئیدیۆلۆگییە لەخانەی چەپی بۆرجوازەکان دەژمێرێت. بەبڕوای ئەمان سیاسەتو ئابووری دوو شتی جیاوازن. پێشنیازی ئەمانە بۆ دەوڵەت ئەوە بووە کە دەوڵەت دەست لە کاروباری ئابووری وەرنەدات. لەسەرەتادا ئەمانە دژی دەنگدانی گشتی بوون، چونکە لەو بڕوایەدا نەبوون کە جەماوەری رەشو رووت بتوانێ چاکیو خراپی خۆی جیاکاتەوە..

لیبرالەکانی سەردەمی ئێستا زۆر جیاوازن لەگەڵ هی سەردەمی پێشوتردا. بەلای ئەمانەوە ئەبێت پێداویستی تەنهاکەس بە باشترین شێوە جێبەجێ بکرێت. "لەسەدا سەد هەقی رادەربڕینو بڕوای دینیو پاراستنی مافی ئافرەتو منداڵ



هەبێت " یەکێك لەو پارتە مۆدێرنانەی ئەمڕۆ LiberalernaFolkpartiet لەسوید قبوولی دەوڵەت دەکا کاتێك لەسنوورێکی دیاری کراودا بۆی هەبێت کە دەست بەسەر پلاندانانو رێکخستنو گەشەکردنی لایەنە ئابورییەکانی ((وڵات بکات)).

لیبرالیزم بایەخێکی گەورە دەدات بەلایەنی مرۆڤایەتیو بەختیاری مرۆڤ. یەکێك لە خاڵە لاوازەکانی ئەم ئیدیۆلۆگییە ئەوەیە کە زۆر زەحمەتە کە کۆمەڵگایەکی نموونەیی وا دروست بێت، کە لەسەدا سەد هەموو کەسێك بەئازادی تیا بژێت. ئابووری وڵاتیش خۆی لەخۆیەوە پێداویستیەکانی هاووڵاتیان دابین ناکات، هەرگیز ناشێ ئابووری ئازاد بەتەنها بتوانێ جێگای ئابووری بازاڕ یاخود پلان بۆ کیشراو لەلایەن دەوڵەتەوە بگرێتەوە.

## **بیرکردنەوە** Cognativ

Cognativ لەووشەییەکی لاتینیەوە وەرگیراوە کە بەمانای بیرکردنەوە دێ. زانستی کوگنەتیف سایکۆلۆگی(Cognativ psykologi) باسی ئەو میکانیزمانە دەکات کە سەبارەت بە پرۆسیسی بیرکرنەوەو بیرهاتنەوەیە. چی رووئەدا کاتێك لافاوی ئینفۆرماشوون بە بەردەوامیو بێ ووچان لەبەشەکانی مرۆڤدا شەپۆڵ دەدات بەرەو رووی کەناڵەکانی زانیاری وەرگرتن. چی ڕووئەدا لەمێشکدا کاتێك کە بەئاگاین یاخود نوستووین. چۆن زانیارییەکان لەمێشکدا خەزن دەکەینو ڕێکیان دەخەین. چۆن وەڵامی پرسیار ئەدەینەوەو چارەسەر بۆ کێشەکانمان دەدۆزینەوە.

بەشە هەرە گرنگەکانی دەستگای بیرکردنەوە بریتین لەزاکیرەی کارگێڕو زاکیرە گەورەو کەناڵەکانی ناردنو وەرگرتنی زانیاری وەکو دەستگاکانی هەستو بینین و بۆنو گوێ گرتن. . ئەزمونی ژیان، توانای زیرەکیو جیهانی بەئاگاییو بێ ئاگایی، زمان فێربوون، چارەسەرکردنی کێشەو بڕیار دەرکردن هتد. .

دیكارت، فەیلەسووفی سەدەی شانزەهەم وتویەتی:" من ئەتوانم بیركەمەوە . . . كەواتە من هەم." مەبەستی دیكارت ئەوەبووە كە تەنها بیركردنەوە مانا بەرووداوو بەسەرهاتەكانی ژیانی ڕۆژانەمان ئەدا. ئەگەر ئێمە توانای بیركردنەوەمان نەبێت ناتوانین خۆمان‌و دەورو بەرەكەمان بناسینەوە . بۆ نموونە كاتێك كەسێك لەپیریدا تووشی نەخۆشی لەبیرچوونەوە دەبێت، كات‌و جێگاو كەسایەتی خۆی‌و هەموو شتێكی تریشی لەدەست دەچێت.

تەنها پرۆسێسی بیركردنەوەیە مانا بەژیان ئەبەخشێ‌و ئەبێتە بزوێنەری چاوەڕوانییەكانمان . . . بەهۆی زاكیرەوە ئەتوانین ئەزموونی ژیانمان خەزن بكەین‌و توانای تاوتوێ‌كردن‌و فێربوون‌و ناسینەوەی خۆمان‌و دەوروبەرمان هەبێت. زاكیرە ئەبێتە بەشێكی مەزن لەكەسایەتیداو گەورەترین ڕۆڵ دەبینێ لەبەدیهێنان‌و گەشەكردن‌و گۆڕان سازیەكانی ناو كۆمەڵدا.

كاتێك لە ژیانی ڕۆژانەماندا یەكتری دەبینین‌و لەگەڵ یەكتری دەدوێین ئەبینین هەندێ لە ڕواڵەتەكانی ژیان پەیوەندی ڕاستەوخۆیان هەیە بەرووداوەكانی ڕۆژانەمانەوە، هەندێكی تر بە بارودۆخەوە. هەندێك لەرواڵەتەكان ئەبستراكتن (مجەڕەدن) كە بۆ خۆیان سەربەخۆن‌و نەبەستراون بەدوو لایەنەی ناوبراوەوە. بۆ نموونە وەختمان بەشكردووە بە سەعات‌و دەقیقەو سانیە، ناوی شەو و ڕۆژی وەرزەكانمان ناوە، ڕووداوەكانی ڕۆژانە كارەساتەكانی ڕابردومان دێنێتەوە یاد. پەیوەندییەكانمان هی كۆن‌و ئێستاو داهاتوو، كارەساتە خۆش‌و ناخۆشەكان بەیەكترییەوە ئەبەستێتەوە. كوڕ كوژراوێك كوڕە كوژراوەكەی خۆی بیر دەكەوێتەوە كە كوڕكوژراوێكی تر دەبینێ، ئەشكەنجەدراویك ئەشكەنجەی خۆی بەبیر دێتەوە كاتێك یەكێكی وەك خۆی ئەبینێ، لەشاییدا شایی خۆمان بیردەكەوێتەوەو لەشینیش دا مردووەكانی خۆمان .



كاتێك چاو وێنەیەك دەنێرێ بۆ مێشك ئەو وێنەیە كەناڵی تایبەتی گواستنەوەی خۆی هەیەو كە لەرێگایەوە دەگاتە شوێنی مەقسەد. دەتوانین لەهەمان كات دا سەیری شتێ بكەین قسەش بكەین یاخود گوێش بگرین. بەڵام قسەكردن‌و گوێ گرتن یەك كەناڵی هاوبەشیان هەیە بۆ ناردنیان بۆ مێشك. كاتێك بۆنموونە قسە دەكەین كەناڵە هاوبەشەكە مەشغوولەو بۆیە موستەحیلە لەهەمان كاتدا مرۆڤ لەتوانای قسەكردن‌و گوێگرتنیشی هەبێت. ئەو زانیاریانەی كە گوێت لێیەو لەهەمان كات دا دەیان بینی زۆرتر دێنەوە بیرت لەو زانیارییانەی كە بەتەنها ئەیان بینی یاخود گوێت لێیانە.

ناتوانرێت ڕێگا لەبیركردنەوە بگیرێت. ئینفورماشوون بە بەردەوامی‌و بەجۆرێكی دوایی نەهاتوو لەڕێگای هەموو دەسگاكانی بینین‌و بیستن‌و بۆنكردن رووئەكاتە دەزگای كارگێڕی مێشك. لەمێشكدا دەزگایەكی كۆنترۆڵ هەیە بەناوی (Uppm ن (rksamhets Kanal) بەشێكی یەجگار كەم لە ئینفورماشوونانە هەڵدەبژێرێت، ئەوەی دەمێنێتەوە پشتگوێ ئەخات. ئەم پاكژكردنە پەیوەندی راستەوخۆی هەیە بەشارەزایی‌و بەرژەوەندی كەسەكە خۆیەوە. ئایا كەسەكە چی بەلاوە مەبەستە، دڵی بەچی ئەكرێتەوە. چ ئەزمونێكی لەژیانیدا كۆكردۆتەوە. چ خوێندنێكی تەواو كردووە، چ حەزێكی هەیە. لە چ جۆرە خێزانێكدا گەورەبووەو سەر بە چ لایەنێكی سیاسیە. زۆربەی توێژەرەوەكان لەو بڕوایەدان كە دەستگای سروشتی كۆنترۆڵكردن یاخود پاكژكردن لەخزمەتكردنی مرۆڤایەتیدایە. ئەگەر مێشكی مرۆڤ بایەخ بدا بەهەموو ئەو زانیاریانەی كە رووی

تێ دەکات ئەوا دەبێت سەرانسەری ژیانی خەریکی هیچی تر نەبێت.

کاتیك پرسیارێك لە کەسێك دەکەی کە لەخەو هەڵسا چی کرد.. لەوانەیە زۆربەی جار ئەمە بێت وەڵامەکەی: "نانم خوارد.. چووم بۆ ئیش..." بەشێکی هەرە زۆری زانیاریەکانمان لەبیردەچێتەوە بۆ نموونە: "دەموچاو و دان شتن، ریشتاشێن و خۆشتن و نان خواردن . . .، چی بەهەست و خەیاڵماندا هاتووە بیرمان لەچی کردۆتەوە." دوو برادەر کە پێکەوە دانیشتوون لێیان بپرسە خەریکی چین. "هیچ ناکەین بۆ خۆمان دانیشتووین"! بەهەزارەها ئەو رووداوە بچکۆلانەمان بیر دەچێتەوە کە لەناو ئەو رووداوە سادانە دایە.. مرۆڤ تەنها بایەخ بەو ئینفورماشوونە دەدات کە پەیوەندی بەژیانیەوەیەتی.

کەسێك پێناسە دەکات بەڵام لەبەر هاژوهوژی با گوێی لەهیچی تر نییە، بەڵام کاتێك کە لەجادەکە دەپەڕێتەوە ئەگەر سەیارەیەك لەدوورەوە بێت مێشکی کەسەکە ئەتوانێ، دەنگی سەیارەکە جیاکاتەوە لەهاژوهوژی باکە. یان لەکاتی (koktelparti) گەرە لاوژەدان کەچی خەڵکی ئەتوانن دوو دوو گفتوگۆ لەگەڵ یەکتر بکەن. کەسێك کە بریندار دەبێت رادەکات بۆ ئەوەی گیانی رزگارکات. لەکاتی ڕاکردنەکەدا بیر لە ئازار ناکاتەوە، تەنها بیر لەوە دەکاتەوە چۆن خۆی قوتار کات. کاتێك کە ماڵێك ئاگری تێبەر دەبێت خاوەن ماڵەکە بیر ناکاتەوەو لەوەی هەنگاو بەهەنگاو چی بکاو چی نەکات، ئەو یەکسەر بێ بیرکردنەوە خۆی و خێزانەکەی رزگار دەکات.

زۆربەی زۆری جێبەجێکردنی چالاکیەکانی ژیانمان پێویستی بەورد بیرکردنەوە نییە، زۆربەی خەڵك کە چێشت لێئەنێ لەسەر ریسیپت لێنانی یەکسەر ئەزانێ خۆی چی ئەکات و نایکات . . . زۆربەی چالاکیەکان بێ بیرکردنەوە لەئەنجامی فێربوون و



ئەزمونی تایبەتی ژیانماندا بۆنموونە کاتێك مەلە دەکەین، سەیارە یان پاسکیل لێدەخوڕین.

مرۆڤ تەنها زیندەوەرێکە کە توانای خەزنکردنی ئینفورماشوونی بێ سنووری هەیە. ئەگەر بێت و سەرانسەری ژیانمان رووداو کارەسات و ئەزمون خەزن بکەین. نەك هەر بەتەنها هی خۆمان بەڵکو هی خەڵکی و دەوروبەرەکەشمان. ئەنجاکو دڵۆپێك لەدەریای توانایی تۆمارکردنی مێشکمان بەکارهێناوە.

**زاکیرەی کارگێڕ** (Working Memory)

ئەم دەستگایە گرنگترین بەشی زاکیرەیە، لە ناخ و دەوروبەرەکەمانەوە زانیارییەکان دێنە ناو ئەم دەستگایەوە. لێرەدا ئەو زانیاریانە رەوانە دەکرێت بۆ زاکیرەی گەورەو لەوێدا هەندێکیان خەزن دەکرێن. زاکیرەی کارگێڕ وەك وەسیتێك وایە لەنێوان خۆمان و دەوروبەرەکەماندا. لە ڕێگای ئەم دەستگایەوە دەتوانین وەڵامی زۆربەی پرسیارە جیاوازەکان بدەینەوەو چارەسەری کاتی بۆ کێشەکانی رۆژانەمان بدۆزینەوە. ئەگەر ئەم دەستگایە لەرووداوێکدا بەربکەوێت ئەوا ئیحتیمالی زۆرە کە مرۆڤ کەسایەتی خۆی لە دەست بدات. کارکردنی زاکیرەی کارگێڕئەچوێنی بەکارکرنی بەدالەی تەلەفۆن، یەکەی خەزنکردنی زانیاریەکان پێیان دەوترێت (شانگ). ئەم یەکانە ژمارەیان جیاوازە لەکەسێکەوە بۆ کەسێکی تر. ژمارەیان لەنێوان ٢ـ٧ یەکەی خەزنکردنی زانیارییە. کەسە کەم زیرەکەکان نزیکەی ٢ یەکەیان هەیە. کەسە مام ناوەندییەکانیش ٤ـ٥ ، کەسە زیرەکەکانیش ٦ـ٧. هەتا ژمارەی یەکەکانیش زیاتر بێت توانای وەرگرتن و یادهێنانەوەو زیرەکی کەسەکە زیاترە. زانیارییەك ماوەی ٢٠ سانییە بۆی هەیە لەزاکیرەی کارگێڕی دا بمێنێتەوە. ئەگەر لەو ماوە زەمەنیەدا نەگاتە زاکیرەی گەورەو خەزن نەکرێت، ئەوا زانیاریەکە لەناو دەچێت. لەچەند تاقیکردنەوەدا ١١ وشەیان خوێندۆتەوە بۆ

کۆمەڵێك خەڵك، دوایی ١٠ سانیە داوایان لێکردوون کە ناوی ووشەکان بڵێنەوە. ژمارەی وەڵامی راستی بەشداربووەکان لەنێوان ٥-٩ دا وەڵامی راست بووە.

هەریەکێك لەو یەکانەی ئەم دەستگایە دەتوانرێت بەمەشقکردنو هەوڵدان وای لێبکرێت کە جێگای زۆرتر بگرێت. لە جیاتی تەنها ووشەیەك، رستەیەك یاخود پەرەیەك تیا جێگا بکەیتەوە. بەمانای ئەوەی لەجیاتی تەنها ووشەیەك، رستەیەك یاخود پەرەیەکمان یەکسەر بیر کەوێتەوە. ئەو وشانەی کە پەیوەندییان بەیەکترییەوە هەیە ئاسانتر دێنەوە یادمان بۆ نموونە شۆڕش. پێشمەرگە، شەهید، کورد، سیاسەت، لەو ووشانەی کە ئەبستراکتنو پەیوەندیان بەیەکترەوە نییە.

لەڕێگای زاکیرەی کاتی کارگێڕەوە هەموو کارەکانی ڕۆژانەمان بۆ جێبەجێ دەکرێت. زانیاری دەنێرێتە زاکیرەی گەورەو لەزاکیرەی گەورە وەڵامەکەمان بۆ دێتەوە بەو مەرجەی ئەگەر چارەسەرەکان وەڵامەکان پێشتر لەزاکیرەی گەورەدا خەزنکرا بن.

## زاکیرەی گەورە (Long- term memory)

زانیارییەکان لەزاکیرەی بچکۆلانەوە دێتە زاکیرە گەورەوە، پاش ٥- ١٠ سانیە تۆمار دەکرێت. ئەو زانیارییانەی کە لەم دەستگایەدا خەزن بکرێت هەرگیز نافەوتێ . . . بەڵام بەتێپەڕبوونی کات خەتەکانی زاکیرە کاڵ دەبنەوە وەکو رەنگی جلێك خۆر کاڵی کردبێتەوە، بەو جۆرە خەتەکانی زاکیرەش کاڵ دەبنەوەو پێویستمان بەکۆمەککردن هەیە بۆ بیرهاتنەوەیان. زۆربەی زۆری ئەو زانیاریانەن کە خۆمان ئەمانەوێت بەرەزامەندی خۆمان بیرمان چێتەوە یاخود ئەو زانیاریانەن کە زۆر گرنگ نییە بیزانیت. کاتێك کە بەسەیارە دەڕۆین بۆ سەردانی ماڵی دۆستێکمان زۆر زەحمەتە وردەکاری ڕێگاکەو بێتەوە یاد، بەڵام کاتێك کە نزیکی گەڕەکەکە دەبینەوە یەکسەر جادەو کۆڵانو وردەکارییەکانی گەڕەکەکەت دێتەوە بەرچاو. یان جاری وا هەیە خەڵکی ئەبینی نایناسیتەوە. ئەزانی لەشوێنێ بینیوتە، ئەگەر هەمان کەس ببینیتەوە لەو شوێنەی کە یەکەمجار بینیوتە بۆ نموونە بەجلی خەستەخانەوە یا



جلی ئەسکەریەوە، یەکسەر دێتەوە یادت. یا ئەگەر یەکێك بیخاتەوە بیرت "چۆن نایناسیتەوە، ئەها فلان ڕۆژ چووین پێکەوە بۆ فلان شوێن" زانیارییەکان لەدەستگای وەرگرتن Sensoriskt Register دێنە ناو زاکیرەی کارگێڕ Kortidsminne لەوێشەوە دەڕوات بۆ زاکیرەی گەورە خەزن دەبن. هەرەها لەکاتی پێویستدا ئەم زانیاریانە لە زاکیرەی گەورەوە دێنەوە زاکیرەی کارگێڕو وەڵامی پرسیارەکانمان دەدەنەوەو کێشەکانی ڕۆژانەمان بۆ چارەسەر دەکەن.

## خەتی زاکیرە

خەرمانی سەرانسەری ژیانی کەسێك لە مێشکی دا خەزن کراوە. هەموو زانیارییەك لەخانەی تایبەتی خۆیدایە، وەکو کتێبخانەیەك چۆن کتێبەکانی تیا ڕێکخراوە لەسەر پیتی ئەبجەدی لەمێشکیش دا بەهەمان شێوە هەموو زانیارییەك لەشێوەی کاتیگۆری تایبەت خەزن کراون. بۆ نموونە کاتیگۆری هەزارەها لقو پۆپی لێ دەبێتەوە. کاتیگوڕی باڵندە جیایە. ناوی ئەوباڵندانەی کە لەناوچەکەماندایە زووتر دێتەوە یادمان لەو باڵندانەی کە لەناوچەکانی تر بۆ نموونە چۆلەکە، کۆتر، مراوی، ئەم ناوانە بەوێنەشەوە لەسەرووی لقی زاکیرەوە خەزن بوون. . ئەوباڵندانەی کە توانای فڕینیان نییە یاخود ئێمە کەمتر دەیان ناسینەوە، ئەمانە لەخواری خوارەوەی لقەکەدا لقی خەتی زاکیرە خەزن کراون.

توانایی بیرکردنەوەو بیرهاتنەوەی مرۆڤ یەجگار بێ سنوورە. خەتی زاکیرە لەنێو مێشکماندا بێحەد زۆرن. ئەگەر بێتو بەشێکی یەجگار کەمی لێ وەرگرین وەکو چەن ملیۆنی خەت، لەگەڵ یەکتریدا ئاڵوگۆڕیان کەین ژمارەی ئیحتیمالەکان ئەوەندە زۆرن کەس نییە بتوانێ بیانژمێرێت.

## دەستگای پەیوەندو پەیوەستکردن association

لە نێو مێشکدا ئەم دەستگایە دۆزراوەتەوە کە بەهۆیەوە یەکسەر بێ بیرکردنەوە وەڵامی زۆربەی پرسیار دەدرێتەوە. ئەمەش ئەنجامی کۆکردنەوەی ئەزمونی

دوورودرێژی ژیانەو کە وەختی خۆی لەمێشکدا خەزن کراوە. ئەم دەستگایە رۆڵێکی گرنگی هەیە لە بەستنەوەی رووداوەکانی رابردوو و ئێستاو داهاتوو بەیەکتریەوە. کاتێك یەکێك ئەبینین لە کەسێکمان دەچێت. یاخود لەپرسەیەکدا مردووەکانی خۆمانمان بیر دەکەوێتەوەو بۆ ئەوان دەگرین.

زۆربەی جار بەجۆرێکی ئۆتۆماتیکیو بێ بیرکردنەوە لەسەر شێوەی جەدوەل شتمان دێتەوە یاد. زۆربەی روالەتی ژیان بەجۆرێکی ئۆتۆماتیکی دێنەوە بەرچاومان. کاتێك سەردانی ماڵێك دەکەین دەزانین چی دەکەینو چیمان لێی چاوەڕوانکراوە. لەکاتی شاییو خوازبێنی، بۆ پرسە. ئەزانین چۆن خۆمان پیشان بدەین.

## بەراوردکردنی چالاکی بیرکردنەوەی مرۆڤ لەگەڵ کۆمپیوتەردا

ئەو توژینەوانەی کە ئەنجامدراوە سەبارەت بەچۆنیەتی بیرکردنەوەو دۆزینەوەو چارەسەر کردن بۆ کێشەکان ئەوەیان سەلماندووە کە چۆتێتی ئیشکردنی کۆمپیوتەرو مێشکی مرۆڤ زۆر لەیەکتری دەچن.

کۆمپیوتەر بەهەمان شێوەی مێشك زانیاری وەردەگرێت، دەتوانرێت هەر یەکەیان لەفایلی خۆیدا خەزن بکات. دەروون ناس (Donald Brobend) بەوردی باسی ئەوەی کردووە کە کۆمپیوتەر وەکو مودیلێکی دەستگای بیرکردنەوەی مێشك وایە. لێرەدا ئەوەی کە شایەنی باسە کۆمپیوتەرێك کە مەزنترین توانای خەزنکردنی هەبێت ئەگەر بەراوردی بکەین لەگەڵ توانای خەزنکردنی مێشکدا، توانای کۆمپیوتەرەکە دلۆپیکە لەتوانای خەزنکردنی مێشك.

کاتێك کە بیردەکەینەوە لەمێشکداو وێنەکانو نەخشەو ئەزمونی ژیانمان دێتە یاد، کاتێکیش کە پێویستمان بە وەلامی پرسیارێکە ئەگەر وەلامەکەی خەزنکرابێت لەمێشکمان دا ئەوا وەلامەکەمان بۆ دێتەوە لەرێگای زاکیرەی کارگێڕەوە. ئەگەر لەماوەی ١٠تا١٥ سانیە وەلامەکەمان پێنەگات دەفەوتێ،



هەرچەندە ئەم دەستگایە بەپێچەوانەی کۆمپیوتەرەوە ئەو توانایەی هەیە کە بە بەردەوامی بگەرێ بەدوای وەلامدا، لەوانەیە وەلامەکە پاشان وەربگرین ئیتر لەدەقیقەیەکەوە بگرە تا چەند مانگێکی پێ دەچێت.

بەشی هەرە زۆری بایێلۆگەکان لەو بڕواییەدان کە مرۆڤ وەکو ماشینێکی ئالۆز وایە کە بەیاسای تایبەتی خۆی دەگەرێتو ئەتوانێ زانیاری بخوێنێتەوەو خەزنی بکات. لەهەمان کات دا بیریشی بکەوێتەوە. ئەمەش هەرهەمان پرۆسێسە لەناو کۆمپیوتەر رووئەدات: دەتوانرێت وەلامی پرسیار بدرێتەوە بە مەرجێ وەلامەکەی پێشتر لەهەردوو دسکەکەدا خەزن بووبێت.

## جۆری پێوانەکان

ئەو ڕوانینو بیروڕایانەی کە پێشتر خەزن بووە لەمێشکمان دا کارئەکاتە سەر بیرکردنەوەی رۆژانەمانو ناتوانین بەجۆرێکی بێلایەن دەوربەرەکەمان ببینین چونکە پێوانە شەخسییەکانمان کارئەکاتە سەرمانو هەستمان دەور ئەبینێ لەچۆنێتی هەڵوێستەکانماندا.

لەکاتی بڕیاردانەدا جاری واهەیە هەستکردن پێش بیرکردنەوە دەکەوێت یاخود جاری وا هەیە بە پێچەوانەوە. ئامانجی بیرکردنەوە ئەوەیە کەرێکترینو راسترین پێوانە بداتە دەستی هەستمانو بەبێلایەنی بڕیار لەسەر کێشەکان بدەین. ئەو ئەزمونەی کە لەهەموو بارێکی ژیانماندا کۆمان کردۆتەوە دەورێکی سەرەکی ئەبینێ لەچارەسەرکردنو هەڵسەنگاندنو وەرگێڕانی گیروگرفتەکانمان. بۆ نموونە کابرای دینی، بەپێی ئەو ئەزمونەی کە لەژیانیدا فێری بووە سەبارەت بە دین، ئەڕوانێ بۆ جیهانی دەوروبەرەکەیو بەم تێڕوانینەی هەموو رووداوەکانی دەوروبەری ئەبینێ، ئیتر ئەگەر راست بێت یا هەڵە هیچ گرنگ نییە.

کابرایەکی مارکسی، بەپێی ئەو زانیاریانەی کە لەمێشکیدا خەزنی کردووە،

بەو جۆرە ئەیەوێت گیروگرفتەکانی کۆمەڵگا چارەسەربکا. ئەندامی سەر بەحیزبێکی خاوەن دەسەڵات تەنها بەرژەوەندی پارتەکەیو مەزنی سەرکردەکەیو بەرژەوەندی خۆیو حزبەکەی بەلاوە مەبەستە لەحەقیقەتی رووداوەکان. ئەگەر پارتی A کێشەیەکی لەگەڵ پارتی B داهەبێت، ئەوە هەریەکەیان ئەو لایەنانەی کێشەکەیان دەخەنە ڕوو بەجۆرێك کە پارتی A پارتی B تاوانبار دەکات یا بەپێچەوانەوە. ئەو پێوانانەی لەژیانماندا هەمانە بەرامبەر بەدیاردەکان ئەبێتە هۆکاری گوزارشتکردنمان لەسەر دیاردەو کێشەکانمان. ئەزمون ئەو پێوانانەمان لە لا دروست دەکات کە هەموو کەس هەیەتی لەسەر چۆنێتی هەڵوێستەکانمان بەرامبەر بەخەڵكو روداوەکانی ڕۆژانەمان، هەروەها رادەی هەستو سوودوەرگرتنو مەزاجییش ڕۆڵێکی سەرەکی دەبینێ لەدۆزینەوەی چارەسەر بۆ گیروگرفتەکانمان.

گرنگترین رۆڵی بیرکردنەوە ئەوەیە کە چارەسەری لەسەرخۆ بۆ گیروگرفتی ڕۆژانەمان بدۆزێتەوە ئەگەر گیروگرفتێکمان توش هات بیری لێ بکەینەوەو لایەنە باشو خراپەکانی لێ جیاکەینەوە بەجۆرێکی بێلایەن بۆی بڕوانین بەم جۆرە کۆمەڵێك بەدیلمان بەرچاو دەکەوێت. کە ئاسانتر مەودای بیرمان بەربلاوتر دەکات. ئەگەر بۆ نموونە برادەرێکی خۆمان بینی لووتی لێمان لار بوو". ئەتوانین ئێمەش پشتگوێی بخەینو پێی بڵێین "ئاوی ئاموون چێت". یاخود بەجۆرێکی تر. لەوانەیە برادەرەکەمان خەمێکی هەبێت تووشی موشکلەیەك هاتبێت. ئەگەر ئێمە دان بەمەزاجی خۆماندا بگرینو پەیوەندییەکی راستەوخۆ لەگەڵ برادەرەکەماندا بکەین ئەوا بێجگە لەوەی کە زانیاری تەواو وەردەگرین لەوانەشە پەیوەندیی برادەرایەتیمان بەهۆیەوە باشتر بێت.

چارەسەرێك، وەڵامێك لەسەر بنەمای مەزاج دروست بێت ئەوا کورت ئەیهێنێ. پاش ماوەیەك خاوەنەکەی کاڵەك بە ئەژنۆ ئەشکێنێو دوایی سەد جار ئەڵێ خەتای خۆم بوو بەڵام کاتێك کە کار لەکار ترازاوە...



پێوانەی گروپ: ئەندامی گروپێك بۆئەوەی لەناو گروپەکەدا جێگای بێتەوە، مەجبورە وەکو ئەندامانی گروپەکەی بیرکاتەوەو هەڵسوکەوت بکات لەگەڵ دەوروبەرەکەیدا. ئەبێت کەسەکە هەڵگری پێوانەو دروشمی گرووپەکە بێت.

گوشاری گروپ زۆر بەهێزە لەسەر ئەندامەکانی، تەنها کەس ناتوانێ بەئازادی بیرکاتەوەو ڕای خۆی دەرببڕێت، ئەبێت ئەم وەکو ئەندامانی گروپەکەی بڕوانێ بۆ دەوروبەرەکەی، ئەگینا لەگروپەکەدا جێگای نامێنێو دەردەکرێتە دەرەوە.

پێوانەی شەخسی: ئیتر لەخۆدەرختنەوە بگرە تا پلەوپایەو موڵکی دنیا. هەموو هەوڵو تێکۆشانێکی ئەم کەسانە لەڕێی بەدیهێنانی پێداویستیە تایبەتیەکانی خۆیانە. هەچ شتێکیش پەیوەندی بە بەرژەوەندی ئەمانەوە بێت ئەوا مەبەستیانەوگرنگە بەلایەنەوە. .

پێوانە کۆمەڵایەتیو کەلتوریو ئاینییەکان: زۆربەی زۆری بەها کۆمەڵایەتیو ئاینیەکان واخەڵکی کۆتو زنجیرکردووە کە ناتوانن ئەگەر بێتو هەڵەش بێت بەپێچەوانەی ئەو بەهایانەوە رەفتار بکەن.

پێوانەی مرۆڤایەتی: ئەو بەهایانەیە کە پەیوەندی بەویژدانی کەسەکەوە هەیە لەدەربڕینی هەستو خۆشەویستی مرۆڤایەتیەوە، ئیتر هیچ گرنگ نییە کەسەکە لەهەر شوێنێکی ئەم دونیایەدا بژی.

### مەوداو چارەسەرکردنی گیروگرفت

خێرا تێگەیشتنی گیروگرفتێك، خێرا بیرکردنەوەیەو درەنگ تێگەیشتنی گیروگرفتێك لەسەرخۆ بیرکردنەوەیە. جیاوازی لە نێوان کەسێکی شارەزاو یەکێکی نەشارەزادا لەوەدایە کاتێك هەردووکیان رووبەڕووی هەمان گیروگرفت دەبنەوە.. کەسە شارەزاکە ماوەیەکی درێژ بیرئەکاتەوە. لەبیرکردنەوەکەیدا ئەو ئیحتیمالانە هەڵدەبژێرێت کە لەوانەیە پەیوەندی بەچارەسەرکردنی گیروگرفتەکەوە هەبێت، بەڵام کەسە نەشارەزاکە خێرا چارەسەرێکی بۆ ئەدۆزێتەوە، ئەگەر چارەسەرەکە سەرکەوتو

نەبوو ئەوا دەگەڕێ بەشوێن چارەسەرکردنێکی تردا.

مەودای چارەسەری گیروگرفت بریتییە لەئیحتیمالاتی دوایی نەهاتوو. ئەگەر بەگشت ئیحتیمالی کێشەکاندا بگەڕێین ئەوا سەرانسەری ژیانمان ئەبێت خەریکی گەڕان بین. تەنها گیروگرفتێکی بچکۆلانەشمان لەژیانماندا بۆ چارەسەر ناکرێت.

گرنگی لێرەدا لەوەدایە هەچ ئیحتیمالێك هەڵبژێرێ ئیحتیمالی چارەسەرکردنە. بەڵام تەنها یەك ئیحتیمالی راستەکەیانە. یەکێکیان راستەو کۆمەڵێکیش نزیکە لەچارەسەرەکەوە. کەچی هیی وا هەیە لەماڵی خۆی دانیشتووە نەك گیروگرفتی رۆژهەڵات هیی رۆژئاواشمان بەچاوتروکاندنێ بۆ چارەسەر دەکات.

ئەم هۆیەشە کەوای لەمرۆڤ کردووە کە نەتوانێ بژی ئەگەر هەموو کاتێك تەرازووی راستییو دروستی بەدەستەوە بێتو هەمیشە شت لەسەر تەرازووی دادپەروەرانە بپێوێت. هەر لەبەر ئەمانەشە کە مێشك جیهانی دەرەوەی دابەشکردووە بە کاتیگۆری جیاوازەوە، بەجۆرێك لەگەڵ دەوروبەرماندا هەڵسوکەت دەکەین بۆ ئەوەی بمانگەیەنێتە مەبەستو چارەسەرکردنی کێشە کاتیەکان، هەر لەبەر ئەم هۆیەشە مرۆڤ پەنا دەبەنە بەر تەعمیم کردن.

**تەعمیم کردن** (Generalisering) شێوەیەکی ئاسانکردنی کاروباری ژیانەو ئەمەش لەژیانی تەنهاکەسو کۆمەڵدا دەورێکی گرنگ ئەبینێ. لەیەکێکەوە حوکمی هەموو گروپێك دەدەین.. بێگانە خراپە یا باشە، عەرەب پێپەتیە موسڵاوی رەزیلەو و تورك مرۆڤ نییە. . .کورد قەومێکی خۆخۆرن. . . یان چاکترین زەلامە، کورد میللەتێکی دڵسۆزە. پارتە سیاسەکانی ئەوجارەش میللەتەکەیان دا بە شوو..

کۆمەڵگایەك کە بەملیۆنان خەڵکی تیا دەژیو بێ کۆتایی پەیوەندی جۆراوجۆری هەیە لەگەڵ یەکتریداو هەریەکەیان بگرێت بە گەزی خۆی نەبێت بەهیچ شتێکی تر ناپێوێت. هەریەکەیشیان دەگری دەماخی ئەزمونێکی جیای تیا خەزن کراوە. بۆ نموونە ئەگەر سەرنجی گیروگرفتی ئازادی بدەین. ئەبێت تا ڕۆژی ئەزەل



ئێمە بەئیحتیمالەکاندا رایەڵە بکەین. کەچی زۆر سەیرە هەندێ سەرکردەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست لەچاو تروکاندنێکدا جەنگێك بەرپا دەکاتو لەهەمانکاتیشدا قەناعەت بە ئەندامانی حیزبەکەی دێنێ کە بارودۆخی جەنگ لەبار بووە.

جەنگ ، خەباتی چەکداری، مانگرتن، خۆپیشاندان . . بیروڕای سیاسی،ئیدیۆلۆگیا ئەم رێگانە دەگرێتە بەر بۆ چارەسەرکردنی گیروگرفتەکانی کۆمەڵ. ئیتر گرنگ نییە هەڵبژاردنی ئەم چالاکیانە تا چەند پەیوەندی بەچارەسەرکردنی گیروگرفتەکە خۆیەوە هەبێت.

ملیۆنان ئیحتیمالی تر هەن کە ئێمە نایان بینینو تەنها یەکێکیان لێ هەڵدەبژێرینو لە دەوریشی شوورابیەکی بڵندی بەرگریکردنی بۆ هەڵدەبەستین.

زۆربەی بیرو ڕوانینەکانی جەماوەر ئەبێت خۆی بگونجێنێ ببێتە بەشێك لەو بیرکردنەوە زاڵەی ئەوانەی کە دەسەڵاتی راستەوخۆیان هەیە لەکۆمەڵگەدا.

چارەسەرکردنی زۆربەی زۆری دیاردە کۆمەڵایەتیەکانو گەشەکردنیان لەڕادەی تێگەشتنی کەسێك، گرووپێك، یاخود رێکخراوێك مەزنترە. ئەو بیروڕایانەی کە فەرز دەکرێن یاخود ئەو چارەسەرانەی کە دەخرێنە روو زۆربەی جار دوورن لەچارەسەرە بابەتیەکانەوە.

دەسەڵاتی Totalitra لە رۆژهەڵاتدا وشە بەوشە جێ بەجێ دەکرێتو سەرکردەکان وەڵامی رەهاین هەیە بۆ گشت کێشەکانی کۆمەڵ. بۆ نموونە رەگەزپەرستێك، کۆمۆنیستێك، کەسێکی موتەدەین بەپێی بۆچوونە موجەردەکان رووداوەکانی دەوروبەریان هەڵدەسەنگێننو وەڵامیان بۆ هەموو روداوێکی ژیان لەلایە.

ئەگێڕنەوە کابرایەکی ماسیگر لە کەناری دەریایەکدا خەریکی ماسی گرتن دەبێت. هەرجارێك ماسییەکی گەورە دەگرێت تووڕە دەبێتو ماسییەکە هەڵ دەداتە ناو دەریاکەوە. کاتێکیش ماسییەکی بچکۆلانەش دەگرێ، قریوەی پێکەنینی لێ

دێو هەڵدەپەرێ لەخۆشیدا. یەکێکیش کە ئەمە دەبینێ سەری سوورِ دەمێنێو لەکابرا دەپرسێ: "ئەرێ تۆ پێم ناڵێی شێت بوی! چۆن ماسیە گەورەگان هەڵدەدەیتەوە ناو ئاوەکە." کابراش وەڵامی دەداتەوەا دەڵێ:" ئاسانە! من تەنها قاپێکی بچکۆلانەم هەیە لەماڵەوە، قاپەکەشم تەنها جێگای ماسی بچکۆلانەی تیا دەبێتەوە." سەرکردە (Totalitra) کۆمەڵیان لەنێویەك جۆر چوارچێوە داناوە. ئەو بۆچۆنو رایانەی لەچوارچێوەکەدا جێگای نابێتەوە ئەمان بەخۆیانو خاوەنەکانیانەوە فڕێ دەدەنە ناو شەتەوە. ئەوانەشی کە لەم سەرکردانە کۆدەبنەوە دەبێت زیرەکانە جێگەو رێگای خۆیان بزانن، لەو چوارچێوەیە نەیەنە دەرەوە کەسەرکردەکان پێشتر بۆیان کێشاون.

## گیروگرفتو هۆکار

گیروگرفتو هۆکار دوو رِواڵەتن لەیەکتری جیانابنەوە، کە گیروگرفتێك درووست بێت ئەبێت هۆیەك بووبێتە هۆی هەڵگیرسانی. جاری وا هەیە هۆکار رونو ئاشکرایە وەکو بلێی "دار هەڵبرە سەگی دز دیارە"و جاری وا هەن دژوارەو بەزەحمەت هۆکار دەست نیشان دەکرێت. گیروگرفتێك هۆکەی نەدۆزرێتەوە زەحمەتە چارەسەری بۆ بدۆزرێتەوە. هەندێ گیروگرفت هەیە بەتێپەربوونی کات، لەسەرخۆ دروست دەبن، وزەیەکی پاسیفی ئەبێتە هۆی جولانییانو لەپڕ رۆژێك هەر لەخۆوە وەکو کانیاو دەتەقنەوە.

لەتاقی کردنەوەیەکدا تۆپێکیان دانابولەسەر بازنەیەك، کاتێك تۆپێکی تریان ئەجولاندو ئەم تۆپە ئەیدا لەتۆپی یەکەم، تۆپەکە ئەکەوتە جولاندن. وەڵامی گشت بەشداربووەکان وەك یەکبوون:" تۆپی دووهەم بۆتە هۆی جولانی تۆپی یەکەم" . تاقی کردنەوەکەیان دووبارە کردۆتەوەو بە مەرجێك ئەمجارەیان کە تۆپی دووهەم ئەیدا لەتۆپی یەکەم یەکسەر نەکەوێتە جولان. پاش چەند سانییەیەك تۆپەکە خۆی لەخۆییەوە دەکەوتە جولەکردن. کە لەبەشدارانیان پرسی هەرهەموویان ووتیان:



"هیچ پەیوەندییەکییان هەست پێنەکردووە لەنێوان تۆپەکاندا" (لەحەقیقەتدا کاتێك کە تۆپی دووهەم خۆی کێشاوە بەتۆپی یەکەمدا یەکسەر نەکەوتووتە جولاندن بۆیە بەشداربوەکان هۆکاری هاتنە خوارەوەی تۆپەکەیان نەزانیوە، چونکە پاش چەن سانییەیەك تۆپەکە کەوتۆتە جولان، ئەمە خۆی وزەی کۆبووەی پێ دەڵێن. کە ماوەیەکی پێئەچێت تا وزەکە دائەگیرسێ ئەکەوێتە کارکردن بەشی زۆری هەموو گیروگرفتەکانی ئەم دونیایە ئەم جۆرەیانە زۆر بەزەحمەت هۆی پەیدابوونی کێشەکان دەدۆزرێنەوە.

بۆ نموونە کێشەی شەڕی براکوژی، کێشەی بەینی ژنو پیاوێك، لەنێوان دووبرادەرا.. لەکۆبونەوەی ئەو ناکۆکییە بچکۆلانەی رۆژانەیە کە زۆربەیان نەبینراونو رۆژانە کۆدەبنەوە بەڵام لەپڕ رۆژێ ئەتەقێتەوە لەنێوانیان داو گێچەڵێکی گەورەی لێ پەیدا دەبێت. خەڵکی ناتوانێ رۆژانە ئەو وزە کۆکراوانە ببینێ کە دەبێتە هۆکاری ناکۆکییەکەیان هەمان شێوە ناکۆکییەکانی نێو پارتە رکەبەرەکان هەرکەسەیان بەپێوانەی بینینی خۆی بۆ ناکۆکییەکان ئەڕوانن کە زۆربەی جار هێزی هەست جولێنەری سەرەکی بووە. کاتێك کە رەشەبای بەرگری کردن لە هەڵوێست هەڵدەکات ئیتر کار لەکار ترازاوە. ئەگینا لەمنداڵێکی ٨ ساڵە بپرسیت ئەزانی یەکخستنی هەردوو ئیدارەکەی کوردستان لە بەرژەوەندی میللەتی کورددایە ئەگەر هاتوو بەرژەوەندی کورد مەبەستر بێت.

## زانیارییەکانی جیهانی بێ ئاگایی

بەشی زۆری زانیارییەکان کە سەبارەت بە "کەسایەتییە" لە جیهانی بێ ئاگایدا وون دەبێت. ئەمەش بریتین لە هەستی پەشیمانی بوون. هەندێکیان بەرازیبوونی خۆمان وون دەکرێن، ئەو بەسەرهاتانەن کە خۆمان دەمانەوێت بیرمان چێتەوە ئەوانی تر ئەو رووداوانەن کە خۆمان ناتوانین بیرمان چێتەوە. سەرهەڵدانی هەستی پەشیمانی بوون ژیانی تەنهاکەس سەغڵەت دەکات. زۆربەی جار شەوانە یاخود لە

کاتی بەتاڵیدا بەشێوەی جۆراوجۆر پەشیمانیەکان سەر هەڵدەدەن..

ئەو روداوانەی کە لە ژیانی تەنها کەس دا رووئەدەن بەشی هەرە زۆریان لە جیهانی بێ ئاگاییدا خەزن دەکرێن، ئەم زانیاریانە کارێکی گەورە دەکەنە سەر شەخسیەتی کەسەکە رۆڵێکی سەرەکی ئەبینێ لەداهاتووی دا. بۆ نموونە ئەو کەسانەی کە بەمندالّی بایەخەیان پێ نەدراوەو خۆشەویستیان کەم دراوەتێو سنووریان بۆ دانەنراوە. لەوانەیە ئەم کەسانە شالاوی رق‌وکینەو ئەو تۆڵە سەندنەوەیەی کە ساڵەهای ساڵ پێچی خواردۆتەوە لە ناخیاندا ئاراستەی کەسانی نزیك‌و دەوروبەرەکەی خۆیانی کەنەوە.

بەشێکی هەرەزۆری زانیارییەکان، رووداوەکان لە جیهانی بێ ئاگایدا لە دەستگای زاکیرەی گەورەی خەزن کراوە، بەڵام ئاسان نییە کەسەکە بیەوێت یاخود بتوانێ بەبیری بێتەوە. ئەم زانیاریانە دووجۆر خەزن کراون لە جیهانی بێ ئاگاییدا. یەکێکیان رەگی قووڵی داکوتاوە بۆ نموونە ئەو رووداو کارەساتانەی کە لە سەردەمی سەرەتایی مندالّیدا روی داوە لە ژیانی کەسەکەدا. ئەوی تریان ئەو زانیاریانەیە کە رەگی بەهێزی لە جیهانی بێ ئاگاییی زۆر بەقووڵی دانەکوتاوەو پێویستمان بە بیرخەرەوەیەك هەیە کە بیرمان بهێنیتەوە.. بۆنموونە لەکاتێك گیرۆدەی گیروگرفتێك دەبین، سەری دونیامان لێ دێتەیەك‌و بەرچاوی خۆمان نابینین. بەڵام کاتێك یەکێك ئامۆژگارییەکمان دەکا. یەکسەر لەنێو مێشکی خۆمان دا چارەسەرێکمان هەیەو بیرمان دەکەوێتەوە. خۆمان زانیاریەکانمان هەیە بەڵام پێویستمان بەیارمەتی دەوروبەرمانە بیرمان خەنەوە!

### وەرگرتن‌و تۆمارکردنی زانیارییەکان

وەرگرتنی‌و تۆمارکردنی زانیارییەکان دوو جۆرن، یەکێکیان خۆی سەرەتاییە مرۆڤ خۆی ناتوانی کاری لەسەر بکات. بمانەوێت یانەمانەوێت ئەو زانیاریانە لە مێشکماندا خەزن دەبێت. بۆ نموونە روداووکارەساتی جەرگبڕ یاخود زانیارییەکان



سەبارەت بەجیهانی ناوەوەی کەسەکە خۆیەتی. هەندێکیان ئەو بەسەرهات‌و روداوانەیە کە کەسەکە نایەوێت بیان بینێ‌و یادکردنەوەشی نەفسی بێتاقەت دەکات. جۆری خەزنکردنەکەی تر سانەوییە کە مرۆڤ بۆ چارەسەرکردنی گیروگرفتەکان لە ئەنجامی ئەزموونێکی دوورودرێژی ژیاندا خەزنی کردووە لە مێشکیدا. رۆژانە ئەو زانیاریانە هەڵبژێرێت کە گرنگی‌و چارەسەری کیشە کاتیەکانی پێ دەکات یاخود سوودیان لێ وەرئەگرێت.

کاتێك پرسیارێك لە کەسێك دەپرسیت سەبارەت بە دین. ئەگەر کەسەکە خاوەن ئیمان بێت، ئەوا وەڵامەکەی ئەو زانیاریانەیە کە راست‌و دروستی دین ئەسەلمێنێ. لە ئەندامی رێکخراوێك بپرسیت تەنها ئەو زانیاریانە دەخاتەڕوو کە لەبەرژەوندی رێکخراوەکەیەتی.. ئەو بیروڕایانەی کە بەجۆرێکی رەها هەمانە چوارچێوەیەك دروست دەکات بۆ بیروڕاکانمان. زەقترین نموونە بەها کۆمەڵاییەتییەکانە کە جێگای خۆی گرتووەو لە بیروهەڵسوکەتماندا و رۆژانە بەکاریان دێنین بەبێ ئەوەی کە گومانی لێ بکەین یاخود بوێرین بەچاوی رەخنەوە بۆی بڕوانین.

### بیرچوونەوە

هەچ زانیاریەك کە لە مێشکدا خەزن بووبێت هەرگیز نافەوتێت. تەنها خەتەکانی کاڵ دەبێتەوەو وەك قووماشێك خۆری بەرکەوتبێت‌و رەنگەکانی کاڵ کردبێتەوە. هەندێ جار مێشکمان جام دەبێت‌و زانیاریەکەمان نایەتەوە بیر، پێویستمان بە دەوروبەرەکەمانە کە بیرمانخەنەوە، کاتێك دۆستێك پێمان دەڵێ "چۆن فلان کەس ناناسی؟ کوڕی فلان کەسە، برازای ئەوەی ساڵی پێشوو پێکەوە سەفەرتان کرد ". جاری وا هەیە کە بەدوای ناوێکدا دەگەڕێی. ئەها فلان کەس دەڵێ. هەندێ جار زاکیرەی ئەوەندە کاڵبۆتەوە کە زۆر بەزەحمەت یادی منالّیمان بیردەکەوێتەوە...

توانای لە بیربردنەوە یەکێکە لە هۆ گرنگەکانی(Försvar mekanism) خۆپاراستن. بۆنموونە بیرچوونەوەی کارەساتە ناخۆشەکانی ژیانمان‌و راهاتن بۆ خەم‌و

خەفەت، مەترسی...

لە سەرەتای بەرپابوونی جەنگدا دڵمان زۆر ناخۆشە بەڵام بە تێپەڕبوونی کات زیاتر دێینەوە سەرخۆمانو لەگەڵ کارەساتە جەرگبڕەکاندا رادێین. بۆ نموونە لە کاتی بەرپابوونی جەنگدا زۆر خەفەت دەخۆین بۆ کەسێك کە دەیناسینو لەشەڕیشدا گیان لە دەست دەدات. بەڵام پاشماوەیەك مەجبورین خۆمان بگونجێنین لەگەڵ وەزعەکەدا، جەنگو ماڵ وێرانی بەردەوامەو هەموو کەس ژیانی لە مەترسیدایەو ڕۆژ نییە کۆمەڵێك بێ تاوان گیان لەدەست نەدەن. بەشەوو بەڕۆژ کارەساتە ناخۆشەکان خۆیان ئەکەن بەمێشکدا تا وامان لێ دێ کە خۆمان لەواقیعەکەدا وون دەکەینو بەو جۆرە خەفەت ناخۆین کە وەکو لەسەرەتادا خواردوومانە. ئەم جۆرە گۆڕان سازیە تەفسیری خۆی هەیە، ئەم جۆرە سیگنالانە هەزارجار خۆیان دەکەن بەمێشکداو ئاگاداری دەکەنەوە، تاوای لێ دێ کەمێشك پێیان رادێو بایەخ بەئاگادارکردنەوەکەیان نادا.

## بیرکردنەوە ڕێگای لێ ناگیرێت

بیرکردنەوە توانایەکی خودایی بەخشراوەو کەس نییە بتوانێ جڵەوی بگرێت هەروەکو هەناسەدانو دەورانی خوێن وایەو خۆی لەخۆیەوە دروست ئەبێت ناتوانین پەرپەرچی بدەینەوەو هەر هەوڵدانێك بۆ بەرەنگاربوونەوەی بێ ئەنجامە.

توانای بیرکردنەوە وەکو چالاکییەکانی تری ژیان وایە. وەکو سەیارە لێ خوڕین، وەرزش کردن، شەڕکردن، هەندێ کەس چالاککترە لەکەسانی تر، هەرکەسو بواری خۆی. هەموو کەسێك توانای ئەوەی هەیە بگاتە نزیکی ئاکامێکی مام ناوندی لە فێربوونی ئەو چالاکییانەدا، ئەمەش بەخۆهیلاك کردنو حەزلێکردنو مەشقکردن دێنە کایەوە. ئەو کەسەی کە توانای بیرکردنەوەیەکی باشی پێ بەخشرابێت، مانای ئەوە نییە یەکسەر دەبێتە کەسێکی شارەزا. ئەوکەسەی کە خاوەنی سەیارەیەکی نوێیە مانای ئەوە نییە کە شوفێرێکی باشیشی لێ دەرئەچێت



لەبەر ئەوەی خاوەنی سەیارەی تازەیە. لەوانەیە یەکێك کە سەیارەییەکی شەقو شڕی هەبێت شوفێرییەکەی لەو زۆر زۆر چاکتر بێت. زیرەکی تەشبیە ئەکرێت بەسەیارەکە. مەزنی بیرکردنەوەو گەشەکردن لەڕاهێنانو فێربوون دایە.

## تەوقی زیرەکی

خەڵکی خواخوایەتی پێی بوترێت (inteligent) زیرەك ( بەزیرەك ناویان ببرێت) وا دەزانین کە زیرەکی پەیوەندی راستەوخۆی هەیە بەکەسایەتی خۆمانەوە. توانای زیرەکی پێویستی بەشانازی پێوەکردن نییە چونکە تواناییەکی (زگماکیە). ژمارەییەکی کەم لە هەموو کۆمەڵگایەکی ئەم گەردونە ئەم بەهرەیەی پێبەخشراوە. بەشی هەرەزۆری خەڵکی لە تێکڕای زیرەکی کۆبوونەتەوەو زیرەکییەکەیان مام ناوەندیە.

تاقیکردنەوەکان گەیشتوونەتە ئەو ئەنجامەی زۆربەی ئەو کەسانەی کە زیرەکن رادەی بیرکردنەوەیان نزمە. لە پرۆسیسی فێربووندا دوادەکەون چونکە ئەم کەسانە بەرادەی زیرەکی خۆیان زۆر دەنازنو کەوتۆنەتە تەوقی زیرەکی خۆیانەوە. کەسە زیرەکەکان، کەم گوێ ئەگرنو توانای ئەوەیان هەیە بۆ هەربیرو ڕایەك کۆمەڵێ بەرگری بهێننەوە. کە زۆربەی جار بێ بیرکردنەوە سواری کۆڵی ڕێگای هەڵە ئەبنو هەزار شیرینو فەرهادی بۆ دەخوێننەوە. بەڵام کەسێکی مام ناوەندی پێش ئەوەی دەمکاتەوە، بیرئەکاتەوە لەسەرخۆ. بەئیحتیمالە گونجاوەکاندا هەنگاو ئەڕوات تا ئەگاتە وەڵامێکی مەنتیقی.

هەندێ کەسی زیرەك ئەوەندە بڕوای بەخۆی بەهێزە هەمیشە خۆی بەراست دادەنێت. توانای زیرەکی بۆ زاڵبوون بەکاردێنێ بەسەر منافیسەکانیدا. چونکە هەر بیرێك وەك ڕێگایەك وایە کە پێمان تێنا ئەمان با لەگەڵ خۆی دا، ئەمەش زۆربەی جار بەمەودایەکی تەسکو هەڵەدا بەکێشمان دەکاتو کەملمان بۆنا ئەبێت پێیدا تێپەربین.

لەولاتانی رۆژهەلاتی ناوەڕاست زیرەکی لەزوو وەلام دانەوەدایەو هەروەها تێکەلکردنی هەستی تایبەتی کەسی قسەکەر ئەوەندەی تر بەهێزتر دەکات. سەرکردەیەکی رۆژهەلاتی ناوەڕاست یەکسەر تەعلیق لەسەر رووداوێکی گرنگی کوتوپڕ دەدات بەلام سەرکردەی ولاتێکی دیموکراتی تەعلیقی لەسەر نادا هەتاوەکو بەتەواوەتی زانیاری سەبارەت کۆنەکاتەوەو بیروڕای راوێژکارەکانی وەرنەگرێت. کاتێکیش کە تەعلیقی لەسەر دەدات بەشێوەیەکە وەکو ئەوەیە کە بلێین دیوار لەگەل تۆمەو پاساری گوێت لێبێت.

بەکورتییەکەی زیرەکی بێ بیرکردنەوە وەکو کۆتێک وایە خاوەنەکەی ئەیکاتە ملی، ئیحتیمالی زۆری هەیە کە توانای گەشەکردنی بیرکردنەوەی مەنتیقی لە خۆی دابڕێت. کەسە کەم زیرەکەکان بەهەولو کۆششکردن ئەتوانن زۆربەی جار پێشی کەسە زیرەکەکان بدەنەوە.

## بیرکردنەوەی پێچەوانە

چی رووئەدا کاتێک مرۆڤ بیرکاتەوەو پێچەوانەی بیرکردنەوەکەی رەفتار بکات. ناپلیۆن کە یەکێك بووە لە ژەنراڵە لێهاتووە ناسراوەکانی دونیا پەلاماری روسیای دا. سەر لەشکری رووسی ناوی ژەنراڵ (Kutuzov) بوو. ئەم ژەنراڵە ناسراو بوو بەکابرایەکی ئەلکهولیی، چونکە دایم خەریکی خواردنەوە بوو. ئەوەندە ئەو قەدرو ئیحترامی قۆدگای لەلابوو ئەوەندەی شالاوەکەی ناپلیۆنی بەلاوە گرنگ نەبوو.

لەشکرەکەی ناپلیۆن بەبێ بەرگری کردن خۆیان دەکرد بەناو خاکی روسیاداو لەشکرەکەی (Kutuzov) ئەکشایەوە بۆ دواوە. لەماوەیەکی کورتدا لەشکرەکەی ناپلیۆن ئەوەندە زۆر هاتبووە ناو ئەرزی روسیاوە کە پەیوەندیان پچڕابوو لەگەل کۆتایی لەشکرەکەیاندا، ناپلیۆن گەیشتە مۆسکۆ. بەلام شارەکە پێشتر چۆل کرابوو، هەرچیش سوودێکی لێ وەربگیرایە بە ئەمری ژەنراڵ (Kutuzov) سوتێنران.



بەئاشکرایی ژەنراڵ (Kutuzov) دەوری سەرلەشکرێکی دۆڕاوی دەبینی. خەلکی روسیا کەوتنە گومانو دوودل بوون لەوەی چارەنووسی ولاتێك چۆن خراوەتە دەستی ژەنراڵێکی مەشرووبخۆر.. چۆن زەلامێکی ئەلکهولی ئەتوانێ بەرەنگاری لەشکری ناپلیۆن بکاتو تێکی بشکێنێ.

ژەنراڵ (Kutuzov) خۆی ئەیزانی چ پلانێکی داڕشتووە. کاتێك کە میوە پێ بگات لێ ئەکرێتەوە، یاخود خۆی لەخۆیەوە دەکەوێتە خوارەوە. لەشکرەکەی ناپلیۆن چاری نەما لەترسی سەرماو برسێتی بکشێتە دواوە. لەکاتی کشانەوەکەیاندا ژەنراڵ (Kutuzov) ئەمری دەرکرد کە لەشکری ناپلیۆن بدەن بۆ یەکەمین جار لەشکری ناپلیۆن لەمێژوودا خراپ تێکشکێنرا.

ئەوەی لە زیرەکی ژەنراڵ دا دەردەکەوێت بیرکردنەوە بوو لە کاتیگۆری نوێ. ناپلیۆن بەسەردا چووە نێو ئەو تەلەی کە ژەنراڵ (Kutuzov) بۆی نابۆوەوە.

رەوەکەی سالی ١٩٩١ دەتوانرێت دابنرێت بەگرنگترین رۆلی راستەوخۆی میللەتو بەشداربوونی لەدیاری کردنی چارەنووسەکەی ئەمڕۆی. ئەوەی کە ئەوان بەدەستیان هێنا لەوچەند هەفتەیەدا بەچەند سال خەباتی چەکداری موستەحیل بوو بەدی بهێنرایە. ئەو دواڕۆژەی کە ئەمڕۆ کورد بەدەستی هێناوە ئەنجامی هەولو خەباتی هاوبەشی میللەتەکەمان بووە. چۆلکردنی شارەکانو بەهەزاران بوونە قوربانی تۆپ بارانو لوغم سەرماو برسێتیو نەخۆشی بووە هۆی ئەوەی ویژدانی هەموو دونیا بجولێنێو ئەم دوارۆژە پڕهیوایە بۆ کورد بەدەست بهێنێ.

## بیرکردنەوەو مانا دۆزینەوە

بەندییەکی ئەبەدی ئەبێت کە هیچ هیوایەکی بەربوونی نابێت، لەپەنجەرەی ژووری بەندیخانەکەی تەنها ئەو بالندانە دەبینی کە بەئاسمانەوە جاروبار فڕیون. جارێکیان تەیرێکی بال شکاو بەرێکەوت دێتە ژورەکەیو بەندیەکەش هەولی چاککردنەوەی بالەکەی دەدات. گیراوەکە لەپڕ مانایاکی تازەی لەلا دروست

دەبێتو بەسەدان کتێبی سەبارەت بەباڵندە دەخوێنێتەوە. ڕۆژ بەڕۆژ گیراوەکە زانیاری نوێ لەباڵندەکان فێر دەبێتو تاوای لێ دێ کە ببێتە شارەزا لە نەخۆشییەکانی باڵندەو بەخێوکردنیان. بەندەکە وا ناوبانگی دەرکرد کە لەناوچەکەدا ڕۆژانە باڵندەی نەخۆشی بۆ دەهات...

بیرکردنەوە لەسەرخۆ، خۆفێرکردن، هەروەها بینینی نوێ لەرواڵەتی نۆی دا وای لەبەندەکە کرد مانایەکی تازە بۆ ژیانی بدۆزێتەوە ئەو کەلێنە گەورەی تەنهاییە کە تێدا دەژیا پڕکاتەوە.

## بیرکردنەوەی ئیختیاری

ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە زۆر باوە بەتایبەتی لەنێو پارتو گروپە سیاسیو ئاینیەکانداو بەگشتی لەنێو سەرانسەری گروپەکانی کۆمەڵدا. ئەم بیرکردنەوە تەنها بەشێکی هەڵبژاردە ئیختیار دەکات لەمەودای بیرکردنەوە. تەنها ئەو لایەنانە دەبینی کە دەیگەیەنێتە ئەو ئەنجامەی کە ئەم پێشتر خۆی بۆخۆی داناوەو ویستوویەتی پێی بگات. ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە پەیوەندی راستەوخۆی هەیە بەمەحکومکردنی یەکێك یا گروپێکی تر بەبێ ئەوەی کەسەکە زانیاری تەواوی هەبێت.

یەکێك لەئەوروپادا بژی نازانێ چی رووئەدا لەنێوان چوار دیواری حیزبەکانداو یان ئاگای لەو زانیاریە شاراوە هەبێت کە سەرکردە سیاسیەکان هەیانە. هەموو کەس تەبیعی بۆی هەیە خاوەنی چ جۆرە روانینێك بێت. بۆنموونە ئەگەر بڵێین. "سەرکردە سیاسیەکانی کورد ئەمجارەشیان کوردیان بەشوودا". وەکو ئیحتیمال ئەم تێڕوانینە لەوانەیە راست بێت، بەڵام ئیحتیمالی زۆریشی هەیە کە هەڵە بێتو دوور بێت لە راستی. چونکە ڕوانینەکە لەسەر بیرکردنەو چۆنێتی زانیارییەك دروست بووە کە نوقسانە! خەڵکی دەرەوەی حیزبەکان ئاگایان لە نهێنیە شاراوەکان نییە ئەندامە بەرزەکانو سەرکردەکان دەیزانن. یا لەروی تەنها کەسەوە مەحکومکردنی



خەڵك"فلان کەس موسوڵمانە... کافرە ... ساختە چییە.." ئەم جۆرە حوکم دەرکردنانە رەگی قوڵی لەمەزاجو هەستی کەسایەتیدا داکوتاوە.

لەتاقی کردنەوەیەکدا ١٦ پەنجەرەی بچکۆلانەی چوارگۆشەیان پیشانی کۆمەڵێك خەڵکداوەو لێیان پرسیوون چەند چوار گۆشە دەبینن؟ لەسەدا سەد وەڵامی داوەتەوە کە ١٦ چوارگۆشە دەبینن. کێشەکەیان چارەسەر کرد لەسەر ئەو ١٦ چوارگۆشەیەی کە لەبەرچاویانە. بەڵام هەقیقەت وەڵامی پرسیارەکە ٣٢ چوار گۆشە بوو نەك ١٦.

کاتێك برادەرێك کێشەیەکی لەگەڵ خێزانەکەی دا دەبێتو بۆ برادەرێکی دەگێڕێتەوەو داوای ئامۆژگاریی لێدەکات، برادەرەکەش لەسەر ئەساسی ئەو زانیاریانەی کە وەریگرتووە چارەسەرێکی بۆ ئەدۆزیتەوە، بەڵام چارەسەرەکە، کێشەی تر بۆ کەسەکە دروست دەکات. چونکە ئەو زانیاریانەی کە ئەم پێویستیەتی بۆ دۆزینەوەی چارەسەرێك کەسەکە بەنوقسانی ئامۆژگاریکەرەکە وەریگرتووە. بۆ ئەوەی چارەسەرێکی دروست بدۆزرێتەوە ئەبێت قسەش لەگەڵ خێزانی کەسەکە بکەی رای ئەویش وەربگری کە ئەویش خاوەنی مەسەلەکەیە.

بیرکردنەوەی ئیختیاری مەترسیەکی گەورەیە لەسەر رەوتی دیموکراتیو ئازادی تەنها کەسو مەحکومکردنی گروپو تۆیژاڵەکانی کۆمەڵ تەنها چەقۆ وەشاندنە لەپشتەوەو ئاشکراکردنی دەروونی کەسەکان خۆیانن.

## بیرکردنەوەو رەخنە

زۆرجار گوێمان لێ دەبێت کە دەوترێت دەبێت "رەخنە بنیاتنەر بێت نەك روخێنەر" ئەگەر رەخنەگرێك بەرهەمێك هەڵ نەوەشێنێتەوەو نووقسانیەکانی نەگرێت، چ رەخنەگرێکەو ئیتر چۆن بەرهەم گەشە دەکاو پێش دەکەوێت لەداهاتودا ئەگەر کەموکوڕیەکانی نەخرێتە ڕوو.

هەرکارێکی ئەدەبی، کەلتوری..... بگرێت پڕە لەنووقسانی هەمیشە وردەکاری زۆری تێدایە کە ئەتوانرێت جوانترو چاکتر بکرێت. ئەو نووقسانیانەشی کە لە

بەرهەمەکەدایە پەیوەندی بەکەسایەتی کەسەکەوە نییە، بەڵکو بە بەرهەمەکەیەوەیە. بەڵام زۆربەی جار ئێمە بە پێچەوانەوە دەبینین. ئەگەر هات‌و یەکێك دەستنیشانی کەموکوڕی بەرهەمەکە بکات ئەوا کەموکوڕییەکان دەبەستێنەوە بەکەسایەتی خۆمانەوە دڵمان زۆر پێی زویر دەبێت.

هەڵبەتە رەنگە رەخنەگریش فەرقی هەیە. رەخنەگری وا هەیە کە رەخنەگرتنەکەی پەیوەندی راستەوخۆی هەیە بەکەسایەتی رەخنەگرەکە خۆیەوەیە زۆربەی جار نوقسانیەکانی خۆیەتی، کە ئەم لەبەرهەمی کەسانی تر دەیبینێ‌و هەندێ لەمانە هەر مەبەستیانە کوێرانە بەرهەمەکان سووك بکەن.

لەسەردەمی خوالێخۆشبوو مەولەوی دا: دوو شاعیری ناسراوی دوو شعری بۆ دەهێنن بۆ ئەوەی هەڵیان سەنگێنێ شیعری کامیان چاکتر بووە لەوی تریان. مەولەویش وەڵامی دابوونەوە بەشیعرێك‌و فەرموو بووی" ئەگەر تەرازوی شیعری فلان کەس قورستر بێت ئەوە هی ئەوەیە کە ئەو بەتەمەن گەورەترەو ئازارو خەمی ژیانی زیاتر چەشتووە بۆیە شیعرەکەی باشترە". مەولەوی لەو سەردەمە کۆنەدا بەچاوی رێزی نەقدییەوە بەرهەمە ئەدەبییەکانی کەسانی تری هەڵسەنگاندووە. ئێستا لە ئەوروپادا لەسەر هەمان شێوەی مەولەوی بەرهەمەکان هەڵدەسەنگێنن. لەپێشدا باسێکی کورتی بەرهەمەکە بۆ خوێنەران دەخرێتە روو، خاڵە بەهێزەکانی باس دەکرێت‌و کۆتایی دێنن بەباسکردنی خاڵە لاوازەکانی بەرهەمەکە زۆربەی جار رەخنەگرەکان بەرهەمەکان هەڵدەواسن.

بەرهەمێکی ئەدەبی وەکو رۆمانێك لەئەوروپادا ئەبێت بەچەندین بێژنکاریدا بڕوات تا دەبێت بەدەست نووس. کاتێکیش کۆمپانیای بڵاوکردنەوە وەری دەگری ٦ مانگی ئەوێت تا دەبێت بەکتێب. زۆر زەحمەتە رۆمانێك نووقسانی نەبێت ئەگەر بێت‌و چاپی دەهەمیشی بێت، هەچ کاتێك چاپ بکرێتەوە لەزۆر شوێندا گۆڕانسازی تیا دەکرێت. بۆ نموونە رۆمانێکم کە دەکرێ بەزمانی دانیمارکی، وەرگێڕەکەی بەدەیان هەڵەی لێ گرتووە بەمەرجێك کە چاپی دووهەمیشیەتی. نووسەر هەرگیز ناتوانێ بەتەواوەتی نوقسانیەکانی نووسینی خۆی ببینێ، بۆیە لەئەوروپا دەستگای بێ لایەنی شارەزا هەیە کە نووسەرەکان نووسینەکانی خۆیانیان بۆ دەنێرن بۆ هەڵسەنگاندن. لەجیاتی ئەوەی کە نووسەرەکە بینێرێت بۆ کەسێکی برادەری بیخوێنێتەوە، یان دڵی نەیەت کەموکوڕیەکانی دەرخات دەینێرێت بۆ ئەم کەسە شارەزایانە.

نوسەرەکە کەسێکی بێ لایەنی پێویستە کە نووسینەکەی بەبێ لایەنی هەڵسەنگێنێ بەبێ هیچ بەزەیی هاتنەوەیەك، گشت کەمووکوڕیەکان بخاتە روو. نووسەرەکەش بەلای کەمەوە ١٢٠ سەعاتی ئەوێت کە ئەو کەموکوڕیانە چاك کات‌و دوایەکەی دەست نووسەکە بنێرێتەوە بۆ رەخنەگرێکی تر. بەکورتیەکەی نووسەرەکە پارە دەدا بۆ ئەوەی رەخنەی لێ بگیرێت! بەکرێ گرتنی رەخنەگر سەریەشەیەکی زۆر دەگەڕێنێتەوە چونکە هەرگیز چاوی نووسەرەکە موستەحیلە بتوانێ نوقسانی نووسینەکان خۆی ببینێ لەرۆمانێك دا.

جۆری نووسین بەتایبەت گۆڤارو رۆژنامە ئەبێت بەشێوەیەك چاپ دەبێت کە چاوی ئینسان بێ تاقەت نەکات لەکاتی خوێندنەوەی. هەندێ کتێب هەیە کە بەجۆرێك چاپ کراوە، ١٠ تا ١٥ پەڕە دەخوێنیتەوە یەك فاسلەی تیانیە نازانرێت بۆچی ئەبێت بەو جۆرە چاپ بکرێت، لەچ زمانێکی دونیادا بەو جۆرە کتێب چاپکراوە!

لەرۆژنامەیەکی ئەوروپیدا تەنها چاو ئەخشێنی بەسەرقەڵەمەکانی ووتارێکدا ئەزانی تەقریبەن چی لەووتارەکەدا نووسراوە. کەچی لەوڵاتەکانی لای ئێمە چۆن پێشتر بۆ نموونە رۆژنامە چاپکراوە هەر بەهەمان شێوە چاپ دەکرێنەوە. چاوپێکەوتن پرسیارو وەڵام نییە چونکە ئەمە کارێکی رۆژنامە نووسی نییە خەڵکی سەرجادەش ئەتوانی ئەمە ئەنجام بدات. کە گفتوگۆیەك دەکرێ لەگەڵ

کەسێکدا نزیکەی دوو سەعات یا زیاتر پێکەوە دائەنیشن‌و لەو ماوەیەدا هەر پرسیارو وەڵامە. دواییەکەی ڕۆژنامەنووسەکە زیرەکانە ناوەڕۆکی گفتوگۆکە بەنزیکەی ٣٥٠٠ ووشە دەنووسێت‌و دەینێریتەوە بۆ کەسەکە. ئەویش دەی خوێنیتەوەو ئیمزای لەسەر دەکات‌و دواییەکەی بڵاودەکرێتەوە.

بەدەگمەن ووتارێك بڵاودەکرێتەوە کە لە ٣٠٠٠ ووشە زیاتر بێت. ووتار نووسەکە دەبێت ووتارەکەی لەو ٣٠٠٠ ووشەیەدا جێبکاتەوە، کەچی لای ئێمە هەر پێشەکی ووتارێك لەوانەیە نزیکەی ٣٠٠٠ وشەیەك بێت.

نەبوونی ڕەخنەو بیرکردنەوەی نەقدی کۆسپێکی گەورەیە لەرێگای گەشەکردنی هەموو میللەتێکدا. ئەگەر دەستگایەك نەبێت مەرج بۆ بەرهەمهێنان دابنێت، شاڵاوی بەرهەم‌و چالاکییەکان فەوزایەکی گەورە دروست دەکەن بۆ هەموو کۆمەڵێك. بۆ ئەوەی میللەتێك پێشبکەوێت لەم بارەیەوە ئەبێت بەرهمهێنەرەکان تەحەمولی ڕەخنە لێگرتن‌و بژارکردنێکی یەجگار ورد بکەن.

سەیری فیلیمێکی کۆن دەکەی کە لەساڵانی چلەکاندا وێنەگیراوە سەدجار وێنەگرتنەکەی چاکترە لە وێنەگرتنی ئەو پرۆگرامانەی کە ئەمڕۆ کە لەکەناڵەکانی تەلەفزیۆنەکانی کوردستاندا پیشان دەدرێت. ئەوا تۆمارکردنی دەنگیش لەولاوە بوەستێ!

جوڵەی لەش‌و دەم‌و لێوو چاو کە دەژمێررێت بە دڵی قسەکردن‌و وێنەگرتن بەزەڕەبینیش نابینرێت لەپرۆگرامەکاندا. پرۆگرام پێشکەشکاری وا هەیە پرسیار لەمیوانەکەی ئەکات‌و کە میوانەکەی وەڵامی دەداتەوە ئەم گوێیان لێناگرێت‌و مەشغووڵە بەئەوراقی فاکسەکانیەوە. هەموو پەیوەندییەکی تەلەفۆنیش بەچەند جار هەللو هەللوو دواییەکەشی "پێشەکی زۆر ڕێزم هەیە بۆ بەرنامەکەتان، داوای سەرکەوتنتان بۆ دەخوازم، بەخێرهاتنی میوانە بەرێزەکان دەکەم، سڵاو ڕێزم هەیە بۆ ستافی بەرنامەکەو ئەوانەی پشت کامێرەو..هتد.."



لەکوردستانی خۆمان ژمارەیەکی یەکجار زۆر خوێندەوارو خاوەن شەهادەی بەرزمان هەیە، ئەگەر بێت‌و بەراوردی کەی بەوڵاتێکی وەکو سوید خوێنەواری کەمتری تیا نییە، کوردیش وەکو میللەتێکی نازیرەك نییە. توانایەکی گۆڕانی زۆر هەیە ئەگەر بێت‌و ڕێگەی پێبدرێت.

جیاوازی لەوەدا نییە کە ئەورووپا پێشکەوتوترەو توانای هەیە ئێمە بێتواناین. بەدڵنیاییەوە لەکوردستان کەسانی شارەزا هەن لە بوارەدا بۆنموونە دەرچوی کۆلیجی ڕۆژنامەو وێنەگرتن. بەڵام ئایا ئەوانە ڕێگەیان پێ دەدرێت لەو شوێنانەدا کاربکەن.

وێنەگرتن هەر ئەوە نییە کامێرایەکی ڤیدیۆ بخەیتە سەرشان‌و خەریکی وێنەگرتن بیت.. ئەگەر بێت‌و وێنەیەکی باش بگریت دەبێت بەلای کەمەوە بە ٣ کامێرا بگیرێت لەهەموو گۆشەیەکی جیاوازەوە. ئەبێت ١٠ سەعات وێنە بگرێت بۆ ئەوەی بیکەی بەچارەکێك. ئەمەش خۆی لەخۆیدا ئیشێکی قورس‌و گرانە، ئاسانترین ڕێگا ئەوەیە کە وێنەگرتنەکە بێ سەریەشە بەتەنها کامێرایەك بگیرێت‌و زووش دێ بەدەستەوە، ئەگەر ئەم زوو بە دەستەوەهاتنەش لەسەر چۆنیەتی پڕۆگرامەکە بکەوێت ئەوا هیچ گرنگ نییە.

ڤیدیۆکلیپێکی گۆرانی جیهانی کە چوار دەقیقەیە لە ٥٠ سەعات تا ٨٠٠ ڕەسمگرتنی دەوێت بۆ ئەوەی ڤیدیۆ کلیپێکی تەواوی لێ دەرچێت. وێنەگرتنی گۆرانیەکی مایکل جاکسۆن ٨٢٠ سەعاتی ویستووەو کە وێنەگرتنەکەی لەماوەی ٣ مانگ لەچەندین وڵاتدا گیراوە.

لە وڵاتیکی وەکو سویدا نزیکەی ٦٠٠٠٠ ئەندامی مۆسیقی لێهاتووی هەیەو زۆربەشیان دەنگخۆشن‌و مۆسیقارن کەچی هەرساڵێ یەك یا دوو کەس هەڵدەبژێرێت گرێبەست لەگەڵ کۆمپانیای مۆسیقا بکات وەك گۆرانیبێژ دانی پێدابنرێت. کەچی لەکوردستانی ئێمەش ئەوەندە گۆرانی بێژو ڤیدیۆکلیپ زۆر بووە

که لەتاقەتی هیچ یەکێکدا نییە ئەم گۆڕانی بیژانە بناسێتەوە.

بێ ڕەخنەگرتن‌و بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە گۆڕان دروست ناکرێت، هەزار ساڵی تریش بێت دیاردەکان لەجێی خۆیاندا دەبن. ئەگەر بێ لایەن نووقسانی بەرهەم‌و چالاکییەکان نەخرێتە ڕوو. ئێمە لەزۆربەی لایەنەکاندا ئەمانەوێت وەك ئەوروپا بژین‌و نوێترین موبایلمان لەگیرفان دابێت سواری نوێترین سەیارە بین، بەڵام کە دەکەوێتە ڕەخنەگرتن ئەبێت تەنها ئەو ڕەخنەیە بێت، ئەویش ڕەخنەی پیاهەڵوتن بێت. ئایا ڕەخنەی بەشان‌و باڵا ووتن چ سوودێکی هەیە لەگۆڕاندا؟ . بۆچی ئەبێت ڕێگا بدرێت بەرهەمەکان بەکەموکوڕیەوە بڵاوبکرێنەوە.

## کۆتایی

ئاوەدانکردنەوەی کوردستان‌و هەنگاونان بەرەو سیستیمی دیموکراتی مایەی دڵ خۆشیە. ئەو گۆڕانسازی‌و دەستکەوتانەی لەم بارەیەوە بەدەست هاتوون، ئەگەر بێت‌و بەراوردی کەین لەگەڵ وڵاتەکانی دراوسێماندا، ئەوا بەدەسکەوت‌و گۆڕانسازی مەزن دەژمێردرێن. دیموکراتی شۆڕشێکە کە لەبنەڕەتەوە کۆمەڵ قڵپ دەکاتەوەو ڕوانینێکی نوێ‌و بیرکردنەوەیەکی نوێ‌و ئوسلوبی ژیانێکی نوێ دێنێتە کایەوە. گۆڕان بەرەو سیستیمی دیموکراتی کارێکی دژوارەو زۆربەی لایەن‌و گروپەکانی کۆمەڵەکە خۆی بەتوندوتیژی بەرپەرچی دەدەنەوەو کۆسپی گەورەی دەخەنە ڕێ. مەترسی گەورەی زۆربەی زۆری وڵاتە تۆتالیتارەکان ئەوەیە کە پرۆسێسی دیموکراتی نەك لەوڵاتەکانی خۆیاندا بەڵکو لەوڵاتە دراوسێکانیشیاندا سەر بگرێت.

هەروەها ئاسان نییە ئەوجۆرە پێکەوە ژیانەی کە خەڵکی دەقی پێوە گرتووە گۆڕانی تیا دروست بێت. پروسێسی دیموکراتی بەستراوە بەملیۆنان کەسەوە کە هەریەکەیان خواست‌و پێداویستی جیاوازە. بۆ نموونە ڕەفتاری کەسێك بگرە هەروا بەئاسانی ناگۆڕێت‌و وەختی خۆی دەوێت، ئەی دەبێت کومەڵێکی چەند ملیۆنی چەن وەختی بووێت بۆ ئەوەی پرۆسیسی دیموکراتی تیا دروست ببێت!



سەرجەمی سیستیمە سیاسیی‌و ئاینیەکانی جیهان بێجگە لە سیستیمی دیموکراتی بەکارەسات‌و زیانی بێ سنوور کۆتایی پێ هاتووە. سەدان ملیۆن کەس کراونەتە قوربانی ئیدولۆگیە جیاوازەکان... ئیتر لە لینینیزمەوەو ستالینیزمەوەو وماویزمەوەو بگرە تا نازیزمی ئەڵەمانی‌و فاشیزمی بەعسی‌و ئیتالی وئەسپانی‌و ئیدۆلۆگیە توندڕەوە ئاینیەکانی ئەمڕۆ....

تەنها لە سیستمە دیموکراتییەکانی غەربی ئەوروپادا ژیانی ئاشتی‌و دادپەروەری‌و ئەمن‌و ئاسایش بەردەوامە. "تاکەکەس" ڕێزی مرۆڤی هەیەو مافەکانی لە یاسادا پارێزراوەو گوێی لێ ئەگیرێ‌و ڕۆڵێکی گرنگی هەیە لە گۆڕان‌و گەشەکردنی کۆمەڵدا. تەنهاکەس خاوەنی بیرکردنەوەی خۆیەتی‌و کەس بۆی بیر ناکاتەوەو ئەتوانێت لە ڕێگای کەناڵە دیموکراتییەکانی کۆمەڵەوە کار بکاتە سەر پارتە سیاسییەکان‌و ناڕەزایی خۆی دەربڕێت‌و ڕۆڵی هەبێت لەگۆڕانسازیەکانی کۆمەڵدا.

زۆربەی دانیشتوانی وڵاتە دیموکراتییەکان بەکاروباری تایبەتی خۆیانەوە خەریکن‌و وەکو لای خۆمان نییە کە هەموومان سەرمان لەسیاسەت بخۆرێت‌و ڕۆژانە ئەودالی هەواڵی سیاسی بن یاخود بەسیایەتەوە خەریك بن. لەسەردەمی هەڵبژاردنە گشتیەکاندا زۆربەی هاووڵاتیان تۆزێك بایەخێکی زیاتر دەدەن بەپارتە سیاسیەکان بۆئەوەی کامیان هەڵبژێرن لەکاتی دەنگدانیاندا. دەنگدانەکە. یان پەیوەندی ڕاستەوخۆی هەیە بەوەی ئایا ئەو پارتانەی کە دەسەڵاتی حوکمیان لەدەستابووە ئەرکی سەرشانیان لەو ماوەی چوارساڵەدا کە حوکمیان کردووەو بەجێ‌گەیاندووە. مەرج نییە یەکێك لەهەڵبژاردنە گشتیەکاندا بۆ نموونە هەڵبژاردنی شارەوانی‌و ناوچەیی‌و پەرلەمان دەنگ بدات بۆ هەمان پارتی سیاسی لەهەڵبژاردنی پەرلەماندا بۆ نموونە لەوانەیە کەسێك دەنگ بدات بۆ لیبرالەکان، لەشارەوانیەکاندا بۆ پارتی چەپ‌و لەهەڵبژاردنی ناوچەکاندا بۆ سۆسیال دیموکرات.

گەورەترین مەترسی کە توشی کۆمەڵێك دەبێت بوونی دەسەڵاتی تەنها حیزبە. گرنك لەوەدا نییە ئەگەر بێتو حیزبەکەش بە هەق زۆرینەی هێنا بێت لەپەرلەماندا. دەسەڵاتی پارتەکە دەبێتە دەسەڵاتێکی رەها، ئیتر پێویستی بەکۆمەك کردنو بیرخستنەوەو دەوری پارتە بچکۆلەکانی تری کۆمەڵ ناکاتو گوێی لەجەماوەرو پێشنیارەکانیان ناگرێت، چۆن بیەوێت وا پارتە دەسەڵاتدارەکە کۆمەڵەکە بەڕێوە دەبات.

جارێکیان لەسوید پارتە بۆرجوازییەکان پێکەوە حکومەتێکی ئیئتیلافییان پێکهێنا. زۆری پێ نەچوو ناکۆکی کەوتە نێوانیانەوەو حکومەتەکەیان هەڵوەشایەوە. ئەمەش کارێکی راستەوخۆی کردە سەر ئابووری سویدو سودی قەرز. لەماوەی دوو رۆژدا لەسەدا دووسەد زیادی کرد، زۆربەی خەڵکی سویدی زیانی مادی گەورەی لێکەوت، چونکە زۆربەی زۆری خێزانی سویدی لەخانوودا دەژین، بەشی زۆری خانووەکەیان قەرزی عەقارەو ئەگەر جاران ٥٠٠ دۆلار سودیان دابێت بەبانك، بە هەمان بڕ بوو بەدووقات. هەروەها هەموو کارگە گەورەو بچکۆلەکانی سویدیش پەیوەندی ڕاستەوخۆی هەیە بەزیادبوونی سودەوە ئەگەر بێتو بەرزبێتەوە ئەوان زیانی لێدەکەن، بۆئەوەی خۆیان رزگاربکەن ناچارن کرێکارو فەرمانبەر لە ئیشەکانیان دەرکەن. لە هەمان کات دا نرخی پێچەوانەی کارگەکان نزم بووەوەو وەبەرهێنەکانی ولاَتانی دەرەوە بڕیاریان دا سەرماییەکانیان لە سوید دەربهێنن. . . بەکورتییەکەی داهاتووەیەکی رەش چاوەڕوانی ئابوری سویدو خەڵکی سویدی دەکرد.

پارتی ئۆپۆزیسۆنی سۆسیال دیموکرات لەجیاتی ئەوەی ئەم هەلە بقۆزێتەوە بۆ ئەوەی خۆیان دەسەڵاتی حوکم بگرنە دەست. کەچی ئەمان بەپێچەوانەوە، بەرژەوەندی خەڵکی سویدیان بەلاوە گرنگتر بوو، نەك وەرگرتنی کورسی وەزارەت. سۆسیال دیموکرات پێی نا بەجەرگی خۆیداو لەبەر بەرژەوەندی سوید ناکۆکی



ئیدیۆلۆگی خستەلاوە، لەبلۆکی چەپڕەوی دەرهاتو بوو بەپاڵپشتی پارتێکی رکەبەری بۆرجووازی. پارتە بۆرجووازییەکە حکومەتێکی کەمینەی دامەزراندو سۆسیال دیموکراتیش لەپەرلەماندا پشتگیری لێکردن. ئەوە چەند ساڵە دوو ئیدارەی ناوچەیی هەیە لەکوردستان، کە تا حاڵی حازر میللەتی کورد چاوەڕێیە کەی رۆژێ بێت ئەو دوو ئیدارەیە ببن بەیەك. بەلاَم سەیر لەوەدایە کە هەردوولایان لەهەڵبژاردنی داهاتووی عیراق دا بەیەك لیست دابەزین. ئەی تاکو ئێستا چۆن ئەم دوو ئیدارەیە نەبوون بەیەك!

نەبوونی ئۆپۆزسیۆنی بەهێز رێ بۆ کۆمەڵێکی لاوازو پاسیڤ خۆش دەکات. لەچاوپێکەوتنێکی تەلەفزیۆنیدا لەئولف پالمی یان پرسی بوو ، "ئایا لە بەرژەوەندی خەڵکی سویدە ئەگەر هاتوو سۆسیال دیموکرات وەکو تەنها حیزبێك بە تەنها زۆرینەی هەبێت لەپەرلەماندا. وەڵامەکەی پالمی روونو ئاشکرا بووە کە چاکترین ئەنجامی هەڵبژاردن بۆمیللەتی سویدی ئەوەبوە کە سۆسیال دیموکرات لەخوار لەسەدا پەنجاوە دەنگ بهێنێ. پالمی نەی ویستوە سۆسیال دیموکرات بکاتە پارتێکی تەنهاو دیکتاتۆر کە بەزەوقی خۆیان بڕیار دەرکەنو چۆن بیانەوێت وا کاروباری سوید بەڕێوەبەرن. بەرای پاڵمی: "رەچاو نەگرتنی بیروڕا جیاوازەکانی ئۆپۆزسیۆن بەزیانی گەورە کۆتایی دێت، بۆ کۆمەڵ چونکە بیرو بینینەکانی ئەوانیش ڕۆڵێکی گرنگیان هەیە لە بەڕێوەبردنی کاروباری کۆمەڵدا".

پێشکەوتنی کۆمەڵێك لەوەدایە کە بیروڕا جیاکانیش مۆڵەتیان هەبێت سەرهەڵدەن، ئەمەش تەنها لەرێگای ئۆپۆزیسیۆنێکی بەهێزەوە دروست دەبێت کە بتوانن لەگۆڕانە دیموکراتییەکاندا بەشداربنو دەوریان هەبێت لەگۆڕان سازییەکاندا. بینینی جیاوازو بیرکردنەوەی رەخنەگرانە بەنرخترین سەرمایەو گەشەپێکەری گۆڕانی دیموکراتی ناو کۆمەڵە.

## سامان و دەسکەوتی کۆمەڵ

کۆمەڵگاییەك بۆئەوەی بەڕێوە بچێت دەبێت ئیدارەیەکی هەبێت کاروباری کۆمەڵەکە بەڕێوەبەرێت. هیچ کۆمەڵێك ناتوانێت بەرێکوپێکی ئەم کارە بکا ئەگەر بێتو ئیدارەیەك لەڕێگای نوێنەرەکانی کۆمەڵەوە هەڵنەبژێرا بێت. بۆ نموونە لەناوخێڵە هندییەکاندا پێنج جۆر شورای تایبەتیان هەیە بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری خێڵەکەیان. کارێکی سرووشتیە کاتێك نەخۆش دەکەوین ئەوا روودەکەینە لای دکتۆر، ئەچینە قوتابخانە بۆ ئەوەی فێری خوێندەواری بین. . . ئیدارەکردنی کۆمەڵێکیش‌و تەشریعکردنی یاساکانی ئەبێت لەرێگای پارتە سیاسیەکانەوە بێت کە نوێنەرایەتی کۆمەڵەکە دەکەن. بەهەمان شێوە بۆ ئیدارەکردنی کۆمەڵ دەبێت رووبکەینە سیاسیەکان.

ئیدیۆلۆگی‌و پرۆگرامی پارتە سیاسیەکان گرنگ نییە، گرنگی لەوەدایە ئایا ئەو پارتانە ئەتوانن سەرکەوتوانە وڵات بەڕێوەبەرن؟ یان بەمانایەکی تر ئایا توانیویانە بەچاکترین شێوە ئەرکی سەرشانیان راپەڕێنن‌و تەشریعی یاساکانی ئیدارەکردنی کۆمەڵ دەربکەن؟ ئایا ئەو پارتە سیاسیانە بۆیان هەیە پێیان لەبەرەکەیان زیاتر ڕاکێشن‌و تەنها ئەو ئەرکانە ئەنجام بدەن کە لە بەرژەوەندی پارتەکانیان دایە؟ ئایا دەسەڵاتێکی یاسایی بنەڕەتی هەیە لەکۆمەڵەکەدا کە دەسەڵاتی لەسەرو دەسەڵاتی پارتەکانەوە بێت.

ئایا پارتەکان بۆیان هەیە لەسەر حیسابی سامانی کۆمەڵ خاوەنی رادیۆو کەناڵی تەلەفزیۆن‌و ڕۆژنامەی تایبەتی خۆیان بن؟ ئایا ئەم پارتانە ئەتوانن لەدامودەزگاکانی کۆمەڵدا ئەندامەکانی خۆیان‌و دەست‌و پێوەنەکانیان لەجیاتی کەسانی شارەزاو لێهاتوو دابمەزرێنن؟ ئایا پلەو پایەو وەرگرتنی دەستکەوت ئەبێت تەنها لە ڕێگای بەئەندام بوونەوە بێت لەم پارتیانەدا، بۆ نموونە تەعین کردن‌و زەوی‌و



خانوو وەرگرتن؟ ئایا ئەتوانرێت پارتییە سیاسییەکان دەستبگرن بەسەر داهاتوو سامانی کۆمەڵدا، چۆن بیانەوێت وا دابەشی کەن بەسەر ئەندامەکانیان‌و جەماوەردا وەکو باوە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەراست‌و سیستیمە تۆتالیتارو دیکتاتۆرییەکاندا؟

نزیکەی سەدساڵ سۆسیال دیموکراتی سویدی حوکمڕانبوون یاخود ئۆپۆزیسۆن بوون لە پەرلەماندا بەڵام هیچ کاتێك لەم ماوە دوورو درێژەدا نەیان توانیوە هەڵسوکەوتی تایبەتی بکەن بەداهاتی کۆمەڵەکەوەو بەخواستی خۆیان بەکاری بێنن بۆ خزمەتکردن‌و بەرژەوندی حیزبەکەیان‌و ئەندامەکانیان. ئەمڕۆکە حیزبی سۆسیال دیموکرات توانای مادیان ئەوەندە نییە کە وەکو پێویست نامە رەوانەکەن بۆ ئەندامەکانیان.. زۆربەی جار ئەندامەکان خۆیان ئەبنە نامەبەرو بەتایبەت لەسەردەمی هەڵبژاردنە گشتیەکاندا. بودجەی پارتە سیاسیەکان تەنها پێکهاتووە لەو ئابونەیەی کە ئەندامەکانیان ئەیدەن بەحیزبەکەیان، لەگەڵ هەندێك یارمەتی دەوڵەتی کە ساڵانە دەدرێت بەپارتە سیاسیەکان. لە وڵاتەکانی ڕۆژهەڵاتدا نەسریەی ئەندامێکی مەکتەبی مام ناوەندی هەچ حیزبێك بگرێت لە ئاستێك دایە کە بەلای کەمەوە ئەتوانرێت کۆمەڵێك خێزانی پێ بەخێو بکرێت!

ئەگەر بێتو بچینە راو لەگەڵ کۆمەڵێك ئەکسیمۆدا. ئەگەر لەراوەکەشدا بەشدار نەبین ئەوا بەشی خۆمان لەراوەکە وەردەگرین. ئەگەر پێیان بووترێ سوپاس بەلایانەوە جنێویکی یەجگار گەورەیە. چونکە بەپێی خورەوشتی ئەوان کە پێکەوە بن ئەوا هەمووکەس بەشی خۆی وەردەگرێت‌و ئیتر پێویستیش بەسوپاس ناکات چونکە خۆی سوپاسەکە گوومانکردنە لەسەخاوەتی راوچییەکان. لەکوردستانی ئێمە سەروەت‌و سامان‌و پلەوپایە لەسەر بنەمای ئینتیماکردن بەش دەکرێن. لەهەمان کاتیشدا دەستگای راگەیاندنی حیزبەکان بونەتە دەهۆڵ ژەنی ئەو پرۆژانەی کە بەردەوامن لەکوردستان. سیاسیەکان ئەرکی سەرشانیانە ئەو کارانە بکەن‌و ئیتر پێویست ناکات هەچ پرۆژەیەك دەرچێت، ئەوا بە دەستکەوتی حیزبی دابنرێت‌و

هەروەها رێگە بدەن بەهەندێ فەرمانبەر کە بەئاشکرایی بەشانو باڵی حیزبو سەرکردەکاندا هەڵدا!

بەڕێوەبردنی کاروباری میللەت ئەرکێکەو تەحوکم کردن بەسەروەتو سامانی میللەتەوە ئەرکێکی تر. دەوری حیزبەکان لەسیستیمی دیموکراتیدا نەخشەی بۆکێشراوە: تەنها ئیدارەکردنو یاسا تەشریع کردنە، فەرمانبەرانیش دامودەزگاکانی کاروباری کۆمەڵ بەڕێوە دەبەن، ئەو بڕیارانە جێبەجێ دەکەن کەپارتە سیاسیەکان پێشتر لە پەرلەماندا بڕیاریان لەسەر داوە.

ئەوەی شایەنی باسە کەسانی لێهاتوو شارەزا دامودەزگاکانی وڵات بەڕێوە ئەبەن ئیتر ئەندامی هەچ تاقمو دەستەیەك بێت گرنگ نییە تەنها شارەزایی کەسەکە دەور ئەبینێ چ کارێکی بدرێتێ نەك سەر بە ئەندامی چ تاقم وحیزبێك بێت..

کاتێکیش کە پارتی دەسەڵاتدار هەڵبژاردن دەدۆڕێنێ تەنها خەڵکە سیاسیەکان کە وڵاتو ناوچەکان و شارەوانیەکان بەڕێوە دەبەن، هەندێکیان کارەکەیان لەدەست دەچێت بەپابەندی رادەی زیانی هەڵبژاردن، ئەگەر پارتێك لەسەدا دوو دەنگ کەمتر بێنێ لەهەڵبژاردنەکاندا ئەوا بەو نیسبەتە کورسی لەکیس دەچێت. خەڵکە ئیدارییەکان لەشوێنی خۆیان ماونەتەوەو بۆ نموونە سەرۆکی شارەوانی، بەڕێوەبەرو فەرمانبەری دامودەزگاکانی تر.

رێزگرتن لەداهاتی میللەت یەکێکە لەهەرە ئەرکە گرنگە دیموکراتیەکان. "موونا شالین" جێگری سەرەك وەزیرانی سوید بوو کاندیدکرا ببێت بەسەرۆك وەزیرو هەروەها سەرۆکی پارتی سۆسیال دیموکرات. دەستگای راگەیاندن موونا شالینی لەقاودا کە: جارێکیان ئەوشتی تایبەتی بۆ خۆی کڕیوەو کەچی بەکارتی دەوڵەتیی پارەکەی داوە. .هەرچەندە موونا پێشتر پارەکەشی گەڕاندبووەوە بۆ خەزێنەی دەوڵەتو روونیشی کردەوە کە لەوکاتەدا کە ئەم شتەکەی کڕیوە پارەی لەگیرفاندا نەبووە بۆیە کارتەکەی بەکارهێناوەو قەرزەکەشی گەڕانوەتەوە، بەڵام



دەستگای راگەیاندنی سوید لەکۆڵی نەبوونەوە تا موونا ناچارکرا کە خۆی وازلە سەرۆکایەتی حزبو کاری دەوڵەت بهێنێ!

خەونێکی تر دێتە پێشەوە ئایا رۆژێك دادێ لەکوردستانی ئێمەش پارتە سیاسیەکان بۆیان نەبێت بەخواستی خۆیان تەحەکوم بەسامانی کۆمەڵەکەمانەوە بکەن؟!

## سیستمی کۆمەڵایەتی

هەموو سیستمە کۆمەڵایەتیەکانی دونیا لە ئەنجامی پێکەوە ژیانی ملیۆنان کەس دروست بوون، هەرکەسەیان بگرێت بەتەنها جیهانێکی تایبەتە بۆ خۆی. ئەم سیستمە جیاوازانە خاڵی هاوبەشیان زۆرە ئەگەر بەراوردیان کەین لەگەڵ یەکتری دا بۆ نموونە:"یاساو زەبر زەنگ بەکارهێنانو دەسەڵاتو پرۆسیسی بیرکردنەوە". ئەم رواڵەتانە بەروونو ئاشکرایی لەپەیوەندی بەیەکەوەکردنی رۆژانەی خەڵکیدا دەردەکەوێت. هەریەکەیان لەسەر بناغەیەکی ئیدیۆلۆگیو یاساییو کەلتوری تایبەت لەجێبەجێ کردنی پێداویستیو چارەسەرکردنی گیروگرفتەکانی رۆژانەی خۆیان دروستبوون.

زۆربەی سیاسیە ئەکتواریتارەکان بڕوایان وایە بیرکردنەوەی رەخنەگرانە وەخت بە زایەکردن بێت، چونکە ئەمانە بڕوای تەواویان بە ئیدۆلۆگیەکەیان تا رادەیەك هەیە کە لەوانەیە لەسەری خۆیان بکەن بەقوربانی، ئیتر ئیدۆلۆگیەکە لەژێر هەچ ناوێك دا بێت: سیاسی یاخود ئاینی.

بڕوای رەها بەهەر ئیدۆلۆگیەك ترسناکترین فاکتەری سەرلێ شێواندنەو بەکارەسات بۆ تەنهاکەسو کۆمەڵ کۆتایی پێ دێت. ئەم ئیدۆلۆگ پەرستانە تەنها ئەو شتانە دەبینن کە مەبەستیانە بیانبینن، تەنها گوێ لەو شتانە دەگرن کە دەیانەوێ گوێیان لێی بێت. بەکورتیەکەی ئەمانە لەنێو چوارچێوەی ئیدۆلۆگیەکەیاندا خۆیان توند کردووەو هەوای مانو نەمانی تیا هەڵئەمژن. ئەم

جۆرە روانینانە بەکارەساتی جیهانی کۆتایی پێهاتووەو بۆتە هۆی هەڵگیرساندنی کۆمەڵێك جەنگی خوێناوی کە ئەکتەرەکانیان سەر بەئیدۆلۆگیە جیاوازەکان بوون ئیتر لەکۆمۆنیستو چەپ ڕەوەکانەوە بگرە تا راستڕەوەکان.

گەورەترین مەترسی بۆ سەر میللەتەکانی دونیا کاتێك بووە کە دەستەبژێرەکانی کۆمەڵ ئیدۆلۆگیەکەیان بەستۆتەوە بە تیۆریەوە، کاتێکیش کە ملیۆنێك دراوە، بە لای تیۆری ناسەکانەوە کارێکی رەوابووە. ئەم جۆرە تیۆری ناسانە زۆر زۆر ترسناکترن لەپیاوکوژی ئاسایی، بۆ نموونە ستالینو سەدام بوونە هۆی لەناوچوونی ملیۆنان خەڵکی بێ گوناه کە تۆمەتی معارەزەی دەوڵەتیان خرابووە پاڵ یان خودا لە رەگەزێکی جیاواز دروستی کردبوون. ئەوەی کە گرنگ بێت لە سیستمی دیموکراتیدا، سیستمەکە تا چ رادەیەك بەرژەوەندی تاکەکەس دەبینێو مافەکانی دەپارێزێ. . ئەو زەبرو زەنگەی کە ئاراستەی تەنها کەس دەکرێت تا چ رادەیەك لەسنووری یاسا دەرنەچووە. ئایا ئیدۆلۆگیەکەو دەسەڵات لەسەر بناغەی دیموکراتی یاخود هیرارکی دامەزراون؟ ئایا دەسەڵاتی سیاسی رێگە ئەدا بە دەربڕینی بیروڕای جیاوازو بیرکردنەوەی رەخنەگرانە؟ ئایا تا چ رادەیەك سیاسیەکان لەئیدارەکردنو جێبەجێکردنی کاروباری کۆمەڵدا سەرکەوتوون ؟ ئایا یاسا نەنووسراوەکانو عاداتو تەقالیدی کۆمەڵەکە تا چ سنوورێك دەتوانن کاربکەنە سەر تەنهاکەس لەهەڵبژاردنی هەلومەجەکانی ژیانیانداو بڕیاردان لەسەر ئەو دیاردانەی کە پەیوەندییان بەژیانی تاکەکەسەوە هەیە؟



هەموو سیستیمێکی سیاسی جۆری رێکخستن و ئیدارەکردنی تایبەتی خۆی هەیە. کەسانی زیرەكو لێهاتوو بەتوانا کۆمەڵ بەڕێوە دەبەن لە سیستمی دیموکراتیدا. لە سیستمی نازیو فاشیدا بەکەسانی بەهێزو بێ هەستو چاونەترسو پیاوکوژ دەبرێ بەڕێوە. . .

لەسیستمی دیموکراتیدا دەسەڵات لەگۆڕاندایەو کەسە لاوازەکانی کۆمەڵ بێ بەشنین لێی، خەڵکی بەگشتی توانای کارتێکردنی لەسەر دەسەڵاتی سیاسی هەیە. لەسیستمی نازی دا دەسەڵاتی نازی یاخود دیکتاتۆری دەسەڵاتێکی رەهایە، کە بەهیچ جۆرێك کەس بۆی نییە گومانی لێ بکات یاخود بەئاشکرا نارەزایی لەدژ دەربڕێت.

هەچ کۆمەڵێکی سیاسی بگریت هەلومەرجی تایبەتیو ئەندامو دۆستی خۆیان هەیە کە لەدەوریان کۆدەبنەوە. لە سەرەتای ۱۹۲۰ ژمارەی ئەندامانی نازییەکان لەئەڵەمانیا لەدوو هەزار کەس تێنەئەپەڕین، کەچی لەساڵی ۱۹۳۹ لە سەدا ۹٤ ئەڵانی لایەنگریو ئەندامی حیزبی نازی بوون. زۆربەی زۆری میللەتی ئەڵانیا شانازییان بەوە کردووە کە ئەڵانینو ئەندامی نازی بوون. لەسەرەتای رووخاندنی مەلەکی ژمارەی ئەندامانی بەعس لەدوو سەدکەس تێ نەئەپەڕین. لەزەمانی سەدامیشدا ڕۆژ نا ڕۆژێ ۱۰۰۰۰۰ کەس ئەچوونە سەر جادەو کۆڵانەکانی بەغدادو وەفاو دڵسۆزیو پەیمانی خۆیان بۆ سەدامو رژێمی بەعس تازە دەکردەوە.

## هەڵسوکەوتی دیموکراتی

ئەو سەرکردەو دەستەو تاقمو رێکخراوانەی کە بە بەردەوامی توندوتیژی بەکاردەهێنن لەزۆربەی وڵاتەکانی ڕۆژهەڵات دا، کەسانێکن مرۆڤایەتی خۆیانیان لەزووەوە لەدەست داوەو هەر بەشکڵ ئینسانن. ئەگەر بهاتایە ئەم جۆرە نەفس نەخۆشانە لە ئەوروپای رۆژئاوادا بوونایە خێرا دەبوونە میوانی بەندیخانەکانو بار ئەبوون بەسەر دەزگا کۆمەڵایەتییەکانیانەوە. بەڵام بەداخەوە سیستمی دیکتاتۆری

بۆتە خێرو بەرەکەت بۆ ئەم جۆرە تایپانە. سەدام حوسەین لە یەکێك لە کۆبوونەوە حزبیەکانی دا بەشانازییەوە باسی ئازایەتیو نەبەردی خۆی کردووە: "من ئەتوانم ١٠ هەزار کەس بکوژم بەبێ ئەوەی کەموویەك لە لەشم بلەرێتەوە". سەدامێك بە یانزە ساڵی چووبێتە مەکتەبو بڕوانامەی پۆلی سێی ناوەندی بەلافاوەکەی عەبدولکەریم قاسم وەرگرتبێت. سەدامێك کە کابرایەکی میسری لە قاتی چوارەوە هەڵدابووە خوارەوە، کاتێك کە لەوێ پەناهەندە بوو، کەچی لە جیاتی لێپرسینەوەو جەزای قانوونی، ٨ ساڵ دوای ئەم تاوانە بوو بە جێگری سەرەك کۆماری عیراقو یانزە ساڵ دوایی تر بوو بەسەرەك کۆمار. عەریفێك کە لە پیرێتیدا فێری خوێندەواری بووبێتو بەزەحمەت پەڕەیەکی بۆ خوێندرابێتەوە ببێتە وەزیری بەرگریو لێپرسراوی دارایی، ئیتر لەم قوڕو لیتەی نەهامەتییە ئەبێ چاوەڕوانی چ تۆزێ بێن هەڵسێ؟

جیاوازی نێوان تێکڕای(معدل) شەهادەی ئەوانەی کە لە سجنەکان دائاخنرابوون لەگەڵ حکومەتەکەی سەدامدا ئەرزو ئاسمان بوو. لە حکومەتەکەی سەدامدا تەنها یەك دوو کەسی تیابوو کە شەهادەی زانکۆیان هەبوو. کۆمەڵێك ئەم تایپانە بیبەن بەڕێوە پێویستیان بە بیرکردنەوە نییە، ئەمانە پێویستیان بە کەسانی وەکو خۆیان هەیە کە کون لە جەرگیاندا نەبێتو پیاو کوشتنو ئاو خواردنەوەیان لەلا وەك یەك وا بێت.

کەسێکی دەسەڵاتدار کە لەکۆمەڵگایەکی دیکتاتۆریدا گۆشکرابێت مەحاڵە بتوانێ رەفتاری دیموکراتی بکاتو تێبگات لە بەها دیموکراتیەکانو بیانکات بە بەشێك لە هەڵسوکەوتی رۆژانەی ژیانی خۆی. کارێکی مەحاڵە ئەم کەسانە لە ژیانی رۆژانەدا بتوانن هەڵسوکەوتی دیموکراتانە بەرامبەر بەخۆیانو خەڵکی تر بنوێنن. بۆ نموونە سەرۆکی کاتی عیراق غازی عجیل



یاوەر زۆر بە توندی بەرپەرچی خۆپێشاندانە دیموکراتیەکەی ئەم دواییەی جەماوەری کوردستانی دایەوە. هەڵسەنگاندنی هەڵوێستی غازی عجیل یاوەر جەوهەری نادیموکراتی خۆی تیا دەردەکەوێت. خۆپیشاندانی جەماوەری لەسەر بناغەیەکی ئاشتی نیشانەی شارستانیەتیەو بەشێکی گرنگە لە بەکارهێنانی میتۆدی دیموکراتی، کە لەسەرانسەری سیستمەی دیموکراتیەکاندا وەکو ئاوخواردنەوە ئەتوانرێت بەکاربهێنرێت. کەچی غازی عجیل یاوەر پەردە لەسەر رووی لائەداو بە زمانە "ئاشناکەی!" سەدام هەڕەشەی کوشتنو سەرکووتکردن لەهەڵوێستی دیموکراتی جەماوەری کورد دەکات. مافی دیاریکردنی چارەنووس سادەترین مافی دیموکراتی سەرانسەری گەلانی جیهانە، کەچی تازە غازی عجیل یاوەر ئەیەوێت سەری کورد پانکاتەوە وەکو ئەوەی رژێمە عەرەبەکانی پێشووی ئەم کەم کوشتنو ماڵوێرانییان بەسەر کوردا هێنابێت.

کاتێك کە سلۆڤاکیا بڕیاری دا لەچیك جیابێتەوە، هاڤڵ ی دیموکرات پیرۆزبایی لێکردنو تەنانەت داوای ریفراندۆمیشی لەگەڵی سلۆڤاکیا نەکرد. هاڤڵ پێی ووتن " تا ئێستا میللەتەکانمان پێکەوە بەئاشتی لەگەڵ یەکتر ژیاوەو ئێستاکەش کاتی ئەوە هاتووە بەئاشتی لەیەکتری جیابینەوە."

کەسێکی هەڵبژاردە کە لەکۆمەڵێکی دیموکراتیدا پەروەردە بووبێت ، هەر لەرۆژی لەدایکبوونیەوە بە بەها دیموکراتییەکان گۆش کراوەو هەر لە باخچەوە بەشدار دەبێت لەپرۆسێسە دیموکراتیەکاندا. ئەم لێپرسراوە ناتوانێ دیموکرات نەبێتو بەپێی جێ کاتیی خۆی لەگەڵ دەوروبەرەکەیدا رەفتار بکات. هەنگاوێکی غەڵەت بنێ دەستگایەکی یاسایی بەراست سەریەوە هەیە، هەموو

زیادەڕۆشتنێکیشی سزای قانوونیی خۆی هەیە. بۆ نموونە دەزگای ڕاگەیاندنی سوید بڵاوی کردەوە کە سەرۆکی پارتی چەپی سویدی لەگفتوگۆکردنێك دا ئاشکرای کردووە کە ئەو کۆمۆنیستەو بڕوای بەکۆمۆنیزمە. ئەم هەڵوێستەی سەرکردەکەی پارتی چەپ زۆر کەوت لەسەر حیزبەکەی، لەماوەیەکی کورتدا بەدەیان لەئەندامانی سەرکردەی پارتەکەو بەهەزاران ئەندامانی تر وازیان لە پارتی ناوبراو هێنا. لەو ئامارە بە مەزەندەیەی کە پێش ماوەیەك لەسوید بڵاوکرایەوە، پارتی چەپ لەو ماوە کەمەدا لەسەدا ٢٠ی لایەنگرانی خۆی لەدەست داوە.

عەرەفات تاوەکو مرد جێگرێکی بۆ خۆی دانەناو تەنانەت لەم ساڵانەی دواییشدا کە نەخۆشی زۆری بۆ هێنا بوو. ئینڤار کالسسون کە سەرۆك وەزیرانی سوید بوو تاقەتی چوو لە سەرۆکایەتیکردنی سۆسیال دیموکراتو کاری دەوڵەتی، بۆیە بڕیاری دا واز لەسیاسەت بهێنێ. بەلای ئەمەوە ژیان هەر سیاسەتو کاری حیزبی نەبوو، بەڵکو خۆیو خێزانەکەیوماڵو منداڵی بەلاوە گرنگتربوو. ماوەی ساڵێك ئەم حزبە خەریك بوو هەتا کاندیداتێك قەناعەت پێبکات کە سەرکردایەتی حزبەکە بکات، هەر کاندیداتێك عوزرێکی ئەهێنایەوە بۆ ئەوەی نەبێت بەسەرۆك، یەکێکیان ئەی ووت" من منداڵم وردە بەجێیان ناهێڵم، منداڵەکانم پێویستیان بەمنەو منیش ناتوانم بیان کەم بەقوربانی سیاسەت"، یەکێکی تریان ئەیوت" توانای ئەوەم نییە وەختێکی زۆر بۆ سیاسەت تەرخان کەم." تۆ بڵێی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا کەسێك هەبێت بیکەن بەسەرکردەی ولاتێك خۆی نەیەوێت بیکات لەبەر خاتری ماڵو منداڵەکانی، یا خۆی لەگەنجێتیدا واز بهێنێ لەبەرئەوەی تاقەتی لە سیاسەت چووەو ئەیەوێ خەریکی شتی تر بێت لەژیانیدا. لەکوردستانی ئێمەش دوو ئیدارەکە ڕێناکەون. زۆر کەس لەو بڕوایەدان کە ڕێکەوتنەکە دەبێتە هۆی ئەوەی کە سەرۆکی ئیدارەیەكو کۆمەڵێك وەزیر لەوانەیە بێ ئیش بمێننەوە.

زۆربەی خەڵکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست کە لەئەوروپا دەژین، هەروەکو لای



خۆمان لێدەخورنو زۆریان ماڵن بەسەر فەرمانگە کۆمەڵایەتییەکانەوە، تەنانەت زمانی وڵاتەکەش فێرنەبوون. زۆربەی کاتیان دانیشتون بەرامبەر بە پەرەپۆلو چۆن ژیانیان لەلای خۆیان بەسەربردووە بەو شێوەیە لەئەوروپادا دەژین. بۆ نموونە لەسوید نۆینەرایەتیکردنی بیانی لەسجنەکانی سویدا دەیان جار زیاترە ئەگەر بەراوردی کەین لەگەڵ خەڵکی سویددا. لێرانەدا ئەبێت میللەتی کورد لەمانە جیاکەینەوە، چونکە هەشن بەجۆرێکی سەرکەوتووانە سودیان وەرگرتووە لەسویدو جێگایەکی ڕێزلێگیراوی باشیان بۆخۆیانو خێزانەکانیان دروست کردووە، بۆ نموونە بەسەدان دکتۆرمان هەیە کە بەرەسەن کوردنو چەندین کەسانی ناسراویان لەدامودەستگا جیاوازەکانی کۆمەڵدا هەیە .

هەزار ساڵ لەسیستمی دیموکراتی دا بژیت ناتوانیت ببیت بەدیموکراتی، یان بەدیموکرات بیرکەیتەوە ئەگەر بێتوو کەسەکە هەوڵ نەدا بەها دیموکراتیەکان بکات بە بەشێك لەرەفتاری ڕۆژانەی خۆیو ڕوانینی خۆی پێ دەوڵەمەند نەکات. پیاوی وا هەیە جامە ئاوەکەی لە بەردەستایە ئەیەوێت بیکەن بەدەمیەوەو بەلایەوە ئەم خاوەنشکۆیەو ئەبێت خزمەتی بکرێتو ئافرەت جێگەو ڕێگای مەتبەخی لێ نەگۆڕێو وەك موڵك بەشێك بێت لەژیانی ئەم. ڕووشیرین بێت کاتێك کەسەکە وەکو دڵی ئەو بجوڵێتەوە، بەڵام کەپێیەکی لاری دانا، یا هەڵسوکەوتێکی کرد کە بەدڵی ئەو نەبوو، ئەوا لێی دەبێ بەئاگرو هەزار قسەی ناشیرینی پێ دەڵێ. زۆر جار گوێمان لێیە" من تێکچووم لەگەڵیدا ئەبێت ئەوانەی کە منیان خۆشبوێت ئەوانیش تێکچن لەگەڵی دا"....

ڕێز لێنەگرتن لە سنووری کەسایەتی کەسێکیترو سەپاندنی بیروڕاکانیان دیاردەیەکی بڵاوە لەنێو خەڵکانی ئەکتواریتاردا. ئەوەی جێگای داخیش بێت ئەم کەسانە سنووری مەحاڵە کە ڕۆژێك بتوانن بە جۆرێکی دیموکراتی بیرکەنەوەو ڕەفتاری لەگەڵدا بکەن.

## کەسە لاوازەکانی کۆمەڵ

یەکێك لەهەرە سیما گرنگەگانی سیستمی دیموکراتی ئەوەیە تا چ رادەیەك ئەم سیستێمە سەرکەوتوو بووە لە دابینکردنی مافی کەسە لاوازەکانی کۆمەڵ نەك دابینکردنی ئەو دەستکەوتە مەزنانەی کە دەستەبژێر(نوخبە)ی کۆمەڵ بەدەستیان هێناوە بۆخۆیانو لایەنگرەکانیانو کەسە ساغو سەلیمەکان. لەیارییە ئۆلۆمپیەکەی ئەم دواییە کە لەیۆنان سازکرا، زۆربەی زۆری میدالیەکانیان لەلایەن بەشداربووەکانی ئەمەریکا برایەوە، بەڵام لەهەمان یارییە ئۆلۆمپیاکاندا کە بۆ کەسە کەم ئەندامەکان ساز کرا، سوید بەپلەی یەکەم هاتو زۆربەی میدالیەکانی بردەوە.

کەم ئەندامێك بۆ نموونە لەسویدا کە بەسەیارەکەی رووئەکاتە هەرشوێنێ، جێگای پارککردنی ئۆتۆمبیلی تایبەتی هەیەو شوێنی پارککردنەکەشی فرەوانترە لەهی کەسانی ساغ. هیچ کەسێکی تریش بۆی نییە بێجگە لەخۆی بتوانی لەو جێگا تایبەتانەدا ئۆتۆمبیل بوەستێنێ.

کاتێك پیرو نوقسان شت دەکرن، زۆربەی دوکانەکان بۆیان دەبەنەوە ماڵەوە یاخود بۆیان دەخەنە ناو ئۆتۆمبیلەکانیانەوە. کاتێکیش کە پێویستیانە دەست بەئاو بگەیەنن لەزۆربەی دامو دەستگاکانی کۆمەڵدا تەوالێتی تایبەتیان بۆ دروستکراوە. لەخانوەکەشیاندا مەسعەدی (ئاسانسوار)ی تیایەو ماڵەکەیان بەجۆرێك بۆ رێکخراوە، کە ئەرکی رۆژانەیان لەسەر کەمکاتەوەو بەئاسانی بەخۆیانو عەرەبانەکانیانەوە بێنو برۆن. ئەگەر ویستیشیان برۆن بۆ لای دکتۆر یاخود سەردانی کەسێك بکەن ئەوا دەتوانن بەتاکسیو بەنرخێکی یەکجار هەرزان هاتوچۆبکەن . زۆربەی چێشتخانەکانی شارەکانیش وا دروست کراون کە بتوانرێت کەم ئەندام بەخۆیو عەرەبانەکەیەوە بۆی بروات.

هەندێك پیرو پەککەوتە کە ناتوانن لەجێگا دووركەونەوە، لەهەموو بەشە جیاکانی شارەوانییەکەدا گروپی ئیشکەری تایبەتی هەیە، کە رۆژانە سەر لەو



کەسانە دەدەنو نانیان بۆ دروست دەکەنو لەکاتی دیاریکراودا دەرمانەکانیان دەدەنێ، پێداویستی تری رۆژانەیان بۆجێبەجێ دەکەن، لەکاتێکدا کە کەسوکاری پەککەوتوەکە لەماڵەوە نینو بەکاری رۆژانەی خۆیانەوە مەشغوڵن.

یەکێك لە ناسنامەکانی سیستمی دیموکراتی بریتییە لەودەستکەوتانەی کە بۆ کەسو گروپە لاوازەکانی کۆمەڵ ئەنجام دەدرێت بۆ (نموونە بۆ منداڵو ئافرەتو کەسانی کەمئەندامو پیرو پەککەوتەو نەخۆشی جەستەییو دەرونی) ، بەتایبەت منداڵ چونکە ئەمانە گەورەترین سەروەتو سامانی داهاتووی کۆمەڵن.

## بەخێوکردنی منداڵ

منداڵ هەر لەرۆژی لەدایکبوونیەوە تا ئەو رۆژەی گەورە دەبێت چاوی لەدەستی بەخێوکەرو دەوروبەرەکانیەتی. منداڵ پێویستی بەوە هەیە کە بپارێزرێتو پەیوەندی راستو دروستی لەگەڵ بەخێوکەرەکانیدا هەبێت. ئەو توێژینەوەو زانیارییانەی کە سەبارەت بە منداڵن سەلماندوویانە کە منداڵ بێ دەسەڵات نییەو ئەتوانێت هەر لەرۆژی لەدایکبوونییەوە، پەیوەندی سۆسیال لەگەڵ دەوروبەرەکەیدا دروست بکات. منداڵێك کە لەدایك دەبێت خودی خۆی هەیە هەرچەندە لەسەرەتادا خۆی لەدەوروبەر جیاناکاتەوە. هەر منداڵەکە لەسکی دایکیەوە، دامودەستگای هەستکردنی تیا دروستبووەو هەست بەزۆر شت دەکات، بۆ نموونە کاتێك دایکی خەمبارە یان توورەیە، هەروەها ئەتوانێ دەنگی دەوروبەر بناسێتەوە.

ئەو باوكو دایکانەی کە خۆیان ئامادەکردووەو ئەتوانن خۆیان لەگەڵ پێداویستی منداڵەکەیاندا بگونجێنن، ئەم خۆ گونجاندنە گرنگیەکی بێ سنوور لەگەشەکردنی کەسایەتی منالەکەدا هەیە.

ئەگەر منداڵێ مۆڵەتی ئەوەی پێنەدرێت کە وەك خۆی ئەیەوێت هەستی دەربرێتو بەپێچەوانەوە رێگای لێ بگیرێت لەبەرئەوەی دایكو باوکەکە پێی ئیزعاج ئەبن، بۆ نموونە بەگریانو رق لێهاتنەوەو تەحەمول نەکردنی دەربرینی

هەستەکان، ئەم منداڵانە کە گەورە ئەبن ئیحتمالی زۆری هەیە کە لەرووی دەرونییەوە ناساغ بن، کتوپڕ تووڕە دەبنو دۆو دوشاو لەسەر شتێکی سادە تێکەڵ دەکەن، یاخود حەز بە تەنهاییو گۆشەگیری دەکەن. چونکە ئەو هەستە پێچ خوراوانەی کە وەختی خۆی لەناخی منداڵەکاندا خۆی حەشارداوە، لەگەورەییەدا ئەبێتە مۆتەکەو ئەنیشێتە گیانی. منالێك لەبەر ترسو چاوسورکردنەوەو لێدان ڕێگای لێبگیرێت کە تەعبیر لەهەستی نەکات ئەوا تازە کار لەکار ترازاوە. زۆربەی جار پێویست ناکات توندوتیژی ئاراستەی منداڵەکە بکرێت، منداڵەکە خۆی ئەزانێو فێربووە کە باوكو دایکی چییان ئەوێت منداڵەکەش بەو جۆرە دەجولێتەوەو بەقسەیان دەکات. . زۆربەی منداڵ کە پێیان دەوترێت عەجولو هارو لاسار ئەگەر لەنزیکەوە بۆیان بڕوانن منداڵی زیرەکنو پێداویستی مەشغولکردنیان بەچالاکی ژیانەوە لەمنداڵی ئاسایی زیاترە. عەجولی کردنی منداڵەکان جۆرێکە لەناڕەزایی دەربڕین بەرامبەر بەخێوکەرەکەی بەڵام زۆربەی جار بەداخەوە نایبینێ، لەوەش خراپتر بەلێدانو چاوسورکردنەوە مامەڵەی لەگەڵ دەکرێ.

زۆربەی منداڵ کە ناکۆکی دەکەوێتە نێو خێزانەکەیانەوە خۆیان بە تاوانبار دادەنێن، کاتێکیش کە بەکاردێن لەلایەن باوكو دایکیانەوە سەریان لێ دەشێوێتو نازانن روو لەکامیان بکەن، چونکە لەزۆربەی حاڵەتدا باوكو دایکیان وەك یەك خۆش دەوێت، کە لای دایکەکەیانن لایەنی ئەو دەگرنو کە لای باوکیانن لایەنی ئەو دەگرن.

گرنگترین شت کەدەور ئەبینێ لە گەشەکردنی منداڵدا بێجگە لەخۆشەویستی بێ مەرج لەلایەن بەخێوکەرەکانیانەوە ئەوەیە بڕوایان پیانبێتو بەهەموو نوقسانیەکانیانەوەو ئیعترافیان پێ بکەن.

لێرانەدا دەبێت ئەوە روونبکرێتەوە کە خۆشەویستی بۆ منداڵ مانای بەرەڵایی نییە، بە پێچەوانەوە ئەبێت دایكو باوکەکە وەستا بن لە سنووردانان، هەرجارێکیش



کە منداڵەکە لەسنووری خۆی دەرچوو بیهێننەوە شوێنی خۆی بەڵام بە لێدانو تۆقاندن نا.

هەستکردنی منداڵ بەبوونی خۆیو ناسینی دەوروبەرەکەی لەسەردەمی منداڵیدا داهاتوویەکی سەرکەوتوو لەمنداڵەکەدا دروست دەکا.

منالٌ بەر زیانێکی گەورە دەکەوێت کاتێك بە بەردەوامی لەکاتی منداڵیدا پێداویستیەکانی پشتگوێ بخرێت . ناتوانرێت جۆری خێزان بەخراپ یان بەباش دابەش بکرێت. خێزانێك کە بەلێدانو ترس منداڵەکانی بەخێوکات لەوانەیە هەمان زیان بگەیەنێت بەمنداڵەکەی ئەگەر بەراوردی کەین لەگەڵ خێزانێکی تردا، کە لەمنداڵەکانی نادا، بەڵام سنوور بۆ منداڵەکانی دانانێ یان لەگەڵ ئەو خێزانانەی کە منداڵەکەیان وا توند دەبەستنەوە بەخۆیانەوە، کە بواری ئازادییان لێبڕیون.

منداڵ رەفتارو هەڵسوکەوتی بەخێوکەرەکانی بەلایەوە زۆر گرنگە. ئەبێت رەفتارو هەڵسوکەوتیان وەك یەك وابێت، بەڵام زۆرجار ئامۆژگاری منداڵەکان دەکەین، بەڵام خۆمان بە پێچەوانەوەی ئاموژگارییەکانەوە رەفتار دەکەین.

"فرانس کافکا"ی رۆماننووس لە نامەکەی دا بۆ دایکی سەبارەت بە باوکیو هۆی رەشبینیەکەی نووسیبووی: " لێم دەپرسی بۆ وا رەشبینبوومو خۆشی لە ژیاندا نابینم. بەبیرمە کاتێك کە منداڵ بووم شەوێکیان ئەگریام باوکم لە خەو هەڵسان، بەتوڕەییەوە پێی وتم بۆ دەگری، منیش ووتم تینومە، دایکم پەرداخێ ئاوی هێنا. زۆری نەبرد دەستم کردەوە بە گریان، باوکم لەخەو هەڵسایەوە، ئەمجارە بەتوڕەییەوە، قیژاندی بەسەرمدا ئەگەر بێدەنگ نەبیت ئەوا ئەتخەمە باڵکۆنەکەوە. منیش بێ دەنگ نەبووم تەنها لەبەر ئەوەی کە خودی خۆم بناسێنمو لەهەمان کات باوکم ئیزعاج کەم. باوکم هەڵساو منی هەڵگرتو فرێی دامە باڵکۆنەکەوە. تۆش دایە لەبەر خۆت هیچ ناڕەزاییەکت پیشان نەدا. تاریکی تەنهایی ئەو شەوە بوو ژیانی منی پێ تەنرا. من هەموو جارێك خۆم بە بچکۆلەیی دەبینی کە باوکم چۆن

خۆی سەرکەوتوویی خۆی باس دەکردو ئێمەشی بە بوودەڵەو ژێرکەوتوو دائەنا . ڕۆژ نەبوو کە باوکم ئامۆژگاریمان نەکات کەچی خۆی بەپێچەوانەی ئاموژگارییەکانیەوە رەفتاری ئەکرد. پێی دەوتین ئەبێت نینۆکمان بکەین کەچی نینۆکەکانی خۆی درێژو لە بنیدا چڵکی دونیای تیا بوو. پێی ئەوتین کە نابێت پێوەندیی سێکسی هەبێت کەچی خۆیمان ئەبینی رۆژانە کە لەگەڵ ئافرەتی جیا جیادا پێوەندیی سێکسی هەبوو! "

زۆربەی جار بەخێوکەرەکان ئەوانە نین کە دەروون نەخۆش بن، یان مەبەستیان ئازاردانی منداڵەکانیان بێت، بەڵکو زۆربەیان تواناو شارەزاییان لەئامادەکردنی پێداویستی منداڵ نییە. هەروەها ناتوانن تێ بگەن لەو سیگناڵانەی (ئاماژە) کە منداڵەکان بۆیان دەنێرن. وەکو چۆن خۆیان بەخێوکراون وا ئەمانیش منداڵەکانیان بەهەمان جۆر بەخێودەکەن.

یەکێك لەزاناکانی دەروونی لەو بڕوایەدا بوو کە بتوانی سەد منداڵ بەخێوبکاتو سەد کەسی جیاوازیان لێ دروست کات. لە پارێزەرو دکتۆرەوە بگرە تا پیاوکوژو دز.

بەکورتییەکەی منداڵ لەسەرەتاوە وەك کەمئەندام لاوازە، بۆ ئەوەی پێداویستیەکانی ژیانی لەرووی دەروونیو فیزیکیەوە دابین بکرێت، چاوی لە دەستی بەخێوکەرەکەیەتی! ئەو بەخێوکەرانەی کە ئەرکی خۆیان لە بەخێوکردنی منداڵەکانیان دا بەجێهێنابێ ئەوا کارەکانیان بە جۆرێکی پۆزەتیف لە ژیانی منداڵەکاندا رەنگدەداتەوە. سیستمی خێزانو دەوروبەرەکەی دەورێکی کاریگەری لەسەر گەشەکردنی منداڵ لەئێستاو داهاتوی دا هەیە.

## هونەری بەڕێوەبردن

سیاسەت خۆی لەخۆی دا هونەری ئیدارەکردنو چۆنیەتی بەڕێوەبردنی کاروباری خەڵکە. لە وڵاتی ڕۆژهەڵات دا ماوەی سەدەیەك دەبێت تەنها حیزبی دیکتاتۆر



خاوەنی دەسەڵاتی سیاسیو داراییو ئیعلامیە، کەچی بە پێچەوانەوە لەوڵاتە دیموکراتیەکاندا کۆمەڵێك حیزب نوێنەرایەتی کۆمەڵ دەکەن بۆ ئەوەی کاروباری کۆمەڵەکە بەڕێوەبەرن. حیزبێك نییە ئەو توانای داراییەی هەبێت کە رۆژنامەیەکی رۆژانە دەرکات، یا خاوەنی ئێستگەی تەلفزیۆنێك بێت بەمەرجێك لەسەر دارایی حیزبە سیاسیەکە خۆی بێت.

جیاوازی نێوان سیستمە سیاسیو کۆمەڵایەتییەکانی دونیا لەجۆری ڕێکخستنی دامودەزگاکانی کۆمەڵکاگادایە کە هەر یەکەیان بەجۆریك رێکخراوە. جیاوازی نێوان رێکخستنەکەیان لەجێبەجێکردنی ئەرکی سەرشانیاندایە بەرامبەر بە هاووڵاتیان.

دەبێت کەسە ئیداریو سیاسیەکان لەهەموو کەموکوڕیەك بەرپرسیاربن، لەهەموو غەڵەتێکیش یان زیادرۆشتنێك دەبێت پرسینەوەی یاسایی خۆی هەبێت. کەس بۆی نەلوێت بچێتە سەرووی یاساوە. بۆنموونە جارێکیان بە هۆی کامێرای شاراوە ٢٤ لێپرسراوی سیاسی سویدی کەشف کران. کاتێك کە کامیرای شاراوە پرسیاری سەبارەت بەبیانی(پەنا هەندە) لەو سیاسیانە دەکرد، ئەمان زۆر بەسووکیو نەگەتیف باسی رۆڵی بیانییان دەکرد لەسویدا، بەڵام هەر هەمان ئەم سیاسیانە زۆر پۆزیتیڤ بەشانو باڵی بیانیدا ئەهاتن. کاتێك کە بەراستەوخۆ تەلەفزیۆن پەیوەندی لەگەڵدا دەکردن. . ئەم ٢٤ کەسە، کەلێپرسراوی سیاسی بەرز بوون لە شارەکانی سوید بێجگە لەحەیاچوون، لەکارە سیاسیەکانیانیشیان دەرکران. لەلای ئێمە هەندێ کەسانی سیاسی لەکوردستان هەن کە (. . .) کەشف کراوە، کە پەیوەندیان بەرژێمی بەعسەوە هەبووە، کەچی تا ڕۆژی ئەمڕۆش ئەمانە دەوری باڵایان لەهەردوو ئیدارەکەی کوردستاندا هەیە! گرنگی هەر لە وەدا نییە، کە خەڵکی ئاسایی پەیڕەوی یاسا بکات، بەڵکو نوێنەرە سیاسییەکانیان ئەبێت نموونەیی بن.

له سیستمی دیموکراتی پێداویستەکانی کۆمەڵو ئەندامەکانی بەجۆرێك دابین کراوە کە لەگەڵ یاسا بنچینەییەکانی کۆمەڵ بگونجێن. ئەمەش خۆی لەخۆی دا ئەو دەسکەوتانەیە کە کۆمەڵە دیموکراتیەکە بەتێپەرینی رۆژگار پێی گەیشتووە. بۆ نموونە هەموو ئەندامێکی وەك یەك سەیر دەکرێت لەروی یاساوەو یەك نرخیان هەبێتو هەریەکەیشیان خۆی لەخۆی دا بێ وێنە بێت. بە بێ هیچ جیاوازیەك بۆ نموونە لەروی ئاینیو سیاسی یاخود رەگەزی هەریەکەیان لە نێوکۆمەڵەکەدا هەلی بۆ رەخسابێت کە خۆی بریار لەسەر چارەنووسی خۆی بدات، کەسەکە بتوانێ داهاتوویەکی گەش بۆخۆی دروست بکات کە لەسەر بناغەی رێزلێنان لەمافی ئازادی کەسانی ترو گەشەپێدانی توانای کەسایەتی خۆی.

### بەشکردنی شارەوانی بەناوچەوە

یەکێك لەسیماکانی تری دیموکراتی دابەشبوونی دەسەڵاتی ناوەندییە، بەسەر شارەکانداو باجدانی شارەوانیو ناوچەییو دەوڵەتییە. بەهۆی سیستمی باجدانەوە هاووڵاتیان دەکەونە ئیسراحەتەوە، ئەهلی شار پێویست ناکات دەست لە شارەوانی پان کەنەوەو چاوەروانی ئەوە بکەن کە بەڵکو ئەرکی سەرشانیان جێبەجێ بکەن، هەرکەسێ کە ئیش بکات یا خاوەنی کارگەی تایبەتی بێت دەبێت لەمووچەکەی یا داهاتی ساڵانەکەی رێژەیەك بدات بەفەرمانگەی باج، (١/٣)لەسێ یەك بەش یان زیاتر لەداهاتەکە بەئۆتۆماتیکی دەبرێتو دەروات بۆفەرمانگەی باج. هەتا کەسەکە داهاتەکەی زیاتر بێت، باجی زیاتر لێ دەسێنرێت. تەنها لەرێگای سیستمی باجدانەوە شارەوانیی ئەو ئیمکانەتە تەواوەی دەبێت کە وەك پێویست ئەرکی سەرشانی جێبەجێ بکات. ئەو خزمەتە کۆمەڵایەتیانەی کە پێشکەش دەکرێت لەو باجانەوە هاتووە کە هاووڵاتیان مانگانە بە زۆرەکی دەیدەن بۆنموونە بەشارەوانی. بەمانایەکی تر خزمەتەکانی شارەوانی عەرەقی ناوچاوانی هاووڵاتیان خۆیانە بۆیە، بۆ هەموو کەموکورییەك دەست دەکرێت بەچاوی لێپسراوانی شارەوانی دا. هەموو



شارەوانییەك لەزۆر زوەوە وەکو دەوڵەتێکی بچکۆلانەی سەربەخۆیە لەزۆر رووەوە. زۆربەی زۆری کاروباری رۆژانەی هاووڵاتیان جێبەجێ دەکاتو دەوڵەتی ناوەندی بۆی نییە دەست لەکاری شارەوانی وەربدات.

هەموو شارەوانییەك خەستەخانەیەکی بچووك یا زیاتری دەبێ تیادابێتو هەموو ناوچەیەکیش کە لەچەند شارەوانییەك پێکهاتووە، خەستەخانەیەکی گەورەی پێویستە کە ئەگەری چارەسەرکردنی نەخۆشیە جۆراو جۆرەکانو توانای هەموو جۆرە عەمەلیاتکردنی تیابێت. بوونی گەرەنتی (زەمانی) نەخۆشی ئەرکێکی هەرە گرنگی دەسەڵاتی سیاسییە، کە نەخۆش دەکەوێت دەبێت تیمارخانەیەك هەبێت کە بتوانێ روی تێ بکەیتو لەوێش چاکترین خزمەت بکرێت.

زۆربەی هاووڵاتیانی وڵاتە ئەوروپاییەکان بە چاوێکی پۆزیتیڤ بۆ سیستمی باج دان دەروانن، هەرچەندە زۆربەشیان سودی تایبەتی وەرناگرن لەو باجە زیادەی کە ئەمان دەیدەن بۆ کارە هەرەوەزییەکان. "سیستمی باجدانی تەنها کەس نرخاندنی مرۆڤایەتی گشت هاووڵاتیانن. نەبوونی سیستمی باجدان پێشێلکردنی مافی تەنها کەسە، بەتایبەت گروپە لاوازەکانی کۆمەڵ، وەکو ئافرەتو منداڵو پەککەوتە. تەنها هاووڵاتیان ئەتوانن لەرێگای باج دانەوە ئەرکی سەرشانیان بەرامبەر ئەو کۆمەڵەی کە تێیدا دەژین بەجێ بهێنن، لەهەمان کات دا دابینی مافەکانی خۆیشیان وەکو تەنهاکەس لە ناو کۆمەڵەکەدا بکرێت. "

لەسیستمی دیموکراتیدا فەرمانگەکان خۆیان ئۆتۆنۆمیان لەکاربەرێوەبردن دا هەیە، ئیتر پێویست ناکات خەڵکی بۆ جێبەجێکردنی ئیشو کاریان رۆژانە رووبکەنە فەرمانگەکانی سەروتریانەوە یاخود روبکەنە پایتەختی وڵاتەکە. یاسایەکی رێپیشاندەر لەهەموو داموو دەستگایەکدا هەیە کە چوارچێوەیەکی بۆ هەموو ئیشکەرێك داناوە لە جێبەجی کردنی کاروباریدا. بۆ نموونە زۆر کاروبار ئاسانکراوە پاسپۆرتێك لای فەرمانگەی پۆلیسە لەماوەی پێنج دەقیقەدا دەردێ.

ئەگەر فەرمانبەرەکەش هەڵەیەکی کرد یان لایدا لەو یاسایانەی سەر بە شوێنی کارەکەیەتی ئەوا دەستگای یاسایی تر هەیە، کە لە هەڵەکەی دەپرسێتەوە. هەموو فەرمانبەرێکی بچووك کە ئەرکی ڕۆژانەی خۆی ئەنجام ئەدا مافی پارێزراوی هەیەو بەبێ ئەوەی کە ترسی لێ پرسینەوەی هەبێت لەبەرێوەبەری فەرمانگە یاخود لەو گەورەتر. کاتێك ئەمانە کاروباری سەرشانیان بەجوانی ئەنجام ئەدەن کەسێك نییە بلێ: بەری چاوتان کلی پێوەیە وەکو بلێی: "پارەی داگەو قنج هەڵدەپەڕێ".

هەموو فەرمانگە ناوەندییەکان چاکتروایە کۆنەبنەوە لەپایتەختی ولاتەکە، هەرکەسێکیش کە ئیشێکی هەبێت بەوفەرمانگانە نابێت پێویست بەوە بکات کە رووبکاتە پایتەختی ولاتەکە.

پێویستە دامودەستگا ناوچەییەکان دەسەلاتی ئەوەیان هەبێت کە کارەکانی خەڵکی لەجێگای خۆیان بەڕێوەبەرن. هەر لەبەر ئەم هۆیەشە کە زۆربەی فەرمانگە گرنگەکان لەولاتە دیموکراتییەکاندا بەجۆرێکی عادیلانە بەسەر شارەکاندا دابەشکراون. ئەمەش خێرو بەرەکەت بۆ شارەکان لەگەڵ خۆی دێنێ، چونکە لەڕێگایەوە سەدان ئیشی زیادە دێتە ناو شارەکانەوە. کۆمەڵێ خەڵکی دانیشتوانی شارەکەش دەرفەتی ئەوەی بۆ دروست دەبێت کە خۆیانو خێزانەکانیان بەهۆی بوونی فەرمانگە بەخێو دەکەن. هەروەها سەبارەت بەخوێندنی بالا پێویستە ئەویش بەجۆرێك دابەش کرابێت کە شارەکان لێی بێ بەش نەبن.

هیچ شارەوانییەك نییە لەجیهاندا بەتایبەت لەشارە گەورەکاندا بتوانێ کارە هەرەوەزییەکان ئەنجام بدا بۆ هاوولاتیان ئەگەر بێتو شارەوانییەکە دابەش نەبووبێت بەچەند بەشێکەوە. بۆ نموونە شارێکی ۱۲۰۰۰۰ هەزار کەسی وەکو ڤیستەڕۆس دابەش کراوە بە ۷ بەشەوە. ستۆکهۆڵم کە شارێکی گەورەترە دابەشکراوە بە ۱۸ بەشەوە. هەر بەشەیان وەکو حکومەتێکی خۆجێی بچکۆلانە وایە بۆ هاوولاتیان. ئەوەی ئەوان لەژیانی ڕۆژانەیاندا پێویستیان بێت، لەخزمەتە کۆمەلایەتیەکانەوە



بگرە تا قوتابخانە بۆیان ئامادەکراوە، ئیتر کەس پێویستی بەوە نییە روبکاتە ناوەندی شارەوانی شارەکە.

پلاندانان، هەڵسەنگاندنو توێژینەوە ڕۆڵێکی گرنگی لەسیستمی دیموکراتی دا هەیە، هەموو، فەرمانگەیەك، فەرمانگەیەکیتر هەیە بەڕاست سەریەوە کە دانیشتوان ئەتوانن هانایان بۆ بەرن بۆ نموونە لەکاتی نارەزایی دەربڕیندا. بۆ ئەوەی لەماڵەکەی خۆت دا ژورێك دروست بکەی یاخود گۆڕانسازییەکی تر لەحەوشەی ماڵەکەتدا بکەی، ناتوانی خۆبەخۆ بیکەی ئەبێت ئیجازەی لەشارەوانییەکەوە بۆ وەربگیرێت.

بۆ ئەوەی گەڕەکێکی نوێ لەشارێکدا دروست بکرێت. پێشتر شارەوانیەکە نەخشەیەکی تەواوی بۆ کێشاوە کە تێیدا هەموو پێداویستیەکانی گەڕەکی بۆ زامن کردوە: ژێرزەمینو پارکی منداڵانو ڕێگاو بانو ڕێگای پاسکیلو ئاوو کارەباو دارو درەختو گونجو زبڵ بردن. . .گەڕەك هەرئەوە نییە خۆبەخۆ دروست بکرێت بەڵکو دەبێت هەموو ئەو مەرجانەی تیا بێت کە لەداهاتودا دەبێتە هۆی ئیسراحەتی دانیشتوانی گەڕەگ.

## چۆن بمانەوێ وا رەفتار دەکەین

لەسیستیمێکی تاکەکەسو نادیموکراتیدا رێکخستنو ئیدارەیەکی تر باوە، سەرکردەیەك، دەستەیەك، دەستەبژێر(نوخبە)، خێڵێك، یاخود پارتێکی یەك سەرکردە دەستی بەسەر دەسەلاتی سیاسیو مادی ناو کۆمەڵگاکەدا گرتووەو بیانەوێ هەلومەرجی ژیان لەنێو خۆیانداو لایەنگرەکانیاندا دابەش دەکەن. بەشی زۆری خەڵکی بۆ ئەوەی بژی ناچارە خۆی بگونجێنێو ببێتە ئەندام، بۆئەوەی ئەمانیش ببنە بەشێك لەدەسەلاتی تەنها حیزبو تاقمو کەسایەتیو بکەونە بەرخێرو بەرەکەتی کۆمەڵەکە.

ئاسانترین شێوە بۆگەیشتن بەپلەوپایە لەڕێگای حزبایەتەوەیە، هەندێ خەڵك کە فاشلبوون لەژیانیاندا لەڕێگەی حزبایەتیەوە فرسەتیان بۆ هەڵکەوتووە وەکو پردێك

بیانگەیەنێتە پلەوپایەی بەرز.

هەزاران پاسەوانی نەبینراو دانراون لە بەردەرگای دامودەزگاکانی کۆمەڵدا، هەر هاووڵاتیەکیش بیەوێت بەنێو دەرگاکاندا تێپەربێت، ئەبێت ناسنامەی تایبەتی پێ بێت ئەگینا ڕێگای پێنادرێت تام و بۆنی بەرووبوومی کۆمەڵگا بکات. بۆیە زۆربەی خەڵك بەرەزامەندی یاخود بەناچاریەوە رووئەکاتە ئەولایەنە سیاسیانەی کە پلەو پایەو سەروەت و سامان بێ مەرج نادەن بە ئەندامەکانیان.

تاکە حیزبی سیاسی پێویستی بەوەیە کە خەڵکی لەدەوری کۆبێتەوەو زۆربەی خەڵکیش بۆ ئەوەی بژی ناچارە روبکاتە ئەو جۆرە حیزبانە بۆئەوەی داهاتوویەکی گەش و ئاسوودە بۆ خۆیان و خێزانیان دابین بکەن.

تەنها حیزبێکی سیاسی کە لەناو کۆمەڵەکەدا دروست بووەو ناتوانێ بمێنێتەوە ئەگەر بە بەردەوامی خەڵکی لەدەور کۆنەبێتەوە، زۆربەی خەڵکیش لەدەوری پارتیەکە کۆنابێتەوە ئەگەر بەشداربوونیان سوودێکی کاتی یا ئایندەیی تیا نەبێت. لەم سیستێمە سیاسیانەدا دەوری سەرکردەو ڕەنگدانەوەی دەسەڵاتی تەنها حیزب کاریگەرە لەسەر ئەندامەکانیان و چۆنێتی هەڵسوکەوتکردنی هاووڵاتیان.

خواستی تەنها حیزب دەور ئەبینێ لەدابەشبوونی سامان و دەستکەوتەکان بەسەر میللەتەکەدا. جەماوەریش بۆئەوەی پێداویستیەکانی ڕۆژانەیان دابین بکرێت و کێشەکانی ژیانیان چارەسەر بکەن ناچارن لەسیستێمەکە نزیکبنەوە، سەری بۆ دانەوێنن و بەمەمنونیشەوە ببنە ئەندام بەتایبەت لەو کۆمەڵگایانەی کە تەنها کەس، یاخود تەنها حزب، یاخود دەستەیەك حوکمڕانی دەکات.

ئەگەر وردبینەوە لەوڵاتەکانی ڕۆژهەڵات ئەبینین بەشی هەرە زۆری میللەتەکە ئەندام و لایەنگری پارتێکی سیاسین کە ئامانجە تایبەتیەکانیان دێنێتە دی. ژمارەی ئەندامانی پارتە سیاسیەکە لەژمارە نایەن و سەرانسەری میللەتەکە سەری لەسیاسەت دەخورێت، ئەگەر بێتو ئەمانە بەراورد کەین لەگەڵ ئەندامانی پارتێکی



کۆمەڵگاییەکی دیموکراتیدا جیاوازی نێوانیان ئەرزو ئاسمانە. سیاسی یاخود ئەو کەسانەی وەکو ئیش کاری سیاسەت دەکەن ژمارەیان لەوڵاتەکەدا کەمن و سەرەڕای ئەوەش لەنێو خەڵکی ئەوروپادا خۆشەویست نین. بەشی هەرە زۆری خەڵکی ئەوروپا خەریکی ئیش و کاری ژیانێتی و سیاسەتکردنەکەی تەنها دەنگدانێکە کە سێ بەشی دانیشتوان چوارساڵ جارێك لەکاتی هەڵبژاردنە گشتیەکاندا دەیدا.

هەموو سیستیمێکی سیاسی کە لەسەر بناغەی تاکەکەس دامەزراوە میللەتەکەی وا باڵ کردووە کە زەحمەتە ڕێگای سەرفرازبوون بۆ خۆی بدۆزێتەوە. میللەت توانای کارکردنی نییە لەسەر خاوەن دەسەڵات، تەنانەت دەستیان پان کردۆتەوە بۆ ئەوەی پێداویستەکانی ڕۆژانەیان دابینبکرێت، دەسەڵاتی نێو سیستێمەکە بۆیە بەردەوامە چونکە بەم جۆرە کەسانە تەنراون. جەماوەر هیچ مەرجیان نییە، بەڵکو مەرجیان بەسەردا فەرزکراوەو خاوەن دەسەڵات چۆن لە قازانجی خۆی و بەرژەوەندیی پارتیەکەی بێت بەو جۆرە رەفتاریان لەگەڵ دەکات.

لەکۆمەڵگای دیموکراتی دا میللەت ئاراستەی دەسەڵاتی دیاری کردووە، بەڵام لەکۆمەڵگایەکی نادیموکراتیدا خاوەن دەسەڵات میللەتەکەی جەڕداوەو ئاراستەی بۆ دیاری کردووەو چۆن بیەوێ بەو جۆرە هەڵیان دەپەڕێنێ. لەهەمان کاتدا دەسەڵاتی نادیموکراتی ئەبێتە هۆی گەشەکردنی هەزارەها گروپ و تاقمی تایبەت کە لە بەرژەوندیان نییە نمەبای دیموکراتی هەڵکات. لە بەرژەوەندی ئەمانەدایە کە بیرکردنەوەو دەسەڵاتە زاڵەکە وەك خۆی بمێنیتەوە. بەهەزارەها فەرمانبەرو بەڕێوەبەر کە ئەمرۆ پاڵ حەجەکەیان گرتووە کۆمەڵگاکە دەدۆشن لە وڵاتە نادیموکراتییەکاندا ئەگەربێت و لەسەر بناغەی شارەزایی و لێهاتوویی بێت ئەوا زوو لەسەر کارەکانیان دەردەکرێن.

## زەبرو زەنگ و میتۆدی ترس

ترس بەشێکی هەرەگرنگی میتۆدی فێرکردنەو قەناعەتپێکردنی بیروڕای

سیاسیە لەولاتەکانی رۆژهەلاتدا. زەبروزەنگ بەکارهێنان ئامرازێکی کاریگەرە بۆ ئەوەی دەسەلاتی ئەکتواری بەسەر هاوولاتیان دا فەرزبکات. زەقترین نموونە بەکارهێنانی ئەو توندوتیژییە کە حکومەتە ناوەندییەکانی یەك بەدوای یەکی عیراق لە ١٩٦١ تاوەکو ١٩٩١ دژی میللەتی کورد بەکاریانهێناوە.

دەسەلاتدارانی ئەکتواریتار تەنها یەك تەرازوویان هەیە، ئەویش ئەو تەرازوویەیە کە هەموو دیاردە سیاسییو کۆمەلایەتیەکانی لەسەر دەپێون بەجۆرێك کە بەقازانج بۆخۆیان بگەرێتەوە. کەسایەتی سەدام نموونەییەکی روونو ئاشکرای کەسە ئەکتواریتارەکانی ئەم سەردەمەیە. هەر بۆ ئەوەی بمێنێتەوە لەسەر حوکم هەموو تەنازولو سووکایەتییەکی قبوولکرد. چونکە پێوانەکەی ئەم تەنها ئەو دیاردانەی ئەپێوا کە بیگەیەنێتە ئەنجام، ئەویش حوکمەکەی لەدەست نەچێت.

ئەوانەی کە لەنزیکی سەدامەوە بوون زیاتر لەدوژمنەکانی موعەرەز بوون بۆ مردن. جارێکیان وەزیری تەندروستی عیراقی ریاز ئیبراهیم لەکۆبوونەوەیەکدا قسەیەکی کردووە کە دابووی لەدلی سەدام. سەدام بانگی ریازی کردبوو کە لەگەلیدا بڕوا بۆ ژوورێکی تر. ریاز فریای دانیشتن نەکەوتبوو، سەدام ساردی کردبوەوە، پاشان سەدام چۆتەوە بۆ کۆبوونەکەی وەکو ئەوەی نەبای بینی بێت نە باران.

کاتێك کە سەدام حوسین بەزۆر ئەحمەد حەسەن بەکری لابردو خۆی چووە شوێنەکەی. ئەو خۆی ئامادە کردبوو بۆ ئەوەی رکەبەرەکانی لەناو بەری. عەبدولحوسەین مەشهەدیو خێزانو مندالەکانی گرتو هەرەشەی لێ کرد ئەگەر ئەو ئیعتراف نەکات ئەوا ئیغتسابی خێزانو مندالەکانی یەك یەك لە بەرچاوی مەشهەدی دەکەنو دوایش هەموویان یەك لە دوای یەك دەکوژن. مەشادی لەترساندا رازی بوو کە سەدام چۆنی ویست ئەو وابکات.

لە کۆنفرانسی بەعس کە لەقاعەی خلوودا لەبەغدا گیرا، گشت ئەندامە



بەرزەکانی بەعس تیا بەشداربوون، لەوان وابوو کە سەرۆك کۆماری نوێ شاباشیان بەسەردا بلاودەکاتەوە. بەلام کاتێك سەدام باسی موئامەرەیەکی گەورەی کرد کە کراوەتە سەری، یەکسەر بەشدارانی کۆنفرانسەکە تێگەشتن کە ئیتر بەشێکیان بەساغی ناگەرێنەوە مالەوە. یەك حالەتی هیستیریا بێ سنوور توشی گشت بەشداربووەکان هات چونکە کەسیان نەیان ئەزانی کێ لای سەدام تاوانبارەو سەدامیش بەجۆرێکی نەخشە کێشراو ئەیویست ئەو هیستیریایە دروست بکات. بەشداربووەکان لەو بڕوایەدا نەبوون کە هیچ موئامەرەیەك دژی سەدام لەئارادا بووە بۆیە هەموویان خۆلی مردوویان لێنشتبوو، ترسی ئەوەیان بوو کە ناویان هەبێت لەلیستەی سەدام دا. ماوەی سەعاتێك کەمتر ٥٥ بەعسی گەورەیان لەقاعەکە بەرەو مردن رەوانە کرد.

بۆ یەکەمین جار سەدام باسی "دیموکراتی کوشتنی" کرد. ئەو دیموکراتیەی کە سەدام مەبەستی بووە بریتی بووە لەوەی کە تۆمەتبارەکان لەلایەن برادەرەکانیانەوە گوللەباران بکرێن. بەدیموکراتی دەبێت هەریەکێك تۆمەتبارێ هەلبژێرێتو بیکوژێ. لەفیلمی کوشتنی دیموکراتیدا دەردەکەوێت کە هەندێ لە بەعسیە گەورەکان بۆ یەکەمین جار خەلکیان بە دەستی خۆیان کوشتبوو بۆیە کوشتنی ٥٥ تۆمەتبارەکە وەختێکی زیاد لەحەدی خایاندووە. مەبەستی سەدام لەکوشتنی دیموکراتی ئەوە بووە کە دوژمنەکانی هەتا مردنەکەشیان بەئازار کۆتایی بێتو لەهەمان کاتدا بەشداربووەکان هەروەك سەدام خۆی دەستیان بەخوێنی هاوەلەکانیان سوور بێت.

گومان لەوەدا نییە کە سەدامو دەستو پێوەنەکەی هەر لەزووەوە مافی مرۆڤایەتیان دۆڕاندووە، لەناوچوونیان بە هەرشێوەیەك بێت بەخزمەتی ئینسانیو دیموکراتی بۆ مرۆڤایەتی دەگەڕێتەوە. بەلای کەمەوە نیوملیۆن نەفەری تر هەن کە سەدامی بچکۆلانە بوونو بەشدار بوون لەکوشتنو ئازاردانی هاوولاتیاندا. رژێمکی

وەکو سەدامیش ئەگەر وڵاتێکی وەکو ئەمەریکا بەزەبرو زەنگ لای نەبردایە ئەبوایە مستەفای کوڕەزاشی لەداهاتودا وەکو باپیری سەرۆکی رەهای عیراق بوایە.

ئاشکرایە بەکارهێنانی زەبروزەنگ بۆ رزگارکردنی مرۆڤایەتی لەم دڕندانە بەلای کەمەوە رەوایەو بەسوود بۆ مرۆڤایەتی دەگەڕێتەوە. بەڵام لەهەمانکاتدا دەبێت ئەوەش بزانرێت بەکارهێنانی زەبروزەنگ لەچارەسەرکردنی کێشە کۆمەڵایەتیو ئینسانیەکاندا باسێکی ترە لەئاستی تەنها کەسدا. خۆی ئەنجامی سرووشتی بەکارهێنانی زەبروزەنگو سەرکوتکردنو هێنانەدی زوڵمو زۆرو چەوساندنەوەیە. دەبێت ئەوە باش بزانرێت کە ئازادی تەنهاکەسو ریزلێنان لەمافی مرۆڤایەتی بە بەکارهێنانی زەبروزەنگ هەرگیز نایەتەکایەوە.

جۆری پەروەردەکردنی ئەکتواری کە باوە لەسیستێمە نادیموکراتیەکاندا لەسەر بنچینەی ترسو سزادان درووست بووە. فاکتۆری ترس کەسەکە ناچار دەکات کە رەفتار بکات بەو جۆرەی کە لێی داوا کراوە. بۆ نموونە لەرێگای بەکارهێنانی ترسو چاوسورکردنەوەشەوە دیاردە پۆزێتیڤەکانمان فێردەکەن. بۆ باوکی نوێژ دەکاو رۆژو دەگرێ نەك بەقەناعەت. لەترساندا خراپی یا غەدر لەیەکێکی تر ناکات، بۆ ئەوەی قسەی نەیەتەسەر بێ دڵی خۆی زۆر دەکات. بۆ ئەوەی حەیای نەچێت یا نەخرێتە بەندیخانە دزی ئاشکرا ناکات، بەڵام ئەگەر بۆی بلوێتو کەس پێی نەزانێ ئەوا شارێکت لەتاریکیدا بۆ دەگوێزێتەوە. . .

لەپەروەردەکردنی دیموکراتی دا، کەسەکە ئەتوانێ بەپێ‌ی ئەو شارەزاییەی ژیانو فێربوونە دیموکراتیەی چاكو خراپ دیاردەکان لەیەکتری جیابکاتەوە. هێزێکی ترس لەدەرەوەی خۆیان نەهاتووە ئەم بەهایانە بەسەریاندا فەرزکات، بەڵکو لەسەرخۆو وردە وردە رەگی لەهەستیاندا داکوتاوەو گەشەی کردووەو بووە بە بەشێك لەڕوانینی رۆژانەو بیرکردنەوەیان.

### بەراوردکردن لەگەڵ ئەوروپادا

زۆرجار خەڵکی ئەڵێن ئێمەو ئەوروپا نابین بەیەكو نابێت لەگەڵ یەکتری دا



بەراورد بکرێن. دەسەڵاتدارانی سیستێمە نادیموکراتیەکانی وڵاتانی رۆژهەڵات لە بەرژەوەندیان نییە کە گۆڕانی دیموکراتی لەوڵاتەکانیان دا هەڵبکات. بەدڵنیاییەوە بیری دیموکراتی لەبەرژەوەندی هەمووکەس نییە بەتایبەتی ئەوانەی کە ئەمڕۆ دەسەڵاتی سیاسیان لەدەستدایە. زۆربەی خەڵکیش کە بەو جۆرە ژیانە راهاتوون، زۆر زەحمەتە بتوانن بینینێکی نوێ وەربگرن بۆیە لەسەرانسەری رۆژهەڵاتی ناوەڕاست دا دابو نەریتی دیموکراتی زەحمەتە جێگای خۆی بکاتەوە.

هەر لەئەوروپا بوون مەرج نییە بۆ ئەوەی بەجۆرێکی ئۆتۆماتیکی لایەنی دیموکراتیو مافی تەنهاکەس مەزموون بێت. بۆ نموونە ئەو کووشتنو تاوانە گەورانەی کە بەرپاکراون لەلایەن سەربەکانەوە دژی میللەتە جیاکانی تر، کەم تا زۆر خۆی ئەدا لەشانی ئەو تاوانانەی کە سەدام دژی میللەتی کورد کردوونی.

ئەوروپا هەرهەمووی وەکو یەك گەشەی نەکردووە، زۆر وڵاتی ئەوروپی هەیە کە هەندێ جێگای لای ئێمە پێشکەوتوترەو ئاستی بژێویشیان باشترە. کابرایەکی نەخوێنەواری کوێرەدێیەکی لای خۆمان لەوانەیە زیاتر سەری دەربچێت لە ژیان لەیەکێك کە سەرانسەری ژیانی لە ئەوروپادا ژیابێت. هەر لەبەر ئەوەی ئەوروپی بێت ئیتر مانای ئەوە نییە یەکەمین نموونەی پێشکەوتنو دیموکراتی بێت.

هەرهەمان ئەوروپا بووە کە دوو جەنگی گەورەی بەخۆیەوە بینیوە. ماوەیەکی درێژ سیستمی فاشیو نازی حوکمڕانی تیا کردووە. سیستمی فاشی یۆنانی تا دوای ١٩٧٥ هەردەسەڵاتدار بوونو لەئەسپانیا هەر بەردەوام بوون لەسەر حوکم هەتا کاتێك فرانکۆ مردووە.

لەوڵاتەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا سیستیمێکی سیاسی وا هەیە کە هەزار ساڵە نەگۆڕاوەو ناوەڕۆکەکەی هەر وەك خۆی وایە: "میللەت چاوی لەدەستی حکومەتەو ئەو بەخێوی دەکات." کەی کاتی ئەوە دێت کە ئەم پەیوەندیی دەسەڵاتە قلپ بێتەوە:"دەوڵەت چاوی لە دەستی میللەت بێت ئەو بەخێوی بکات." ئەمە

جەوهەری مەسەلەکەیە نەك جیاوازییەکانی وڵاتەکانی لای ئێمە لەگەڵ وڵاتەکانی ئەوروپادا. ئایا هەوڵی جدی بۆ ئەم گۆڕانسازیە دەدرێت !!

## مافی تەنها کەس

یەکێك لەنیشانەکانی سیستمی دیموکراتی دابینکردنی ئازادی کەسایەتیە. لەسیستمی نادیموکراتیدا ئەم ئازادییە خەونە. ئەو بڕیارانەی کە پەیوەندیان بەتەنها کەسەوەیە، پێشتر کەسانی تر، خێزان، پارتی سیاسیو لایەنی تر بڕیاری لەسەر دەدەن.

بۆ ئەوەی خەڵکی خۆی خێزانی بەخێو بکات، ئەبێت ئیشێك یان دەرامەتیکی وا وەربگرێت کە لە ڕێگایەوە بتوانێ داهاتویەکی دیار بۆ خۆیو ماڵو منداڵی دیاری بکات. کاتێ نەخۆش دەکەوێت ژیانی زامن بێتو مووچەی نەخۆشی وەربگرێت. توشی ڕووداوێك بێت لەسەر کار بتوانێ تەعویزو خانەنشینی وەربگرێت. کاتێکیش کە لەکار دەرئەکرێن مافیان پارێزراو بێت ﴿مووچەی خۆیان وەربگرن﴾ تاوەکو ئیشێکی تر ئەدۆزنەوە. . دەبێت یاسای کارکردنی واهەبێت کە ڕێگا لەخاوەن کار بگرێت کە بەخواستی خۆی یاری بەچارەنووسی کرێکار بکات. کاتێك پێویستی بوو دایان بمەزرێنێ کاتێکیش ئیشی پێیان نەما لەسەرکار دەریان کات.

خانەنشینەکان مافیان پارێزراو بێت، چونکە سەرانسەری ژیانیان ئەمانە کاریان کردووەو لەپیرێتیدا ئەوخانەنشینییەی کە وەری دەگرن ئەبێت بەشیان بکات. هەروەها خانەنشینیەکەیان پەیوەندی ڕاستەوخۆی هەبێت بەگرانی نرخی شتومەکەوە. خانەنشینیەکەیان بەپێی بەرزبوونەوەی کڕینی شتومەك بۆ زیاد بکرێت.. .

مافی تەنها کەس ئەبێت لەدەربڕینی رای سیاسیو ئاینی خۆی بنوێنێت. توانای هەڵبژاردنی کارو خوێندنو دابینکردنی پێداویستییەکانی ژیان لەسەکەنەوە



بگرە تا بوونی داودەرمانو خواردنو پێویستیەکانی تر.

ئەرکی سەرشانی کۆمەڵ ئەوەیە کە بەهانای تاکەکەسەوە بێت کاتێك کە توشی کێشەیەك دەبێت کە بەدەر لەوزەی. بۆ نموونە کەسێك کە چارەی نەخۆشیەکەی تەنها لە دەرەوەی وڵات چارەسەر دەکرێت.

تەنهاکەس مافی یاسایی خۆی هەبێتو یەکێك کە تاوانێك دەکات ئەبێت بێ گوناه بۆی بڕوانرێت هەتاوەکو گوناهەکەی لەدادگا ئیسپات دەکرێت. پۆلیس نەتوانێ کەس بگرێ یاخود لەلای خۆی گلی باتەوە بە بێ ئەوەی دادگا بڕیاری پێشتر لەسەر نەدابێت. . .

ڕۆڵی تەنها کەس لەسیستمی دیموکراتیدا زۆر گەورەیەو شارەزاییو لێهاتوویی کارکردن تەنها پێوانەیە کە تەنها کەس لەڕێگایەوە بەمەکسەبی ژیانی خۆی دەگات. نەك لەبەرئەوەی لەرەگەزێکی تایبەتە، یاخود کوڕی خێزانێکی ناسراوە، یاخود ئەندامی حیزبێکی دەسەڵاتدارە. بۆ نموونە دوو کچی کورد، دیلباو ودیدی کە لەسویدا دەژین بوونەتە دوو گۆرانیبێژی جیهانی، نالین بەکسی یەکێك لەسەرکردە ناسراوەکانی سۆسیال دیموکراتی سوید. ریبوار تاهیر رۆژنامەنووسێکی رادیۆی ناسراوە، ئەڤین رۆبار ساڵی پار بەنرخترین خەڵاتی ڕۆژنامەنووسی لەسوید وەرگرتووە. گۆرانیبێژی گەنج دارین عوسمان بەئەستێرەیەکی جیهانی گەشەدار ناو دەبرێت لەلایەن رەخنەگرە سویدیەکانەو داهاتوویەکی پرشنگداری لەدونیای گۆرانیو مۆسیقای جیهانی دا دروستکردووە، لەنێو دە هەزار بەشداربووواندا دووهەمی هێناوە. موحەمەد عەلی حاجی فەرەج یەکێك بووە لەکەسایەتیە گرنگەکانی کۆمپانیای گەورەی ئێریکسون. . . هەریەکە لەم دەستکەوتانەی کە ئەم گەنجانە بەدەستیان هێناوە لەئاسمانەوە نەکەوتۆتە خوارەوە بۆیان بەڵکو ئەنجامی هەوڵو کۆششێکی یەجگار زۆر بووە.

## ئافرەتو منداڵ

بایەخدان بەمناڵو دابینکردنی پێویستیەکانیانو یەکسانی ئافرەت لەگەڵ پیاودا بڕبڕەی پشتی سیستمی دیموکراتییە. لەم سیستێمەدا دەبێت ئافرەت وەکو پیاو بەڕێوەبردنی کۆمەڵدا بەشداربێت، مافەکانی یەکسانبن، بۆ هەمان کار مووچەی مانگانەی ئافرەتەکە یەکسان بێت لەگەڵ مووچەی مانگانەی پیاوێك دا. ئافرەت دەبێت گەرەنتی تری هەبێت بۆنموونە لەکاتی دووگیانیدا لەکارەکەی دەرنەکرێت. بۆی هەبێت لەگەڵ منداڵەکەی ماوەیەك لەماڵەوە بمێنێتەوەو مووچەی مانگانەی خۆی وەك جاران وەربگرێت. . بۆی هەبێت لە مێردەکەی جیابێتەوە بەبێ ئەوەی پەنجەی شەرمی بۆ رابکێشرێت. . .

منـاڵ دروستکردن مەسئوولیەتی خێزانە بەڵام جۆری بەخێوکردنەکەی مەسئوولیەتی کۆمەڵی دیموکراتییە زەمانی پاراستنی مافەکانیان دەکات. ئەگەر بێتو نەوەکان لەگەشەکردنی ژیان بێبەریبنو جوان پەروەردە نەکرێن ئەوا بەزیانێکی گەورە بۆخۆیانو کۆمەڵ دەشکێتەوە، کۆمەڵی دیموکراتی ئەبێت تەشریعی ئەو یاسایانەی تیاکرابێت کە زەمانی بەخێوکردنی چاك بۆ منداڵان دابین دەکات، هەروەها ئەو یاسایانە لەلایەن هاووڵاتیانەوە پێڕەویش بکەن.

گشت وڵاتە نادیموکراتییەکان ژمارەی خێزانەکان ژمارەی منداڵانیان زۆرترە ئەگەر بەراوردی کەین لەگەڵ وڵاتە دیموکراتییەکاندا. زۆربەی خێزانەکان منداڵ یەك لەدوای یەك دەخەنەوە بەڵام، زۆربەی باوكو دایکان مەسئولیەتی بەخێوکردنو پەروەردە کردنی منداڵەکان بەچاکی هەڵناگرن. لە یەکێك لەوڵاتەکانی ئەفریقادا ژمارەی دانیشتوانیان لەساڵی ١٩٦٠ دا چوار ملیۆن کەس بوون. ئەو سەردەمە وەزعی ئابووری وڵاتەکە زۆر نالەبار بوو برسیەتی زۆری بۆ خەڵکی هێنابوو. وڵاتەکە بەکۆمەك کردنو سەدەقەی وڵاتە ئەورووپییەکان ئەیان توانی ژیان بەسەربەرن. ئەمڕۆ کە ژمارەی دانیشتوانی هەمان وڵات ١٨ ملیۆن کەسە، بەڵام ٢ ملیۆن



کەس زیاتر نەخۆشی ئایدزیان توش هاتووە، بەشی هەرە زۆربەیان ژنو مناڵی وردن.

گەشەکردنو پلەی ئینسانی پەیوەندی راستەوخۆی هەیە بە دەستنیشانکردنی کەموکوڕی کەسە لاوازەکانی کۆمەڵو دابینکردنی پێداویستییەکانیان. هەندێ منداڵ هەن کە تواناى زیرەکییان کەمترە یاخود لەرووی سروشتیەوە بەرکەوتوون. بۆ ئەوەی ئەمانە بگەنەوە بەمنداڵە ئاساییەکان قوتابخانەی تایبەتیان بۆ بکرێتەوەو لەلایەن کەسانی شارەزاوە دەرسبدرێن. ئەو باوكو دایکانەی کە کار دەکەنو ناتوانن لەماڵەوەبنو ئاگایان لەمنداڵەکانیان بێت ئەبێت ئەلتەرناتیڤی باخچەیان بۆ ئامادەکرابێت. بەشی هەرە زۆری ئەم ئەرکە سەربارانە لەسەر شانی تەنها کەس نییە بەڵکو ئەرکی کۆمەڵەکەیە کە ئەم جۆرە پێداویستیانە بۆ دانیشتوان ئامادە بکات.

لەبەشی یادو بیرکردنەوەدا باسی رۆڵی مێشك بەوردی کراوە، پەروەردەکردنی مناڵ زۆر سەختترە لەوەی کە ئێمە بیدەینە دەستی قەدەر، ئەگەر منداڵ وەکو پێویست گەشە نەکات ئەگەری زۆری هەیە کە ژیانی بەکارەسات کۆتایی بێت. هیچ منداڵێك عەریزەی نەداوە بە دایكو باوكی بیهێنێتە دونیاوە، ئەوان داوایان نەکردووە بۆ بەخێوکردنیان روبکەنە خوا. کاتێك کە منداڵەکان یەك لەدوای یەك دێنە دونیاوە ئەبێت ئەوەش بزانن کە پێویستە لەسەر دایكو باوکیان کە بەخێویان بکەنو خۆشەویستی بێ مەرجیان بدەنێو هەڵسوکەوت لەگەڵ منداڵەکانیانو وەکو پارچەیەك موڵکی بێ گیان نەکەن.

یەکێك لەگرفتەکانی وڵاتە ئەورپایەکان ئەوەیە کە منداڵ کەم دروست دەکەن، کاتێکیش کە بڕیاری منداڵ دروستکردن دەدەن ئەوا خێزانەکە بەتەواوەتی خۆی بۆ لەدایکبوونی منداڵەکە ئامادە کردووە. دەرهێنانی منداڵ ئاسانە بەڵام بەخێوکردنەکەی گرانە. ئەوەی شایەنی باس بێت کەمایەتیەکیش هەن لەخەڵکی

ئەوروپادا کە بەحوکمی هەندێ هۆ گوێ نادەنە منالٚ بەخێوکردنو ئەمانیش هەر دروستکردنیان لەسەرەو هەر وەکو هەندێ خێزانی لای خۆمان. . .

زۆربەی زۆری کێشە کۆمەڵایەتیو یاساییو دەروونییەکانی ئەوروپا تووشی ئەو کەسانە دەبێت کە وەختی خۆی بەمنداڵی سەربەم خێزانانە بوون. ئەو منداڵانەن کە بایەخی تەواویان لەکاتی منداڵیدا پێ نەدراوەو بێ بەشبوون لەخۆشەویستیو بایەخ پێدان، یان ئەو منداڵانەی کە لە باوكو دایکیان بەزۆر سەنراونەتەوەو لەخێزانی تردا بەخێوکراون. .

ئەو توێژینەوانەی کە سەبارەت بەمێژووی ئەم منداڵانە کراوە ئەوەی دەرخستووە کە گیروگرفتەکەیان بەپشتاو پشت بۆ ئەو منداڵانە ماوەتەوە. کچێك هەر سێ منداڵەکەی کە لەسێ باوکی جیاوازبوون، هەر سێ منداڵەکەی فەرمانگەی سۆسیال بەزۆرەکی لەکچەکەی سەندبوو لەخێزانی تردا دانرابوون. کچەکە کە خۆی منداڵ بوو لەخێزانی تردا گەورە بووبوو، هەروەها براو خوشکەکانی تریشی. بەهەمان شێوە دایکی کچەکەشو خوشكو براکانی لەخێزانیکی تردا بەمنداڵی بەخێوکرابوون.

منداڵ پێویستی بە فێربوونو جۆری خوێندێك دەبێت بناغەی بیروبینینی رەخنەگرانە قەناعەتکردن بێت نەك لەسەر بناغەی ترسو سزاو لێدان. دەبێ ئەو پەروەردەیە فیربێت کە لەسەر بناغەی گوێ لەیەك گرتنو رێزلێنان بێت نەك لەسەر بناغەی ترسو زەبروزەنگ بەکارهێنان.

زۆربەی زۆری دایكو باوکان رۆڵی باوكو دایکی خۆیان دەبینن لەسیستێمە دیموکراتیەکاندا، بەرژەوەندی منالەکە ئەخەنە مەرکەزەوە، چی لە بەرژەوەندی منداڵەکە بێت ئەوا لەسەروو هەموو شتێکەوەیە. باوك وەکو دایکەکە خەریکی منداڵەکەیانو کۆمەکی یەکتر ئەکەن لە بەخێوکردنی دا. ئەگەر بێتو جیاشبنەوە، ئەوا هەر یەکەیان ئەڕوا بە رێگەی خۆیەوە. هەروەها زۆر بەدەگمەن منداڵەکانیان



لەنێو کێشەو ناکۆکیەکانی نێو خۆیاندا بەکاردێنن. بەدەگمەن هەڵدەکەوێت کە باوەپیارە یاخود باوەژن لەگەڵ منداڵی یەکێکی تردا خراپ بێتو ژیانی منداڵەکە تاڵ کات یا جیای کاتەوەو لەمنداڵەکانی خۆیو خۆشەویستی نەداتێ. زۆر جار هەڵدەکەوێت کە باوەپیارەکە یاخود باوەژنەکە منداڵەکە تەبەنی دەکەنو خۆشەویستیەکی بێ مەرج بەمنداڵەکە دەدەن.

یاساکانی مافی منداڵ لەکۆمەڵێکی دیموکراتیداو بەرۆژیك لەدایك نەبوون بەڵکو هەنگاو بەهەنگاوو ساڵ دوای ساڵ هەوڵی بۆ دراوەو تا گەیشتوەتە ئەو قۆناغەی کە مافی منداڵەکان بەجۆرێکی ئۆتۆماتیکی پارێزراوە.

## ئەرکی سەرشان

زۆربەی جار کە باسی دیموکراتی دەکرێت بە تەنها ئەولایەنە باشانەی دیموکراتی باس دەکرێت کە لە بەرژەوندی هەندێ کەس دایە. ئەو ئەرکە قوورسانە نابینرێت کە لەسەر شانی کەسە دیموکراتەکانن. بۆ نموونە زۆر ئاسانە بەزەبری شەپازللەیەك وا لەمنداڵی یان کەسێك بکەی کە بەقسەت بکاتو چۆنت ویست وایبجولێنیتەوە، بەڵام زۆر زەحمەتە ئەگەر بە گفتوگوکردن قەناعەت پێکردن وا لەمنداڵەکە یا کەسەکە بکەی کە بەقسەت بکاتو بەدڵی تۆ بجولێتەوە.

تەنها کەس ئەرکی زۆری لەسەرەو لێرانەدا بەشێکی کەمی لێ باس دەکرێت. بەکورتیەکەی ئازادی تەنها کەس لەکۆمەڵێکی دیموکراتی سنووری دیاری کراوی بۆ کێشراوە. ئەگەر لەو سنوورە لادەن سزای یاسایی خۆی وەردەگرن. لە نێو کۆمەڵێکی دیموکراتی دا یاسای زۆرەکی یەجگار زۆر هەیە کە رێی لەئازادی تەنهاکەس گرتووەو سنووری بۆ داناوە، زۆربەیان سەبارەت بەرێزلێنان لەسەر مافی کەسانی ترە.

چەندین یاسای کۆمەڵایەتی هەیە کە پەیوەندی بە بەخێوکردنی منداڵو گەنجو پێداویستیەکانیانەوەیە " منالٚ مافی ئەوەی هەیە کە بەجوانی بەخێوبکرێتو

ئاسودەی هەبێت‌و بەڕێزەوە ڕەفتاری لەگەڵ بکرێت‌و نەخرێتە بەرلێدان‌و ئەزیەتدانی لەش یاخود دەرونییەوە". بەیارمەتی یاسا ئیجبارییەکانی کۆمەڵ دەتوانرێت ئەو منداڵانەی کە جوان وەکو پێویست بەخێوناکرێن، بەزۆرەکی یان بەرەزامەندی لەخێزانەکانیان بسەنرێتەوەو لەخێزانی تردا دایان بنێن‌و ئەوان منداڵەکان بەخێو بکەن. ئەوەی شایەنی باسە کاتێك ئەم یاسایە پێڕەو دەکرێت کە هەوڵدانی چارەسەرکردنی کێشەکە بێ ئەنجام بووبێت‌و ئەمەش دادگای ناوچەیی بڕیاری لەسەر دەدات. پیاو بۆی نییە لەژنەکەی بداو بەزۆر بێڕازی بوونی ژنەکەی لەگەڵیدا بنوێت. زۆربەی ئەوفەرمانگانەی کە پەیوەندیان هەیە بەمناڵەوە وەکو باخچەو قوتابخانەو فەرمانگە دەرونی‌و کۆمەڵایەتیەکان لەرووی یاساییەوە بەرپرسیارن لەسەر ئەوەی ئەگەر مناڵ ببینن لێی درابێت یاخود کەمتەرخەمی لە بەجێهێنانی پێداویستیەکانیدا کرا بێت. ئەمانە بەرپرسیارن لەوەی کە ئەیان زانی ئەبوایە شکات بکەن لەلای پۆلیس‌و فەرمانگەی سۆسیال. هەر لەمنداڵیەوە منداڵ فێردەکرێت کە کەس بۆی نییە لێی بدات، نە لەقوتابخانە، نە لە ماڵەوە، زۆر ژمارەی تەلەفۆنی پۆلیسیان فێردەکرێن بۆئەوەی لەکاتی پێویستدا پەیوەندیان لەگەڵ بکەن. ئەوانەی بەپێچەوانەی یاساوە ڕەفتار ئەکەن بەپێی جۆری تاوانەکانیان سزا دەدرێن. گەنج کە ١٨ی پڕکردبێتەوە بۆی هەیە کە خۆی هەلی ژیان هەڵبژێرێت‌و خۆی بڕیار لەسەر داهاتووی بدا بەبێ ئەوەی کە گەورە دەست لەکاروباری وەربدات.

نابێت کەسێك زۆر بخۆاتەوە کە کۆنترۆڵی لەدەست خۆی نەمێنێ، زۆربەی جار پۆلیس ئەتوانێ بەپێی یاسای زۆرەکیLVM ئەو کەسانە بگرێت‌و شەو لەسجندا بیان هێڵێتەوە تا هۆشیان دێتەوە سەرخۆیان. ئەگەری زۆریش هەیە کە مۆڵەتی شوفێریان لێ بسەنرێتەوە چونکە ئەوانەی کە مەی زۆر بخۆنەوە شایەنی ئەوە نین کە خاوەنی مۆڵەتی شوفێری بن. نابێت ئۆتۆمبیل لێبخورێت ئەگەر هاتوو زەمانی



ئۆتۆمبیلەکەی نەکردبێ. ئەگەر دەعمێکت کرد خەتای خۆیشی تیا نەبوو بەشی هەرەزۆری زیانەکەی بەردەکەوێ. لەرێگای فەرمانگەی زەمانەوە سەیارە بۆ چاککردن دەنێرن، بۆت هەیە هەتا ئۆتۆمبیلەکەت بۆ دێتەوە ئۆتۆمبیلێکی تر قەرز بکەی، بوونی ئەم زەمانە هەرچەندە بەزۆرەکیە زۆربەی کێشەکانی هاتووچۆ چارەسەر دەکات.

بۆت نییە ئۆتۆمبیل لێبخوڕیت ئەگەر باجی زۆرەکیی ڕێگاوبانی نەدابێت. نابێت مەی بخۆیتەوەو ئۆتۆمبیل لێبخوڕی، ئەگەر بێت‌و بەسەرخۆشی، یاخود مەشروبت خواردبێتەوە ئۆتۆمبیل لێبخوڕیت ئەوا دادگا حوکمت دەدا. تاوانێك لەکاتی سەرخۆشیدا بیکەی سزاکەی حوکمەکەی زیاترە لەهەمان تاوان لەکاتی ئاساییدا. نەوەستی بۆ گڵۆپی سوور ئەوا مۆڵەتی شوفێریت لێ بسەنرێتەوە. ٣٠ کیلومەتر زیاتر لێ بخوڕیت مۆڵەتەکەت لێ دەسێنرێتەوە. لەشوێنی جادە پەڕینەوە دەبێ ڕێگا بەپاسکیل سوارو پیادە بدرێت هەرچەندە گڵۆپی سەوزیش داگیرسابێت. پاسکیل لێ بخوڕی بەتاریکی ئەبێت گڵۆپەکانی پێش‌و پاشی داگیرساوبێت‌و نابێت پاسکیل لێ بخوڕیت ئەگەر بێت‌و سەرخۆش بیت. . .

گفتێك بەزارەکی بیدەی لەروی یاساییەوە ماڵە بەسەر کەسەکەوە. ئەبێت زانیاری راست سەبارەت بەخۆت بدەی ئەگینا ئەمیش سزای قانونی خۆی هەیە. شتێك بکڕێت ئەگەر هەڵخەڵەتا بێت یاخود ئەو مواسەفاتەی تیا نەبێت کە تیا باسکراوە، ئەتوانێ بیگەڕێنیتەوەو شکاتیشیان لێ بکەی. ئەگەر بێت‌و ببی بەراوچی ئەبێت دەورەی راوچی تەواوکەی کە لە دەرهێنانی مۆڵەتی شوفێری گرانترە. . ئەبێت لەکاتی راوکردندا کە ماوەیەکی دیاری کراوە تەنها ئەوەندە ئاژەڵ بکوژرێت کە بۆ تیمی راوەکە دانراوە، هەر حەیوانەش پارەکەیان پێشتر لێ سەنراوە. ئەگەر لەو ماوەیەدا ئاژەڵەکەت نەکووشت ئەوا هەقەکەت لەدەست داوەو پارەکەشت لەکیس چووە. ئەوەی کە راو بکا ئەوا حیسابی راوکردنی بەدزیەوە بۆ

حیساب دەکەن، کەسەکە لەوەیە تووشی سزای گرتن‌و پارەدان ببێت.

نابێت شتوومەکی دزی بکرێت یا غەش لە باجداندا بکەیت، لەمندالّدان قەدەغەیەو ئەگەر خێزانێك مندالّەکانی نەتوانی وەکو پێویست بەخێوکات یاخود سزای دەروونی‌و جەستەییان بدات ئەوا فەرمانگەی سۆسیال بۆی هەیە مندالّەکانیان لێ بسەنێتەوەو لەخێزانی تردا بەخێویان کەن. . ئینسان بۆی نییە لەمالّەکەی خۆیدا خەریکی زرمە زلەبێت‌و دراوسێکانی هەراسان کات. یەکێکیش ئەمەی کرد لەوەیە لە خانووەکەی دەری بکەن. . .

ئازادی تەنهاکەس سەردانەوێنی بۆ دەسەلاّتی یاسایی‌و دارایی‌و رێکخستن‌و کارە هەرەوەزیەکان‌و یاساییەکانی کۆمەڵ. کۆمەلّگایەك بۆ ئەوەی ئەندامەکانی لەژێر سایەی هێمنی‌و ئاسایش دا بژی پێویستی بەیاسایەکی روون‌و ئاشکرا هەیە کە بەر پەرچی تاوانکاران‌و مەترسییان بداتەوە کە ژیانی خەڵکی ئەخەنە مەترسییەوەو ژیانی تەنها کەس ئەبێت بپارێزێت‌و هەوڵ بدرێت بۆ ئەوەی ئەو تاوانانە جارێکی تر دوپات نەبنەوە.

توندوتیژی لەداموو دەزگاکانی کۆمەڵەوە ئاراستەی تەنها کەس دەکرێت. کاتێك کە بەپێچەوانەی یاسا دیموکراتیەکانەوە رەفتار دەکات. لەهەمانکاتیش دا گومان لێکراوان هەقی یاسایی خۆیان هەیە چ پارێزەری هەڵبژێرن، کەس بە تاوانبار دانانرێت ئەگەر دادگا تاوانەکەی ئیسپات نەکات‌و لەسەری حوکم نەدرێت. بەکارهێنانی زەبرو زەنگ دەبێت بگونجێ لەسەر بنچینەی یاسای بنەرەتی ولاّتی دیموکراتیدا. ئەبێت ئەو ئیجرائاتانە بێت کە پەرلەمان بڕیاری لەسەر داون.

بەکورتیەکەی ئەرکی سەرشانی تەنها کەس زۆرترە لەمافە دیموکراتییەکانی. لەکۆمەڵێکی نادیموکراتیدا تاکە کەس نە ئازادی تەنهاکەسی هەیەو نەك ئەرکی سەرشان. ئەوەی کە ببێتە ئەندامی پارتی دەسەلاّتدارو بتوانێ بەشان‌و باڵی دەسەلاّتی سیاسیدا بلّێ ئەوا هەموو ئەرکی سەرشانی بۆ کۆمەڵەکەی جێبەجێ کردووە.



## کەموکوڕی دیموکراتی

سیستمی دیموکراتی وەکو سیستێمەکانی تر کاری ئینسانی پێوە دیارەو کەموکوڕی خۆی هەیەو هەندێ خەڵکی شارەزا لەڕێگای شارەزاییەوە ئەتوانێ سوودی تایبەتی لێ وەربگرێت. بۆ نموونە ئەمانە بەڕێوەبەری فەرمانگە گرنگەکان یاخود لێپرسراوانی کارگە بەرهەمهێنەرەکانن ئەمانە بۆ خۆیان عەقدی ژێرەوەیان بۆ خۆیان هانیوەتەکایەوە کە پارەیەکی خەیالی وەردەگرن کاتێك لەئیشەکانیان دەردەکرێن یاخود خانەنیشن دەبن. بەڕێوەبەرە کۆنەکەی کارگەی ABB گرێبەستێکی تایبەتی هەبوو لەگەڵ کارگەکەدا کە خانەنشین بوو ١٥٠ ملیۆن دۆلار زیادە لەسەروخانەنشینیە وەربگرێت. کەچی کرێکاری سویدی وا هەیە کە سەرانسەری ژیانی کاری بۆ هەمان کارگە کردووە، دۆلارێك چییە زیادەی لە سەروخانەنشینیەکەیەوە وەرنەگرتووە. کۆمپانیای تایبەت هەموو جۆرەکانی وەرزش سەرپەرشتی دەکات‌و پارەیەکی خەیالّی لێ قازانج دەکرێت، کەسە لێهاتووەکانی وەرزش بڕێکی یەجگار گەورە وەردەگرن، هەفتانەکەیان مووچەی دووساڵی کرێکارێکی ئاساییە کە لەسەعات ٦ ی بەیانی تا چواری ئێوارە ئیش دەکات.

لەرووی یاساییەوە جاری وا هەیە بەئاسانی تاوانکار خۆی سەرفراز دەکات بۆنموونە لەکاتی کوشتن دا کەسەکە خۆی واپیشان دەدا کە نەخۆشی دەرونی هەیە بۆئەوەی لەجیاتی سزای بەندیخانە لەنەخۆشخانەی دەرونی دابنرێت، زۆرجار تاوانکارەکە ئەم پلانەی بۆ سەردەگرێت‌و چونکە دادگا حوکمی کەسێك نادا ئەگەر بێت‌و تاوانەکەی لەکاتێکدا کردبێت کە Psykos ی هەبێت ئەو حالّەتانەیە کە کەسەکە نازانێ چ دەکات‌و دەنگێکی تر هەیە لەمێشکی دا کە بڕیار دەردەکات نەك کەسەکە خۆی.

زیاتر بایەخدان بە تەنها کەس وای کردووە کە تەنها کەس وەکو ئەسپی عەرەبانەی لێهاتووەو هەر خۆی ئەبینێ‌و گوێ نەداتە کەسانی دەوروبەرەکەی.

لەئەوروپادا کێشەی نامۆیی کێشەیەکی یەجگار گەورەیە، کە بۆتە هۆی ئەوەی کە خەڵکی بۆ زاڵبوون بەسەر ئەم هەستەدا پەنابەرنە بەر مەشروب‌و حەشیشەو تلیاك‌و. هتد. لەشارێکی مام ناوندی وەکو ڤیستەرووسدا ٢٤٠ کەس لەم کەسانە بێ خانون‌و لەو زستانە ساردەی سوید دا لەژێر زەمین‌و ژێر قادرمەو تەوالێتە گشتییەکان‌و ئێستگەی شەمەنەفەردا دەنوون. بێجگە لەمردنی کوتوپڕی لەنێوان ئەوانەی کە کێشەی کۆمەڵایەتیان هەیە بەلای کەمەوە ساڵی ٧٠ کەسی سویدی لەخەفەتدا خۆیان دەکوژن.

ئافرەت لەگەڵ ئەو هەموو حەق‌و حقوقەشدا کە تێپەڕبوونی زەمەن بەدەستی هێناوە لەئەوروپادا نەیانتوانیوە خۆیان بپارێزن لەو توندو تیژیانەی کە ئاراستەیان کراوە. بەپێی ئاماری ئەم دواییە، ژمارەی ئەو ئافرەتانەی کە ئەکوژرێن لەسەدا نەوەدی لەو کەسانەوە ئەنجام دراوە کە خزم‌و ناسراوی ئافرەتە کوژراوەکە بوون. بەلاتانەوە سەیر نەبێت کە ژمارەی ئەم ئافرەتە کوژراوانە زیاترە بۆ نموونە لەو ئافرەتانەی کە بەنەخۆشی ئاسایی دەمرن بۆ نموونە وەکو نەخۆشی سەرەتان. لەسویدا بەلای کەمەوە ٣٧ ئافرەت ساڵانە دەکوژرێن.

سیستمی دیموکراتی ئەگەر رەگی قووڵی دانەکوتا بێت لەکۆمەڵێکداو نەبووبێت بە بەشێ لەژیانی خەڵکی، لەوانەیە زوو لەناوچێت. کاتێکیش کە لەناو ئەچێت بەکارەساتێکی گەورە کۆتایی پێ دێت. فاشی ئیتالی‌و نازی ئەڵمانی سوودیان لەبوونی سیستمی دیموکراتی وەرگرت‌و پێدا سەرکەوتن کە کاتێك هاتنە سەر حوکم. کە گەیشتنە سەرحوکمیش گشت سیماو دیاردە دیموکراتییەکانی لەبنەڕەتەوە هەڵکێشا. سەدام کە لەتەمەنی ٢١ ساڵیدا ژیانی هاوولاتیەکی تکریتی کوژانەوە، کەچی دوای شەش مانگ دەرباز بوو چونکە دەهۆ بازانە پێنج شایەتی بەزۆر پەشیمانکردەوەو ئەمەش بوو بەهۆی ئەوەی سەدام رزگاری بێت، سەدام بەهۆی بوونی قانون‌و دیموکراتیەوە رزگاری بوو چونکە دادگا هیچ مەدرەکێکی وای



بەدەستەوە نەبوو کە حوکمی بدات، هەر چەندە سور بەلایانەوە ئاشکرا بوو کە سەدام کابراکەشی کوشتبوو!

لەسەرانسەری حوکمی مەلەکیدا لەعیراق بەقەدەر رۆژێکی دەسەلاتدارییی سەدام خەڵك لە سێدارە نەدراوەو بە قەدەر رۆژێکی ئەمرۆخەڵکی بێ خەتا گیانی لەدەست نەداوە. کودەتا سەربازییەکەی عەبدولکەریم قاسم وردوخاشکردنی سیستێمێکی دیموکراتی بوو کە خەریك بوو لەعیراق دا سەرهەڵبدات. بە تەنها رۆژێك هەموو حیزبە بەشداربووەکانی پەرلەمانی عیراق وەکو بەفر توانەوە. . .

**داهاتوو**

ولات دەبێت یاسا بەڕێوەی بەرێ نەك بەکارهێنانی توندوتیژی. بوونی یاساش دەورێکی کاریگەر نابینێ ئەگەر ئەندامانی کۆمەڵ رێزی لێ نەگرن‌و پەیڕەوی نەکەن‌و نەبێت بە بەشێك لە ژیانیان. ناکرێ کۆمەڵی کاروباری بەڕێوەببرێت ئەگەر بێت‌و ئەندامەکانی پاڵپشتی یاسا هەرەوەزییەکان نەگرێت. تەنها لەرێگای پۆلیس‌و دادگاو سزادانەوە ناکرێ ئەمن‌و ئاسایش‌و پارستنی مافی تەنها کەس لەکۆمەڵێکی دیموکراتیدا زەمان بکرێت. بۆ نموونە وریایی گشت خەڵکی کوردستان‌و کۆمەککردنیان دژی تیرۆرکردن بۆتە یارمەتی دەرێك کە کاری تیرۆریستی کەمتر لەشارەکانی کوردستان ئەنجام بدرێت. بەهەمان شێوە دەبێت هاوولاتیان پێرەوی‌و کۆمەککردنی یاسا هاوبەشیەکانی تری کۆمەڵ بکەن بۆئەوەی تەنها هەر مەرەکەبی سەر کاغەز نەبێت.

کۆمەڵێك ناتوانێ داهاتوویەکی دیاری هەبێت ئەگەر بێت‌و تەنها بەکاربەرەکانە (موستەهلیکانە) بژی. بەمانایەکی تر هەر توانای لێی بڕواو هیچ نەیەتەوە شوێنی. ئەوەی کە گرنگ بێت لەسیستیمی دیموکراتیدا ئەوەیە کە داهاتووی چۆن بپارێزرێت. بوونی توانایەکی بەرهەمهێنەر لەروی گەشەکردنی پیشەسازی‌و پێش خستنی کشتوکاڵیەوەو پشت بەخۆبەستن زەمینەیەکی چاك بۆ پاراستنی داهاتووی

کۆمەڵەکە خۆش دەکات.

وڵاتێك هەرچەندە تواناش بێت ئەبێت توانای بەرهەمهێنانو داراییـەکی بـەهێزی بۆ خۆی دامەزراند بێت بۆ ئەوەی لـەدوارۆژە ناهەموارەکانـدا بتوانـێ لەسـەر قاچـی خۆی بوەستێت.

بێگومـان کۆمەڵێك ناتوانێ هەموو بەرهەمهێنەر بێت هەروەها ناشبێت ئەگـەر هـەر هـەمووی بەکاربـەر (موسـتەهلیك) بێـت. لەهـەموو کۆمـەڵێکـدا کۆمـەڵێك کەسانی لاواز هەن کە کۆسپی تایبەتیان هەیە کە نـاتوانن بەشـداری بەرهـەمهێنان بن. ئەبێت کۆمەڵ چاوی لەمانە بێتو پێداویستەکانی ژیانیان دابین بکات.

بێکاری خۆی گیروگرفتێکی ترسناکە کە کار ئەکاتە سەر سیستمی دیموکراتیو هەموو کەسێك ئەبێت دەرامەتێکی هەبێت کە خـۆی پـێ بژیـەنێ. لەهـەمانکات دا ناکرێ هەر لەبەر ئـەوەی کـە خـەڵکی ئـەبێت کـارێکی هـەبێت لـە فەرمانگەیەکدا دابمەزرێت. بۆیە بوونی فەرمانگەی کۆمەڵایەتیش مەرجـە بـۆ ئـەوەی ئاگـای لەوانـە بێت کە بێکارن. فەرمانگەی وا هەیە بەچوار کەس دەبرێ بەڕێوە کەچـی ٢٠ کەسـی تیا کار دەکات. فەڕاش خەریکی چایی هێنانو بردنە. بەڕێوەبـەر شـوفێری تایبـەتی هەیە وەکو ئەوەی جـەنابی بەڕێوەبـەر قاچـی شـکابێت خـۆی بـڕواو یـاخود بـە پـاس هاتووچۆ بکات.

بەکورتیەکەی سیستمێك کێشەی گـەورە دروسـت دەکـات ئەگـەر لـە داهـاتوودا لەنێوان هاوردەوهەناردەدا ئێ کسپۆرتی دا هاوسەنگییەك دروست نـەکات. یـەکێك لەهۆ گرنگەکانی گەشـەکردنی لایـەنی ئـابووری وڵاتیـك هانـدانی منافەسـەکردنو بەرزنرخانـدنی شـارەزایی لێهـاتووی تـەنها کەسـە. بـوونی زەمینەیـەکی شـەرعیی منافەسـەکردن زۆر ئەلتـەرناتیڤی جیـاواز دەخاتـە بـەردەم هاووڵاتیـانو توانـای هەڵبژاردن فراوانتر دەکات.

هەڵبەتـە ئـەم بوژانەوەیـەی ئـەمڕۆی کوردسـتان بەخـەیاڵی هـیچ کەسـێکماندا



نەهاتووە. لە ماوەی نیوسەدەدا کـورد ناهـەمواریو مـاڵوێرانی زۆری بینیـوە، بۆیـە ئەم دەرەفەتەی کە بۆمـان هەڵکەوتووە هیوای گشت لایەکە کە لەدەسـت دەرنەچـێت. ئێـستامـان گرنگـە بـەڵام داهاتوومـان گـرنگترە. ئـەو داراییـەی کـە ئەمڕۆکـە لـە بەردەستایە پێویستە هەر ورگی پێ تێر نەکرێت بەڵکو بۆکاری کۆمەڵایـەتی گـەورە بەکاربهێنرێت بـۆ نموونـە دروسـتکردنی کارگـەی پیـشەسازی گـەورە لەشـارەکانی کوردستان داو پشت بەخۆبەستنە لـە بـەروبوومو گەشـەکردنی کـشتوکاڵدا بۆئـەوەی لـەداهاتوودا میلەتەکـەمان بتوانـێ ئیکتیفـای زاتـی خـۆی بکـات لەزۆربـەی پێداویـستیەکانی خـۆیو توانـای هـەبێت لـەداهاتودا ئێکـسپۆرت(هـەناردە)یـش بنێرێتە دەرەوە.

بۆ ئەم نووسینە سود لەم سەرچاوانە وەرگیراوە


1. Tanke Träning" Edward Debono، SvD förlag AB 1998
2. "Analysis Terminable and interminable" Sigmund Freud، 1937
3. "Minnet" Baddeley Alan، Natur och kultur، 1997
4. "Hur tanker fóds och några konsekvenser" vergaard Tomas، Falkkping 1972:
5. "Dynamisk psykologi" Paul A.Dewald، Natur och kultur، 1995
6. "Hoppets Revolution" Erik From، Rabén & Sjgren، 1979
7. "Kärlekens konst" Erik From، Natur och kultur 1987
8. "Frهm barndom till brott" Inge Tidefrs Andersson، Gteborg Universitet، 2002
9. "Berättelser om Ondskan" Magnus Berg mfl، WW،2000
10. Psyko analysens mdrar" Anna Freud، Alfabeta،1992
11. Lgnens folk" M Scoat Peak; Libris 1993
12. Dynamisk utveckling psykologi" Gunnar Carlberg، Natur och kultur، 1992
13. Analysis of Defense" Anna Freud، IUP،1987





14. allstudier" Sigmund Freud، Natur och kultur 2000
15. Drmtydning"Sigmund Freud، Natur och kultur 1996
16. Cognative psychologi" Eyseneck & Keane، LEA،1991
17. Demokratin، ekonomin och friheten" Ohlin، Bertil. Stockholm 1999.
18. Folkpartiet och jämställdhet ågan" Drangel، Louise، (Liberal ideologi och politik 1934–1984. Falkping 1984).
19. Kognitiv terapi i teori och praktik. 1 - 3 utg" Perris C، Natur och Kultur
.١٩٩٦/١٩٨٦
20. Kognitiv psykoterapi vid schizofrena strningar" Perris C، Pilgrim Press،
١٩٨٨
21. Ett band från livet. Bowlbys anknytningsteori och psykoterapi" Perris C،
a. Natur och Kultur، 1996
22. Utrota varenda jável"، Lindqvist Sven Bonniers förlag 1992
23. Politiska ideologier och förhållande till staten" Stockholm 1975

## سەبارەت بەخۆم

ناوم حەمە دۆستان قەرەداخیە، لە هەڵەبجە لەدایكبووم. لە زانكۆی سلێمانی لەكۆلیژی كشتوكاڵ موعیدبووم، نزیكەی ٢٤ ساڵ لەسوید دەژیم. لەسەرەتای هەشتاكاندا وەك مامۆستاو مورشدی خێزانو وەرگێڕو فەرمانبەری سۆسیال كارم كردووە. ساڵی ١٩٩١ بەكالۆریۆسم لەسۆسیۆنومدا وەرگرتووە. ساڵو نیوێك سیكۆلۆگی ئیزافیم خوێندوەو لەساڵی ١٩٩٩ دوای دوساڵ خوێندنی باڵام تەواوكردووە بوم بە Terapeut .

لەسەردەمی منداڵیمدا خەریكی هۆنراوە نووسین بووم، بەڵام تەنیا بۆ خۆم بوونو زاتی ئەوەم نەدەكرد پیشانی كەسیان بدەم. بەداخەوە كە ئێستا ئەو هۆنراوانەم لەكیس چوون. هەوڵدا هەندێ لەو هۆنراوانەم بە بیربێتەوەو بەزمانی سویدی یەك دوانێكیانم نووسییەوە، ئێستاكە نزیكەی هەشتا هۆنراوەم بە زمانی سویدی هەیە، هەندێكیان لەرۆژنامەو گۆڤارە سوویدیەكاندا بڵاوكراونەتەوە. لەوانە شیعرێكمە كە سەبارەت بەهەڵەبجەو مەعەسكەری نازییە لە ١٧ رۆژنامەو گۆڤاری سوید دا بڵاوكرایەوە.

لەسەرەتای ساڵی ٢٠٠١ وازم لەكاركردنی Konsul (راویژكار) هێناوە، خاوەنی بیری نوسینی خۆمو وەكو رۆمانوس بەردەوام كاردەكەم. هەروەها بۆ رۆژنامە دەنووسم تا ئێستا زیاتر لەدووسەد ووتارم بڵاوكردۆتەوەو هەروەها محازەرە لە شارە جیاكانی سوید دەڵێمەوەو چەندین جاریش لە دیباتی تەلەفزیۆنی بەشداریم كردووە. . یەكێك لەو وتارانەی كە بەلامەوە گرنگە ئەو وتارە بوو كە لەكۆنگرێسی ئەمەریكی بەشی مافەكانی مرۆڤ سەبارەت بەهەڵەبجە خوێندومەتەوە. هەروەها وتارێكی ترم لەساڵی ٢٠٠٠دا لە رۆژنامەی ناوەندی سوید بڵاوكردووەتەوە كە بۆچی سەدام نادرێت بە دادگای نێودەوڵەتی وتارەكە كێشەی زۆری بۆ نامەوە.



## بەرهەمەكانم :

"پەناهەندەیی" "Flyktingar" : سەبارەت ژیانی پەنابەرانە

"پێكەوە ژیان" " Integration سەبارەت بە گیروگرفتەكانی پەنابەرانە

"Som en svart vind" ١٩٩٩ "وەكو زریانێك" "Black Wind from Kurdish Hills" ئەم رۆمانە بە زمانی سویدی نوسراوەو ٤٤ رەخنەگری سویدی رەخنەی باشی لەسەر نوسیووە. رۆمانەكە سەبارەت بە شاری هەڵەبجەو كوردستانە لەساڵی ١٩٦١ تا ساڵی ١٩٧٥. لە ماوەیەكی نزیكەدا رۆمانی ناوبراو لەدەزگای بڵاوكردنەوەی " Janus Publishing company" لە لەندەن بەزمانی ئینگلیزی بڵاودەبێتەوە، قەبارەی رۆمانەكە ٥٢٣ لاپەڕەیە.

"En plats i paradiset" ٢٠٠٣ "جێگایەك لە بەهەشتا" "*A Place in Paradise*" رۆمانێكە بەشی زۆری سەبارەت بەشاری هەڵەبجەیەو كوردستانە لەساڵی ١٩٧٦تا ١٩٨٨. ئەم رۆمانە بێجگە لە رادیۆو تەلەفزیۆنی سویدی لەلایەن ٦٠ رەخنەگری سوویدیەوە چاكترین رەخنەی لەسەر نوسراوە. تاكو ئێستا دوو چاپی لێ فرۆشراوە. دەزگای بڵاوكردنەوەی Bonniers ١٢ كتێبی ئەمساڵ هەڵبژاردووە بۆئەوەی كتێبێكی قوتابخانەكانی لێ دروست كات، یەكێك لەو كتێبانە ئەم رۆمانەیە.

"Enbokföralla" كە یەكێكە لەدەزگا گەورەكانی بڵاوكردنەوە لەسوید ئەم رۆمانەی لە مایسی ٢٠٠٥ داكرپیوەتەوەو ٢٥٠٠٠ نوسخەی لێ چاپ دەكات.

ئەم رۆمانە لەمانگی دووی ساڵی ٢٠٠٥ دا بەزمانی دانیماركی دێتە بازاڕەوە.

" Saddam-land" ٢٠٠٤"ولاتی سەدام" ئەم ڕۆمانەم تەواوبووەو ناردومە بۆ دەزگاكانی بڵاوكردنـەوەی سـویدی چـاوەڕوانی وەڵامـم. زۆربـەی زۆری ڕۆمـانەكـە سەبارەت بەتاوانەكانی ڕژێمی سەدامـە. نزیكەی سەدو پەنجا لاپەڕەی لەسەر هەڵەبجـەو ئەنفال‌و ڕەوەكەیە.

ئێستاكە خەریكی نووسینی ڕۆمانی"" Brutna vinger "باڵـشكاوەكان"م. ئەم ڕۆمانە سەبارەت بەلای خۆمانە لەسـاڵی ١٩٨٨ تـا سـاڵی ٢٠٠٣. ئـەم ڕۆمانـە ئەبێتە تەواوكەری زنجیرەی ڕۆمـانی سییانی. بەسەرهاتی هەڵەبجەو كوردستان لەساڵی ١٩٦١تا ٢٠٠٣

دوو ڕۆمـانی ترم نووسیوە بەڵام لەبەر هۆی بـازاڕی دەسـت نـادات چـاپ بكـرێن، یەكێكیان ڕۆمـانی تاوانە بەناوی "" Eget grep "كەوتنـە تەڵـەی خـۆوە "ئـەوی تریان ڕۆمـانێكە بۆ منداڵان "" Davids vandring" گەشتەكەی داڤید"

## تێبینیەك

## " كۆمەڵ‌و سیستمی دیموكراتی"

ئەم نووسینە ئەنجامی هاندانی برادەرێكـی ئازیزمـە كـاك ئـەنوەر قـادر جـاف. زۆرجار پێكەوە دائەنیشتین‌و باس‌و گفتوگۆمـان لەسەر هەندێ لایەنی كۆمـەڵایـەتی‌و سیاسی دەكرد. ئەو پێی باش بوو كە بەشـێوەی ووتـار لەسـەر ئـەو باسـانە بنووسـم. هەرچەندە مـن بۆم ڕوون دەكردەوەو كە بەكوردییەكەمدا ڕاناپەرمووموەوە، بەڵام كـاك ئـەنوەر ووتـی مـن یارمـەتیت ئـەدەم . سـەرلە نـوێ نووسـینەكانمی نووسـیوەتەوەو لەگۆڤاری ڕوناكبیریدا بڵاوكرانەوە. بێجگـە لـەكاك ئـەنوەر برادەرێكـی ئـازیزی تـرم كاك شـێروان مـەحمود سـەر لـەنوێ ووتـاری سـەبارەت بەدەسـەڵاتی نووسـیوەتەوەو بەدەستی ڕەنگین‌و زمانزانییەكەی ووتارەكەمی جوان‌و دەوڵەمەند كرد. ئەم نووسـینە ئەگەر بێت‌و كەڵكێكی هەبێت‌و كەلێنێك بگرێت ئـەوا بەشـی هـەرە زۆری تەقـەڵای ئەو برادەرە ئازیزانەمە.

# دیموكراسیەتو پەرلەمان

## یۆنان

دیموكراسیەت بۆ یەكەمین جار پێش لەدایكبوونی مەسیح بە(٢٠٠ــ٣٠٠)ساڵێك، وەكو سیستمێك بۆ رێكخستنی كاروباری ژیان لەشاری ئەسینا دامەزرێندراو شانبەشانی زانستە ئازادەكانو چالاكییە جۆراوجۆرەكانی ئەو سەردەمە لەگەشە كردندابوو. دەسەڵاتی كاروباری رێكخستن بەدەستی ئەنجومەنی هەڵبژاردەی شارە سەربەخۆكانەوە بووە(stads statterna). هەریەكێ لەم شارە سەربەخۆیانە دانیشتوانی شارو دێهاتەكانی دەوروپشتیان دەگرتەوە بچوكترین شاری سەربەخۆ ژمارەی دانیشتوانی نزیكەی دووهەزار بووەو گەورەترینیشیان شاری ئەسینا بووە، كەژمارەی دانیشتوانی نزیكەی پەنجاهەزار كەس بووە. ژمارەی دانیشتوان لەكەم بوونو پەیوەندی راستەوخۆیان بەرادەی نەخۆشیو شەڕو كارەساتەوە بووە. هەموو كەس مافی هەڵبژاردنی ئەنجومەنی شاری نەبووە (كۆیلەو ئافرەتو منداڵ مافی دەنگدانیان نەبووە). تەنیا ئەو پیاوانەی كەئازادو لەخێزانێكی نەجیب زادەو ناسراو بوونو تەمەنیان لە(٢١)ساڵ كەمتر نەبووبێ، مافی دەنگدانیان هەبووەو توانیویانە كار بكەنە سەر هەڵبژاردنەكە. جۆری هەڵبژاردنەكەش بەشێوەی دیموكراسی راستەوخۆ بووە. گشت خەڵكی شار كۆبوونەتەوە (ئەوانەی مافی دەنگدانیان هەبووە)



لەشوێنێك. ئەنجومەنیان هەڵبژاردووە یاخود بڕیاری خۆیان داوە. ئەوكەسانەی، كەمافی دەنگدانیان بووە بەهۆی ناوڕاكێشانی راستەوخۆوە بوونەتە ئەندامی ئەنجومەنەكە. دە ژەنەراڵو ئەمیراڵ راستەوخۆ لەنێو خەڵكەكەدا هەڵبژێردراون. ئەو كەسەی هەڵبژێردرابێت بەئەندامی ئەنجومەن تەمەنی لەسی ساڵ كەمتر نەبووە. سەرۆكی ئەنجومەن خۆی ئەندامی ئەنجومەنەكەش بووەو تەنیا یەك ڕۆژ مافی ئەوەی هەبووە سەرۆكایەتیی بكات، دوای ئەو رۆژە، بەنۆرە یەكێكی تر هاتۆتە شوێنی. لەو سەردەمەی كەئەفلاتوون لەژیاندا بوو. كۆمەڵو گروپی سیاسی لەدەوری ئەنجومەنەكەوەو دەوری پارتی ئەم سەردەمەیان بینیو. بۆ نموونە كاتێك دەسەڵات لەدەستی دیموكراتەكاندا بووە، باری رێكخستنو گەشەكردنی یۆنان بەجۆرێكی تر بووە. بە بەراورد بەو سەردەمەی كەدەسەڵات لەدەستی پاشا پەرستەكاندا بووە. بەلای دیموكراتەكانەوە ئازادیو یەكسانی زۆر گرنگ بووە، بەلای ئەوانەشەوە، كەسەر بەپاشایەتی بوون، تەندروستیو خورەوشتو بڕیاردانو چارەنووس دیاریكردن.

لەم سەردەمانەدا خەڵكی لەرووی یاساوە یەك یەك سەیركراونو كۆیلە تارادەیەك باشتر ژیاوەو بۆی هەبووە پارە كۆبكاتەوەو خۆی بكڕێتەوە. ئەم جۆرە ئەنجومەنو شارە سەربەخۆیانە وەكو شتی گشی بۆ گشت خەڵك چاك بوون، بەڵام لەڕاستیشدا زیاتر لەخزمەتی خەڵكی دەستەڵاتدارو دەوڵەمەندا بوون.

## ئەفلاتون

لەسەردەمی خۆیدا راستەوخۆ بەشداریی ناكۆكییە سیاسیەكانی نەكردووەو باوەڕی بەپارتو گرووپی سیاسی نەبووە. هەرچەندە بەشی هەرە زۆری نوسینەكانی سەبارەت بەسیاسەتن. بۆنموونە چۆن دەوڵەت، دیموكراسی، رێكخستنو هەڵبژاردن لەنێوكۆمەڵدا پەیدا دەبێت. كاتێك ئەفلاتون باسی وڵاتە ئیدیالەكە دەكات

مەبەستی ئەنجومەنێك بووە لەپاشا فەیلەسوفەکان کەتوانای بڕیاردانیان لەسەر هەموو کاروبارێك هەبێ. بەلای ئەفلاتونەوە خوێندنو خزمەت تەنیا رێگایەکە بۆئەوەی خەڵکی پلەو پایەیان دەست دەکەوێت. (خەڵکی چاك بۆ جێگای چاك)ئەوکەسەشی کەگەیشتبێتە پلەی مەلیکی فەیلەسووف نزیکەی(٤٠ساڵ) دەبێ بەدوای زانستو زانیاریدا گەڕابێو بێ مووچەو پارە، جلوبەرگی زۆر لەهی خەڵکی سادەتر بووەو، هەقی ئەوەی نەبووە هیچ ماڵو سامانو موڵکێك بەیەکەوە نێ. لەولاتەکەشدا وادانراوە منداڵ لەنێو داموو دەزگاکاندا بەخێو بکرێت. ژن هێنانو خێزان دروست کردن مەسەلە نەبێت. (گرنگ ئەوە بێت هەموو وەکو لەخێزانێکی گەورەدا بژین). هاوجووتبوونی ژنو پیاو بەناو راکێشان بێت. منداڵەکان خۆیان بەبراو خوشکی یەك بزانن. ئەفلاتون بەروونی باسی ئافرەت یاخود کۆیلەی نەکردووە. هەندێ لەتوێژەرەوەکان ئەوە دەخەنەروو کەئەفلاتون مافی مرۆڤانەی بەگشت کەس داوەو هیچ جیاوازیەکی لەنێوان پیاو ژنو مرۆڤی کۆیلەو ئازاددا نەکردووە.

### سویسرا

هەروەها سویسرا یەکێکە لەو دەوڵەتانەی، کەدابو نەریتی دیموکراتیانەی دەمێکە تێدا چەسپاوەو بەهێزە. خەڵکی ئەم ولاتە شەیدای ئازادینو توانیویانە بیپارێزن. سویسرا وەختی خۆی لەسێ بەش: (ئوریو شڤێسو ئولتەرولدن) پێکهاتبوو هەر لەسەردەمی ئیمپراتۆریەتی رۆمانیەوە ئازادییان بۆ خۆیان دابین کردبوو.

ساڵی(١٢٥٠) کەئیمپراتۆرییەتی ناوبراو هەڵوەشایەوە، ئازادیی ئەم سێ ولاتە کەوتە مەترسیەوە، بۆیە ساڵی (١٢٩٠) هەرسێ لایان پەیمانێکی سوپاییان لەگەڵ یەك ئیمزاکردو بەگوێرەی ئەم پەیمانە، دەبوایە لەکاتی هێرشی دەرەکیدا، بۆسەر هەر لایەکیان، ئەوانی تر لەسەری بێنە دەنگو بەرگریی لێ بکەن. سویسرا بیست



هەرێمی هەیە، هەر هەرێمەو دەستوری تایبەتیو دام ودەزگاکانی کاربەڕێوەبردنو راپەڕاندنی خۆی هەیە. نزیکەی سێ هەزار شارەوانیی سەربەخۆی هەیە، کەهەریەکەیان دەوڵەتی بچکۆلەیەکن بۆ خۆیانو چارەنووسیان بەدەستی خۆیانەوەیە. دەسەلاتی سەرەوەو ناوەند لەم ولاتەدا هیچ بایەخێکی ئەوتۆی نەماو. بەشی هەرە زۆری شارەوانیەکان بەشێوەیەکی دیموکراسیو دەنگدان بڕیار دەدەنو کاروبار بەڕێوەدەبەن. زۆرجاریش دەنگدان راستەخۆ کراوەیە، هەرچەندە ئەم شێوەیە بۆ شارە گەورەو قەڵەباڵغەکان زۆر شیاوو گونجاو نییە. شایانی باسە، تەنانەت لەسویسرا تا ئەم ماوانەی دووایی ئافرەت مافی دەنگدانی نەبوو، دووا شارەوانی ساڵی(١٩٩١)بڕیاری ئەم هەقەی بەئافرەتان دا.

### دیموکراسیەت لای ژان ژاك رۆسۆ

رۆسۆ دەورێکی بالای هەبووە، لەبانگەشە کردن بۆ ئەم بیرەداو بەهەموو تواناو بلیمەتییەوە هەوڵی بلاوکردنەوەو چەسپاندنی دیموکراسیەتی داوە. رۆسۆ باوەڕی بەوە نەبووە، کەخەڵك نوێنەری هەبێتو دەسەلات لەچنگ کۆمەڵی خەڵکدا گیربخوات. ئەم پێی وابووە، خەڵك دەبێ بزانن چییان پێویستەو دەبێ خۆیان بڕیاری لەسەربدەنو بەدەنگدانی گشتیو ئازادانە خەڵك ژیانی خۆیان دابین بکەنو بگەنە ئامانجەکانیان.

### پێناسەیەکی دیموکراسیەت

دیموکراسیەت وشەیەکی یۆنانییە، بەمانای دەسەلاتی میللەت، یا ئەنجومەنی دەسەلاتداری گەل، یاخود هەڵبژاردەکانی میللەت. یۆنانەکان، کەباسی دیموکراسیەتیان کردووە، مەبەستیان لەسیستمێکی سیاسی بووە، بۆ کاروبار بەڕێوەبردنو رێکخستن. کاتێك خەڵك لەکۆمەڵێکدا پێکەوە دەژین، بەرەنگاری کۆمەڵێ گیروگرفتو کاروباری هاوبەش دەبنەوە، کەیاسایەك دەبێ بەڕێوەیان ببات. بۆ ئەم رێکخستنە پێویستە ئەنجومەنێك هەڵبژێردرێت، کەتوانای بڕیاردانی هەبێت.

ديموكراسيەت هەر لەسەرەتاوە هەڵگری مانایەکی چاك بووەو هەمووکارێکی پەسەند دراوەتە پاڵ ئەم چەمكو بیرە. لەم ڕۆژگارەی ئێستادا، دەرفەتو شوێن، هەر لەکارگەو قوتابخانەو ماڵو خەستەخانەوە بیگرە تاخەیاڵ بەرەوژوور دەچێ...دیموکراسیەتی پێوە دەلکێنرێت...بۆ نموونە، دیموکراسیەتی کارگە، قوتابخانە...هتد.

## دیموکراسیەتی ئیدیاڵ

تۆماس مۆر ساڵی(١٩١٦/٥/٥)کتێبێکی لاتینی بەناوی(UTOPIA)وە نوسیو ئەمەش هەر وشەیەکی یۆنانییە لە(Topos)ەوە هاتووە، واتە ئەوجێگەیەی وجودی نییە، یان کەس پێی ناگات، بەڵام خەڵك دەتوانێ لێی نزیك ببێتەوە.

دیموکراسیەت چوارچێوەیەکی دەستوریو سیاسیەکی مرۆڤایەتیو ئەخلاقییە، هەروەك مافەکانی تاك، ئاوەهاش ئەرکی سەرشانیان لەکۆمەڵدا دیاریدەکات، ئەمەش بەئارداوێژی خۆڕایی نابێ، کەدیموکراسیەت بەئازادییەکی موتلەق لەقەڵەم بدرێ. نمونەیەکی ساکار، ئەویاسایانەیە بۆ زامنکردنی ژیانی خەڵك لەهاتووچۆکردندا دانراون، ئەگەر پشتگوێ بخرێن، ئەوە وەکو ڕۆژگاری رابردووی لێدێ، کەهەرکەس عەرەبانەکەی گەورە تر بوایەو ئەسپی زۆر تر رایانکێشایە دڕی بەئەوانی تر دەداو دەبوایە ئەوان لەقەراغ جادەدا چاوەڕێیان بکردایە، تا(باسیعاتی)تێپەڕ دەبوو.

## گرانە بەوشە . . تەعریفی دیموکراسیەت بکرێت

دیموکراسیەت چەمکێکی بەرفراوانو قووڵی هەیەو ئاسان نییە، بەوشە گەوهەرەکەی روون بکرێتەوە، هەروەك چۆن منداڵێك فێری زمان دەبێت. ماوەیەکی دیاری کراوو تایبەتیی دەوێ بەو ئیشارەتو دووپات کردنەوەو راهاتنو بەسەرچوونی هەندێ کات ئەمەی بۆ دەرەخسێت ئاوەهاش دیموکراسیەت پێویستی



بەتێگەیشتنێکی بنەڕەتی هەموو لایەنو سیماکانی هەیە، بۆ پێناسە کردنیشی دەبێ تێیدا بژینو بەشداری پرۆسە دیموکراسیەکە ببینو هەستی پێ بکەینو بتوانین دیموکراس بین. مێژووی دیموکراسیەت لەهەرکۆمەڵو وڵاتێکدا بگرین، مێژوویەکی پڕکۆسپو گیروگرفتو گرانی هەبووە، نەك تەنیا وەختی ویستوە، بەڵکو لەسەرەتادا بەدەیان هەڵەو ناهەقیشدا رۆیشتووە، بەڵام کاتێ پێی ناوەتە قۆناغی پێگەیشتنو کاملبوونەوە گۆڕانی بەڕێگەی ئاشتیو لەسەرخۆ بنەڕەتی پڕۆسەکە بوون، ئەنجامی بەکەڵکی بۆ کۆمەڵەکە بووە. ئەگەر ویستمان لەدیموکراسیەت بدوێن دەبێ شارەزای وشەو زاراوەکانی، چەمکەکانی لایەنە تێوریو پراکتیکیەکانی، سیماکانو هەموو ووردو دریشتییەکی بین...هەروەك چۆن شەترەنج زانێك لەهەموو ووردیاتێکی بابەتەکەی دەزانێو ئەگەر یەکێك ئەم یارییە نەزانێو ئەوا بەقسەوباس کردن ناتوانن تێی بگەیەنین...هەروەهاش دیموکراسیەت. نوسەر شارە نموونەییەکەی ئەفلاتوون بۆ ئەم مەبەستە بەنموونە دەهێنێتەوە.

## دیموکراسیەتی نوێ یا ناڕاستەوخۆ

دیموکراسیەتی نوێ ئەو جۆرەیە، کە لەرێگەی پارتو گرۆکە سیاسیەکانەوە خەڵکی نوێنەرایەتی لێ دەکرێتو لەهەڵبژاردنی گشتیدا ئەم نوێنەرانە هەڵدەبژێرێن. ئەوەی شایانی باسە ئەم جۆرە نوێنەرایەتی کردنە بەوە پاساو دراوە، کەخەڵکی وڵاتێك یاخود شارێك ناتوانێت لەشوێنێکدا هەموو جارێك کۆبکرێنەوە بۆ ئەوەی بڕیار لەسەر چالاکییە هاوبەشەکانیان بدەن. هەروەها لەوشوێنانەی کەدیموکراسی ناراستەوخۆ پەیرەوکراوە، ئەوکەسانەی کەنزیکی بارەگای کۆبوونەوەکە ژیاون زۆرتر هاتوونو بەشداریی کۆبونەوەکانیان کردووە. ئەوانەی تر، کەدوور بوون یاخود لەدێهاتەکاندا ژیاون کەم بەشداری کۆبوونەوەکانیان کردووە. جگە لەوەی، لەڕووی ئابووریشەوە زۆری تێدەچێت ئەگەر هەمووجارێك خەڵك کۆبکرێتەوە، بۆیە دیموکراسی ناڕاستەوخۆ یاخود بەنوێنەرایەتی لێ کردن لەزۆربەی وڵاتە ئەوروپییەکاندا هاتە کایەوە.

**هەڵبژاردنیش دووجۆرە:**

**یەکەمیان: هەڵبژاردنی زۆربە**(Majoritetsval).

**دووەمین: هەڵبژاردنی ڕێژەیی** (Proportionellval).

**هەڵبژاردنی زۆربە:** ئەوەی کەنیشانەی گرنگیی ئەم جۆرە هەڵبژاردنەبێت، ئەوەیە کەپارتە براوەکە بەشی هەرەزۆری(Mandat) کورسی ناو پەرلەمانی بردۆتەوە. پارتییەکانی تر بەهەمان شێوە (ڕێژەی دەنگ وەرگرتنیان) کورسی پەرلەمان وەرناگرن.

ئەم جۆرە هەڵبژاردنە بەدوو شێوە دەکرێت یەکەمیان بەیەك قۆناغ، دووەمیان بەدوو.

**أ- هەڵبژاردنی زۆربە بەیەك قۆناغ:** پارتیە براوەکە بەشی هەرەزۆری کورسی پەرلەمان دەبات هەرچەندە لە(٥٠%) کەمتریشی هێنابێت بۆنموونە هەڵبژاردنی ساڵی(١٩٢٢)لەبەریتانیا بەم شێوەیەی لای خوارەوە بووە.

| پارتی | دەنگ کورسیی پەرلەمان | |
|---|---|---|
| پارتی ڕاست(پارێزگاران) | ٣٩% | ٣٤٤ |
| پارتی کرێکاران | ٢٩% | ١٤٢ |
| لیبراڵەکان | ٢٩% | ١١٤ |
| پارتییەکانی تر | ٣% | ١٥ |

ئەگەر وردبینەوە لەچۆنێتی دابەش بوونی کورسییەکانی پەرلەمان ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کەپارتییە براوەکە لە(٣٩%)ی هێناوە کەچی ژمارەی کورسییەکانی لەپارتی کرێکارانو لیبرالیەکان پێکەوە زیاترەو لەهەمان کاتیشدا(٨٥%)ی دەنگیان بۆ دراوە.



ئەم هەڵبژاردنە لەقازانجی پارتە گەورەکانەو پارتە بچوکەکان کەمتر لەئەنجومەنەکانی پەرلەماندا نوێنەرایتی دەکەن.

**ب- هەڵبژراردنی زۆربە بەدووقۆناغ:**

ئەو دوو پارتییەی کە لەقۆناغی هەڵبژاردنی یەکەمیندا دەنگی زۆری بۆ دراوە، بەشداری هەڵبژاردنی قۆناغی دووەم دەبن، (ئەگەر یەکێك لەپارتییەکان لەقۆناغی یەکەمیندا لە٥٠% زیاتری هێنا ئەوا پێویست ناکات لەقۆناغی دووەمدا لەهەڵبژاردنەکەدا بێت).

بۆ نموونە:

| پارتییەکان | ژمارەی دەنگ |
|---|---|
| پارتی پارێزگاران A | ٤٠٠٠ |
| پارتی گەل B | ٢٥٠٠ |
| پارتی چەپ C | ٧٠٠٠ |
| نەتەوە D | ١٠٥٠ |
| رادیکال E | ٧٠٠ |
| پارتیەکانی تر F | ٢٥ |
| | ١٥٢٧٥ |

لەوڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو بەریتانیا هەڵبژاردنی زۆربە هەیە. بەیەك قۆناغ دەکرێو لەفەرەنساو ئەڵمانیاو نەرویج بەدوو قۆناغ دەکرێت. ئەوپارتیانەی کەنزیکن لەپارتی پارێزگارانەوە بەلایەنگیرانو ئەندامانی خۆیان دەڵێن دەنگ بۆ پارتی پارێزگاران بدەن. ئەوانەشی لەپارتی چەپەوە نزیکن بەئەندامانو لایەنگیرانیان دەڵێن دەنگ بۆ پارتی چەپ بدەن. بەم جۆرە پارتی A بەشی هەرەزۆری کورسی پەرلەمانی بەردەکەوێت.

لێرەدا نوێنەری پارتی (AوC) زۆرترین دەنگیان هێناوە. لەقۆناغی دووەمدا بەشدار دەبن.

بۆ نموونە ئەم دەنگدانەی لای خوارەوە وەردەگرن.

نوێنەری A ٨٢٥٠ ٥٤٪ دەنگ.

نوێنەری C ٧٠٢٥ ٤٦٪ دەنگ.

## هەڵبژاردنی ڕێژەیی

لەساڵی ١٩٩٨دا بۆ یەکەم جار لەبەلجیکا ئەم جۆرە هەڵبژاردنە هاتە کایەوە. ئێستا لەبەشی هەرەزۆری وڵاتە ئەوروپییەکاندا باوە. لەم هەڵبژاردنەدا پارتییەکان (پارتییە بچکۆلەکان) چاکتر نوێنەرایەتییان لەپەرلەماندا لێ دەکرێت‌و کورسیەکانی پەرلەمان بەگوێرەی ڕێژەی. دەنگ وەرگرتن دابەش دەکرێن. کۆمەڵێك پارتی لەپەرلەماندا کۆدەبنەوە، لەجیاتی یەکدوو پارتی (هەرچەندە لەم هەڵبژاردنەشدا کۆسپێك دانراوە لەرێگای پارتە هەرە بچوکەکاندا بۆ نموونە پارتێك لەدانیمارك ٢٪ لەسوید ٤٪دەنگ نەهێنێ بۆی نییە بەشداری پەرلەمان بێت). دابەش کردنی کورسی پەرلەمان، پەنا دەبرێتە بەر پشکی هەڵبژاردن‌و ڕێگای پرۆفیسۆر هوندت.



بۆ نموونە بەپێی پشکی هەڵبژاردن:

| پارت | ژمارەی دەنگدان | ژمارەی کورسی پەرلەمان |
|---|---|---|
| پارتی A | ١٦٠٠ | ١(٦٠٠)+١ |
| پارتی B | ١٤٠٠ | ١(٤٠٠) |
| | ٣٠٠٠ | |

ئەگەر وا دانرابێت کە٣٠٠٠ دەنگ ، ٣ کورسی پەرلەمان نوێنەرایەتی بکات ئەو ٣ کورسییە بەم جۆرە دابەش دەکرێت بەسەر پارتیAوB دا. هەر هەزار دەنگ کورسییەکی بەر دەکەوێت. پارتیA ٦٠٠ دەنگی دەمێنێتەوە، پارتی B٤٠٠، کورسیی سێهەمین دەدرێت بەپارتی A بەم جۆرە پارتی A (٢)کورسیی‌و پارتی B (١) کورسی بەردەکەوێت. ئەم جۆرە دابەشبوونە پابەندی گۆڕان، درووست بوون یاخود زیاد بوونی پارتییەکانە. ئەگەر لەهەمان نموونەی پێشوودا لەجیاتی پارتی B. پارتی Cبێتە کایەوە لەنێوانیان ئەو ١٤٠٠ دەنگە بەش بکەن، بەم جۆرەی لای خوارەوە کورسییەکان دابەش دەکرێت

| پارتی | دەنگ وەرگرتن | کورسی پەرلەمان |
|---|---|---|
| A | ١٦٠٠ | ١(٦٠٠) |
| B | ٧٥٠ | ١+(٧٥٠) |
| C | ٦٥٠ | ١+(٦٥٠) |

بەهەمان شێوە پارتی A لەهەزار دەنگی یەکەمدا، کورسییەك وەردەگرێت‌و٦٠٠ دەنگی دەمێنێتەوە سەیری بکەین پارتی B ٧٥٠ دەنگی هەیە ٧٥٠ لە٦٠٠زیاترە کورسییەکی پەرلەمان وەردەگرێت. پارتی Cدەمێنێتەوە

بەهەمان شێوە ٦٥٠لە٦٠٠زیاترە کورسی سێهەمین وەردەگرێت. لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت، ئەم ڕێگایە لەدابەش کردندا زۆرجار ڕەوا نییە. پارتی A لەهەردوو پارتییەکەی تر زیاترە، کەچی هەرسێکیان وەك یەك کورسی پەرلەمانیان وەرگرتووە. دابەش کردنی کورسی پەرلەمان بەگوێرەی بۆچوونی پرۆفیسۆر Viktor Hondts.

ئەگەر پێنج کورسی پەرلەمان بەسەر ئەم پارتانەی لای خوارەوەدا دابەشبکرێت؟ ژمارەی دەنگ وەرگرتن ئاوا دەبێت.

| **پارتی** A | **پارتی** B | **پارتی** C | **پارتی** D | **پارتی** E |
|---|---|---|---|---|
| ٧٤٩٣١ | ٣٤٧٩٧ | ٢٨٨٥٧ | ٢٤٣٨١ | ١٤٠٩٩ |
| ٣٧٤٦٥ | ١٧٣٩٨ | ١٤٤٢٨ | | |
| ٢٤٩٧٧ | | | | |

پارتی Aلەپارتەکانی تر زیاتر دەنگی هێناوە. کورسی یەکەمین وەردەگرێتو ژمارەی دەنگەکەش دابەش دەکرێت بەسەر دوودا دەبێتە (٣٧٤٦٥)هێشتا ئەم ژمارەیە لەژمارەی دەنگدانی پارتییەکانی تر زیاترە، کورسی دووەمین وردەگرێت، ژمارەی دەنگدانی (٧٤٩٣١)دابەش دەکرێ بەسەر ٣دەبێتە ٢٤٩٧٧. کورسی سێهەمین دەدرێتە پارتی B چونکە ٣٤٧٩٧ دەنگی هەیە لەهەموویان گەورەترەو ژمارەکەی دەنگدانی دابەش دەکرێ بەسەر دوودا دەبێتە ١٧٣٩٨. چوارەمین کورسی بەر پارتی C دەکەوێت، چونکە ٢٨٨٥٧دەنگی هەیەو لەهەموویان گەورەترەو ژمارەی دەنگدانی دابەش دەکرێ بەسەر دوودا دەبێتە ١٤٤٢٨. پێنجەم کورسی دەبێتە پارتیA چوونکە ٢٤٩٧٧ دەنگی لەژمارەی دەنگدانی پارتییەکانی تر زیاترە .



### چاكو خراپی ئەم دوو سیستێمی هەڵبژاردنە.

لەهەڵبژاردنی زۆربەدا پارتە بچکۆلەکان ناتوانن دەورێکی چالاك لەمەسەلەی بڕیاردانو کاروباری تردا ببینن‌و نوێنەرایەتیەکی بەهێز ناکەن. بەپێچەوانەشەوە، ئەمە لەبەرژەوەندی پارتە گەورەکانە. یەکێك لەلایەنە باشەکانی لەناو پەرلەماندا ئەوەیە، کەئەوەندە سەرقاڵیی دروست نابێت لەبڕیاردانو پێشنیارەکانداو حکومەتیش لەهەنگاوەکانیدا ڕاشکاو زاڵتر دەبێ.

### کەموکوڕی هەڵبژاردنی ڕێژەیی.

ئەگەر حکومەتەکە هەڵوێستی زۆربەی ئەندامانی نەبێ، ئەوا دەبێ هەموو کاتێك بۆ ئەوەی پێشنیارو بڕیارەکانی سەربگرن، دەبێ لایەنگیریی لایەنێك، پارتێك، یان چەند لایەکیان بۆخۆی مسۆگەر بکاتو بەلای هەنگاوەکانیاندا ڕایان کێشێ...ئەگینا نابن بە یاساو ڕاناپەڕێندرێن ...بێگومان ئەمەش دەرگای سازشکاریو ڕازیکردنی ئەم لاو ئەولا بەکراوەیی دەهێڵێتەوە.

### لایەنە باشەکانی ئەم جۆرە هەڵبژاردنە

بەشێوەیەکی بنەڕەتی لایەنە باشەکانی ئەم جۆرە هەڵبژاردنە ئەوەیە، کەپارتو ڕێکخراو لایەنە بچووکەکان دەوریان لەکارو بڕیارداندا بەهێزتر دەبێو دەتوانن لەسەرگرتن یان ڕەتکردنەوەی زۆر پرۆژەی پەرلەماندا دەورببینن. هەروەها قۆڵو بەرەی ئەوپارتیانەی، کە لەدەوری جوغزی (چەپو ڕاست)ەوەن، بەچاکی لەکاروباری پەرلەمانو ڕاپەڕاندنی بڕیارەکانیدا دەردەکەوێ.

### مافو دیموکراسیەت:

کاتێ باسی دیموکراسیەت دەکەین، یەکسەر پرسیارێك لەزەینماندا قووت دەبنەوە. ئایا دیموکراسیەت چییە؟! خەڵکەکە چۆن لەمافی دیموکراسیەت گەیشتوون؟ کێن ئەولایەنو بەشانەی کۆمەڵ، کەسوود لەم مافە وەردەگرن؟ یان چ لایەكو تۆقێك لەم مەیدانەدا بێدەنگنو جوڵەیان لێوە نایەت؟ ئایا پەیوەندییە

ئابووری‌و کۆمەڵایەتییەکان، وریایی‌و پلەو پایەی ناو کۆمەڵ‌و خێزان، چ کارێك دەکەنە سەر مافە دیموکراسیەکان؟ ئایا سیستمی دیموکراسی بەهێزەکانی ناو کۆمەڵ هێندەی تر بەهێز دەکات، یاخود چۆن؟ هەوڵ دەدەین لەمەودوا، بەگوێرەی توانا، لەم باسە بدوێین.

### دیموکراسیەتی بچوك:

ئەم جۆرە دیموکراسیەتە پەیوەندی بەتاکەکەس، یان کۆمەڵە خەڵکێکەوە هەیە، بۆ نموونە کرێکارێك بۆی هەبێت، هەندێ شت، کەپەیوەندیی بەکارەکەیەوە هەیە، خۆشی بەشدار بێت لەبڕیاردان لەسەری، وەك مۆڵەتی پشوودان، مافی پاراستنی نهێنییەکانی لەداموو دەزگاکاندا،...فەرق‌و جیاوازی لەگەڵدا نەکرێت. کۆمەڵێ خەڵك هاوبەشی راستەوخۆی ئەمەیان بۆ لواوە. لەم وڵاتەدا خەڵکەکە کۆدەبنەوەو، بەشدارن لەبڕیاردانی ئەو کارانەدا، کەپەیوەندی بە بەرژەوەندییانەوە هەیە...قسەکانیان سەنگ‌و کێشی خۆی هەیەو لەمەیانی کاردا جێ دەگرێت...بۆ نموونە لەچۆنییەتی کردنەوەی قوتابخانە، نەخۆشخانە، باخچەی منداڵان، قیرتاوکردنی رێگاوبانی گەڕەك‌و ناوچەکەیان...هتد بەکورتییەکەی ئەوەی لای تاکەکەس مەبەستەو گرنگە، کارو وەختی نەخۆشی‌و مافی نارەزایی‌و سکاڵاو رەخنە گرتنی بۆ زامن بکرێت. هەروەها ئەمەش، هەر نابێ (کاڵەك خۆر بێ) دەبێ (بێستان رنیش بێ)... ئەوئەرك‌و کارو بەرپرسییەی کەکۆمەڵ دەیدا بەسەریداو چوارچێوەیەکی یاسایی دیاری کراوی هەیە، دەبێ لێیان لانەدات‌و جێ بەجێیان بکات.

### دیموکراسیەتی گەورە

دامودەزگا سیاسییەکان ئەوانەی کاروباری کۆمەڵ بەڕێوەدەبەن، ئەم ئەرکە دەگرنە ئەستۆی خۆیان. ئەم دامودەزگایانەش، لەلایەن جەماوەرەوە هەڵدەبژێردرێن‌و چاودێری لەکارو هەڵسوکەوتیشیان دەکرێ‌و لێیان دەپرسنەوە. واتە دەبێ



دەزگایەکی کۆنترۆڵ‌و پشکنین هەبێ‌و بزانێ تا چ رادەیەك ئەمانە لەئاستی ئەو ئەرکەدان، کەهەیانەو چۆن فەرمانڕەوایی دەکەن‌و کاروبار بەڕێوەدەبەن. بێگومان ئەمەش لەوکاتانەدا دەبێ، کەهاووڵاتیان حکوومەت هەڵدەبژێرن‌و لەم مەیانەشدا ئازادیی بیروباوەڕو هەڵبژاردن هەیە. بەشداری کردنی دەنگدان بایەخێکی گرنگی لەنوێنەرایەتی کردنی جەماوەردا هەیە...بۆ نموونە لەوڵاتێکی وەك سویددا ١٠٪ کەمتر یاخود زیاتر خەڵك لەهەڵبژاردندا بەشدار نابێ‌و لە١٠٪ باوکان‌و دایکان ناچن بۆ کۆبوونەوەی قوتابخانەو خێزان‌و نازانن کاروباری قوتابخانە چۆنەو چۆن نییە، لە ٥٠٪ی کرێکاران پەیوەندیی پتەویان بەنەقابەوە نییەو هەر ئەوەیە تیایدا ئەندامن. وەك دەردەکەوێ، نزیکەی لە١٠٪ی خەڵك دەنگ نادەن‌و دوورە پەرێزی ژیانی سیاسین‌و بەواتایەکی تر بەم سستییەیان کارێکی باش لەباری کۆمەڵایەتی‌و سیاسیی کۆمەڵەکەیان ناکەن، هەروەك مانای ئەوەش دەگەیەنێ، کە لە ١٠٪خەڵك لەداموودەزگاکانی دەوڵەتدا نوێنەریان نییەو نوێنەرایەتیان ناکرێ. چالاکیی سیاسی ئەو بەشداربوونە دەگەیەنێت، کە بە چ رێگایەك بتوانێ کار بکەیتە سەر سیستێمەکە. ئەم جۆرە بەشداربوونەش شێوەی جیاواز جیاوازی هەیە، هەر لەبەشداربوونی راستەوخۆوەو بەئەندام بوون لەپارتێکدا تا نارەزایی دەربڕین‌و خۆپیشاندان‌و مانگرتن‌و لەچاپەمەنیدا نووسین.

بەشدار نەبوونی جەماوەرو سستی‌و خاویی لەم مەیدانەدا، بۆشایی ماوەی نێوان سەرکردەو جەماوەر فراوانتر دەکات. جەماوەر لەپلەیەکی پەستی بێزاریدایەو تەنانەت خەڵك وای لێهاتووە، قێزی لەناوی سیاسەتمەداران دێتەوە.

### پەرلەمان تاریزم:

نیشانە گرنگەکانی پەرلەمان تاریزم ئەمانەی خوارەوەن:

١ـ سەرۆکی وڵات (مەلیك یاخود سەرەك کۆمار)دەسەڵاتی سیاسی نییەو تەنها رەمزێکە بۆ وڵاتەکە (کاری هەر پێشوازی کردن‌و سەردانی وڵاتانە)

**٢ـ دەسەڵاتی حوکم بەڕێوەبردن بەدەستی سەرەك وەزیرو راوێژکارەکانیانەوەیە.**

**٣ـ پەرلەمان دەبێ دان بەحکومەتەکەدا بنێ‌و متمانەی پێ بکات.**

**٤ـ حکومەت (سەرەك وەزیر) مافی هەڵوەشاندنەوەی حکومەت‌و دیاری کردنی کاتی هەڵبژاردنی گشتی هەیە.**

**٥ـ دادگاکان رۆڵی سیاسیان نییە. خاڵی ٢و٣ گرنگترین نیشانەی ژیانی پەرلەمانین، بنەڕەتەکەشی خاڵی سێیەمە بەتایبەتی‌و هەر ئەویشە دەبێتە بناغەی دروست بوونی پەرلەمان تاریزم. بۆئەوەی حکومەت فەرمانڕەوایی خۆی بکات پێویستی بەمتمانەو دان پێدانانی پەرلەمان هەیە، باشتریشە ئەگەر حکومەتەکە زۆربەی پەرلەمانی لەگەڵدا بێت. هەرچەندە ئەمە مەرج نییە. بۆنموونە حکومەتی کەمینە لەپەرلەماندا زۆربەشی نییە بۆ کاروبار بەڕێوەبردن پەنا دەباتە بەر بەرەدروستکردن لەگەڵ پارتیەکانی تردا (واتە، پارتییە بەرهەڵستکارەکانی نێو پەرلەمان).**

## ئەنجومەنی میلليی سوید وەکو مۆدێلێك.

**ئەنجومەنی میلليی سوید وەکو مۆدێلێك ناسراوە، چۆن کاروباری تێدا جێبەجێ دەکرێت‌و پلان دادەنرێت‌و لەئامانجەکانی نزیك دەبێتەوە. هێزی بزوێنەری ناوەڕۆکی مۆدێلەکە، جەماوەرە. جەماوەر نوێنەرانی خۆی هەڵدەبژێرێ بۆ پەرلەمان‌و ناوچەکان‌و شارەوانی. هەروەها جەماوەر بەهۆی دەزگاکانی راگەیاندنەوەو رێکخراوە سیاسی‌و کۆمەڵایەتیەکانەوە دەتوانێ هەڵوێست‌و بۆچوونی خۆی دەربڕێ‌و کار لەرووداوەکان بکات.**






## ئەنجومەنی میلليی سوید:

**ئەم مۆدێلە بەدەنگدانی گشتی‌و ئازادیی بیروراوە بەندەو بەجۆرێك بۆ دەسەڵات دەڕوانێت کە لەنێوجەماوەرەوە هەڵبقوڵێت‌و هەروەها لەپەرلەماندا ئاوەهاش لەشارەوانی ناوچەکاندا دەبێ پیادە بکرێت. دەسەڵاتیش لێرەدا لەچوارچێوەی دەستوری سویدا دیاری دەکرێت‌و پەیڕەوی لێ دەکرێت، کەیاسا بنەڕەتیەکانی وڵات پێکدێنێت‌و بریتین لەمانە:**

**١ـ شێوازی حوکمڕانی کردن.**

**٢ـ پاشایەتی پشتاوپشت دێتە خوارەوە.**

**٣ـ ئازادی وشەو بیروڕا دەربڕین.**

**بۆئەوەی یاسا بنەڕەتییەکان بگۆڕدرێت لە٥٠٪ش بەدەر ناخواو دەبێ دوو بەشی پەرلەمان بڕیاری لەسەربدا، ئەوسا ئەوجۆرە یاسایانە بڕیاری گۆڕانی لەسەر**

دەدرێت، یاخود بەهەڵبژاردنی گشتی میللەت ئەم کارە ئەنجام دەدرێت. هێزە بزوێنەرەکانی ئەم مۆدێلە ئەمانەن:

## پارتیەکان:

بەشداربوونی هەڵبژاردنی گشتی لەرێگەی پارتەکانەوەیە. سێ ساڵ جارێك خۆیان ئامادەدەکەن بۆ هەڵبژاردنەکانو نوێنەرانی پەرلەمانو ناوچەو شارەوانییەکان هەڵدەبژێرن.

پارتەکان لەکاتی هەڵبژاردندا هەوڵی کۆکردنەوەی دەنگ دەدەن بۆ ئەمەش بانگەشەی بەرنامەی خۆیان لەگۆڕینو جێبەجێکردنی پێداویستییەکانی کۆمەڵدا دەکەن. لێرەشدا کێبڕکێیەکی دیموکراسیانەی رەخنە لەیەکدی گرتن دروست دەبێتو هەر پارتەو دەیەوێ سوودی بەرنامەی خۆی بەجەماوەر بگەیەنێو لەم پرۆسەیەشدا دەزگاکانی راگەیاندن دەورێکی چالاکیان هەیەو گفتوگۆو دەمەتەقێ لەتەلەفزیۆنو رادیۆو لاپەڕەی رۆژنامەکاندا دروست دەبێت. پارتە ئۆپۆزیسیۆنەکان دەورێکی باڵایان هەیە لەپەردە لەروو هەڵماڵینی کەموکورتی حکوومەتی پێشوو لەبیرخستنەوەی ئەو بەڵێنە درۆیانەی کەدابوونیو جێبەجێی نەکردون. پارتە سیاسیەکان پێویستیان بەپشتگیریو دەنگی جەماوەرەو حساب بۆ ئەم مەسەلەیەش دەکەن، کێ بۆچاکەو بەرژەوەندی کار دەکات. جەماوەر خۆی دەزانێ دەنگ بۆکێ دەدا. گرنگی دان بەپێداویستی جەماوەر وا لەپارتییەکان دەکات کەتاکتیكو ئامانجی خۆیان بگۆڕنو کەمتر بیر لەمەسەلەی ئێدۆلۆگی بکەنەوە، بەکورتییەکەی دەزانن پێداویستی جەماوەر چییەو ئەمان خۆیانی لەگەڵدا دەگونجێنن. شان بەشانی پارتە سیاسیەکانو رێکخراوەکانیان کۆمەڵێك رێکخراوی ئینسانیو پیشەییو نەقابی هەن، کەدەتوانن کار بکەنە سەر بڕیاردان. ئەوانە وەك مووی لووتی پارتییە سیاسیەکانو خەریکی پاراستنی بەرژەوەندیی پیشەیی خۆیانن، بۆنموونە



جولانەوەی ئازادیخوازیی کەنیسە، وەرزش، مافی ئافرەتان، نەقابەی کرێکاران، هی خاوەن کارەکانو مووچە خۆرانو .. هتد

## دەزگاکانی راگەیاندن

دوو جۆر پەیوەندی هەیە لەگەڵ جەماوەردا، یەکێکیان راستەوخۆ لەئەنجامی راوێژو گفتوگۆو قسە لەگەڵ یەکتر کردندا دروست دەبێت، ئەم پەیوەندیە راستەوخۆیە وا دەکات، کەجەماوەرو پارتە سیاسیەکان کار لەیەکتر بکەن.

ئەوی تریان پەیوەندییەکی ناڕاستەوخۆیەو لەرێگای دەزگاکانی راگەیاندنی وەکو رادیۆو تەلەفزیۆنو رۆژنامەکانەوە دەبێت. خێرایی تەلەفزیۆنو رۆژنامە شۆڕشێکی بەرپاکردووە، پارتەتییەکانو جەماوەر، بەخێرایی بیروڕاو خواستەکانیان بەیەکتری دەگەیەنن. رۆژنامە نووسیش چوارچێوەیەکی یاسایی خۆی هەیەو دەبێ بەشێوەیەکی مەوزووعی بیروڕای خۆی دەربارەی دیاردەو رووداوەکان دەربڕێتو نەکەوێتە ژێر تەئسیری هەستی شەخسیو شتی لاوەکییەوەو لایەنێکی نێو گیروگرفتو ناکۆکییەکان بگرێت، یان بەئەنقەستو بۆ مەبەست ئاوەژوویان بکاتەوە. لەڕاستیدا ئەمەش کارێکی ئێجگار ئاڵۆزو قورسە، جاری واهەیە رۆژنامەکان، بە بەکارهێنانو خستنەگەری هونەرەکەیان، کارێکی بچوكو بێ بایەخ واگەورە دەکەن، کەجێگەی سەرسامیە. بیریش لەوە دەکرێتەوە، کەزۆرترین ژمارە بفرۆشرێتو بەمەش خەڵکێکی زۆر ئاگاداری رووداوەکان دەبنو دەوریان دیارتر دەبێ، لەلابەلاکردنو چارەسەر کردنی دیاردەو کێشەکاندا.

## کاری پەرلەمانی

پێشنیارەکانی حکوومەت هەمووی لەپەرلەماندا گفتوگۆیان لەسەر دەکرێت، بۆئەوەی بڕیاری کۆتاییان لەسەر بدرێتو بخرێنە گەڕو بەگوێرەیان هەڵسو کەوت بکرێت، دەبێ زیاتر لە٥٠٪ ی ئەندامان پەسندیان بکەن.. ئەگینا رەت دەکرێتەوە. ئەمە هەر بۆحکوومەت نییە، بەڵکو بۆپارتو رێکخراوەکانی ناو پەرلەمانو دەری

حکوومەتیشە، واتە هێزە ئۆپۆزیسیۆنەکان. زۆرجار حکوومەت لەپەرلەماندا کەمینیە، بۆیە بەرەو هاوپەیمانی لەگەڵ لایەنەکانی تردا پێکدێنێ، بۆئەوەی بڕیارەکانی بخاتە چوارچێوەی یاساوە.. خۆ ئەگەر پەرلەمان لەحکوومەتی کەمینە کەوتە تەقەو سەلماندی توانای کاروباری وڵات بەڕێوەبردنی نییە، ئەوا حکوومەت هەڵدەوەشێتەوە هەڵبژاردنی تازە دەست پێدەکات.

لەم رۆژگارەدا ، کەسەرجەم ئەوروپای رۆژئاواش تووشی گەلێ کێشەو باری شلۆقو ناسەقامگیر بووە، لەوڵاتێکی وەك سویدداو بۆبەرژەوەندیی وڵاتو میللەت رزگارکردن لەکێشەی ئابووری..سۆسیال دیموکراسەکان کەئۆپۆزیسیۆنی ناو پەرلەمانو گەورەترین حیزبی ئەم وڵاتەنو نزیکەی پەنجا ساڵێك حوکمی وڵاتیان کردووە، وازیان لەکۆمەڵێ بۆچوونو بینۆگەی سیاسیی خۆیان هێناو لەگەڵ حکوومەتی پارێزگارانو بورژواکاندا پرۆژەیەکی رزگارکردنی ئابووریی وڵاتیان داڕشتووە.

باری ئافرەت لەسویددا لەرۆژگاری کۆنەوە تاسەردەمی نوێ

ساڵی ١٨٤٥ ئافرەت مافی ئەوەی هەبووە کەهەمان بەشی میراتی وەربگرێ.

١٨٥٨ کچێك کەشووی نەکردبێو تەمەنی ٢٥ ساڵ بووبێت حسابی باڵقی بۆکراوە.

١٨٥٩ ئافرەت مافی ئەوەی هەبووە بخوێنێو ببێ بەمامۆستاو کاری مامۆستایی بکات،

١٨٦٤ یاسا لێدانی ئافرەتی قەدەغە کردووە.

١٨٧٤ کچێك کەشووی نەکردبێو تەمەنی ٢١ ساڵ بووبێت مافی هەبووە کە بەباڵق بژمێردرێ.

١٩١٩ ئافرەت هەقی دەنگدانی دراوەتێ .

١٩٢١ ئافرەتی شووکردوو حسابی باڵقو کامڵی بۆکراوە.



١٩٣٥ ئافرەت وەکو پیاو مافی تەقاویتی هەبووە.

١٩٣٩ ئافرەتی سك پڕ دەرناکرێت لەسەر کارەکەی هەر لەبەر ئەوەی سکی پڕە.

١٩٤٧ یارمەتی مانگانە بۆمنداڵی بڕدراوەتەوە.

١٩٥٨ ئافرەت بۆی هەبووە ببێ بەقەشە .

١٩٧١ لەکاتی جیابوونەوەدا ئافرەت هەقی ئەوەی هەبووە لەگەڵ پیاوەکەیدا ماڵەکە بکەن بەدووبەشەوە.

١٩٧٩ نەمانی جیاوازی نێوان پیاوو ئافرەت لەگشت روویەکەوە.

ئەم نموونەیە ئەوە دەردەخات، کەچۆن پەرلەمان چالاکییە کۆمەلاّیەتیو سیاسیو ئابوورییەکانی بەڕێوەبردووەو بڕیاری لەسەرداوە. سەردەمی نوێ خۆی لەخۆیەوە نەهاتۆتە کایەوە، لەسەرخۆو وردە وردە بەکاری پەرلەمان رەگی گۆڕانی خۆی داکوتاوە. بەم جۆرە دابەشکردنیو رێکردنەوەو کەم کردنەوەی جیاوازییەکانی نێوکۆمەڵ تاوەکو نێو شارەوانیەکان(دەوڵەمەندو هەژارەکان)ی کەمکردۆتەوە، لەرێگەی باجدانو یارمەتیو زامنکارییە کۆمەلاّیەتییەکانی ترەوە.

## کارگەو دامودەزگا دەوڵەتییەکان

دامودەزگای خزمەتو ئەرکی گشتی بەجێگەیاندن، ساڵی ١٩٠٠، لەسوید ١٠٪ ی بوودجەو داهاتی نەتەوەیی بۆتەرخانکرابوو. ئێستاکە نزیکەی ٥٠٪ی داهاتی نەتەوەیی بۆدانراوە.

بەشی زۆری ئەم دامودەزگایانە لەکاروبار راپەڕاندنو ئەنجامدانی بەندەکانی یاساو نهێنی پاراستنو بەرووبوم بەرهەمهێنانو کار بۆخەڵك دۆزینەوەو خزمەتگوزاریی گشتیدا۔ سەربەخۆبون. لەچوراچێوەی یاسادا ناوچەکان خۆیان دەتوانن ژیانی خۆیان رێکبخەنو گیروگرفتەکانیان چارەسەر بکەن، ئەمەش مانای ئەوەیە، لەسەرەوە فەرمانو ئەمریان بۆنایە بۆجێبەجێ کردن، بەپێچەوانەوە خۆیان فەرمان دەردەکەن. واتە دەسەلاّتی ناوەندیو مەرکەزی دەبێتە لامەرکەزی.

## شارەوانی خۆبیوونو بەڕێوەبردن

لەسوید جەماوەر لەسێ جێگاوە دەتوانێ کار بکاتە سەر سیستێمی سیاسی. لەئاستی دەوڵەتدا لەڕێگەی پەرلەمانەوە. لەئاستی هەرێمدا بەهۆی ئەنجوومەنی هەرێمەوە. لەئاستی ناوچەدا شارەوانی ئەنجوومەنی خاوەن دەسەڵاتە، کەبەرپرسی بڕیاردانی بەشی هەرە زۆری چالاکییە کۆمەڵایەتییەکانن. بەم ڕێگایانە جەماوەر دەتوانێ لەرۆژی هەڵبژاردنی گشتیدا نوێنەرانی خۆی هەڵبژێرێو کاری خۆی مسۆگەر بکات.

**شارەوانی:**

دەوڵەتێکی بچووکی سەربەخۆی لەدووبەش پێکهاتووە، یەکێکیان بەشی سیاسیەو ئەوی تریان دامودەزگای بەڕێوەبردنە. شارەوانییەکان خۆیان بڕیار دەدەن چەند کەس ببێتە ئەنجوومەنی دەسەڵاتداری شارەوانی، ئەگەر دانیشتوان ١٢٠٠٠ کەس بێت ئەوا ئەنجوومەنەکە لە٣١ کەس پێکدێ. ئەنجوومەنی شارەوانی (وەکو حکوومەتی شارەوانییەکە وایەو ئەندامانی ئەم ئەنجوومەنە تەنها لەهی ئەو پارتانەیە کەپێکەوە بردوویانەتەوەو زۆربەیان لەنێو ئەنجوومەنی دەسەڵاتداریەتی شارەوانیدا هەیە، بۆنموونە لەو سی‌ویەك کەسە پێنج کەس هەڵدەبژێرێت کەدەبنە ئەندامی ئەنجوومەنی شارەوانی).

ئەو پێشنیارانەی کەئەم ئەنجوومەنە دەیخاتە بەردەستی ئەنجوومەنی دەسەڵاتدار دەبێت لەنێویاندا زۆر بەنهێنی جێبەجێ بکرێنو بڕیاری لەسەر بدرێت. ئەنجوومەنی شارەوانی هەڵسورێنەری ئەو بڕیارانەیە کەئەنجوومەنی دەسەڵاتدار بڕیاریان لەسەر دەدات. لێرەدا دەبێت ئەوە روون بکرێتەوە، کەیاسای کۆمەڵایەتی بۆسەرانسەری وڵات وەك یەك وایەو گۆڕان لەم ئەنجوومەنانەدا ناکرێت.

لەژێر ئەو دامودەزگایانەوە کەبۆ بەڕێوەبردن هەن دوانزە دائیرەی بچووك هەن، کەهەرلایەنی بەرپرسی شتێکە. بۆنموونە یارمەتیدانی کرێی خانوو، یارمەتی



بەپارەی منداڵ، دائیرەی زامنکردنی کۆمەڵایەتی، قوتابخانە، باخچەی منداڵ بیرۆی کاردۆزینەوەیە. بۆجێبەجێ‌کردنی کارو ئەرکە گشتیەکان، شارەوانی پێویستی بەپارە هەیە، پارەی مووچەخۆری هەیە، لەکوێوە ئەم پارەیەی بۆ کۆدەبێتەوە، هەر دانیشتوویەك کەداهاتی هەبێتو لەسنووری شارەوانییەکەدا بژیو ناونوس کرابێ نزیکەی٣٠٪ی (ئەم نیسبەتە لەکەم بوونو زیادبووندایەو پەیوەندیی بەداهاتەوە هەیە) لەمووچەکەی دەبڕن. جاری واش هەیە هەندێ شارەوانی توانای دارایی نییە، کەپێداویستیەکانو ئەرکی سەرشانی جێبەجێ‌کاتو لەڕێگای کۆمەك کردنی دەوڵەتەوە یاخود قەرزکردنەوە وەزعی خۆی چارەسەر دەکات.

### ئەرکی سەرشانی دەوڵەتو شارەوانی

### هەندێ لەئەرکەکانی دەوڵەت:

ـ دەستوور . . . . دابەش کردنو بەرانبەرکردنی داهاتی خەڵك.
ـ چاودێریکردنی دامودەزگاو کارگە دەوڵەتییەکان، کەراستەوخۆ لەلایەن دەوڵەتەوە بەڕێوەدەبرێن.
ـ بەرگریکردن.
ـ سیاسەتی دەرەوە.
ـ هێمنیو ئاسایش، پۆلیس، دادگا.
ـ باجدان.
ـ سیاسەتی ئابووری.
ـ توێژینەوە سەبارەت بەخوێندنی باڵا.
ـ کاردۆزینەوە بۆ کرێکاران.
ـ ڕێگاو بان.
ـ پەیوەندی هاتوو چۆکردن(تەلەفۆن، پۆست، فرۆکە، شەمەندەفەر).
ـ زامنکردنی کۆمەڵایەتی.

ـ كارگە دەوڵەتیەكان.

هەندێك لەئەركی سەرشانی ئەنجوومەنی هەرێم:Landsing

ـ بەڕێوەبردنی كاروباری هەرێمەكە. (لەلایەن ئەنجوومەنی هەرێمەوە).

ـ بەڕێوەبردنی لەلایەن حكومەتی هەرێمەوە. نەخۆشخانە، نەخۆشخانەی دەرون چارەسەركردن. یارمەتیو كۆمەك كردنی ئەوانەی كە لەرووی لەش یان عەقڵەوە پەككەوتەن، یارمەتی كۆمەڵایەتی وەكو نەسیحەت كردنی خێزان.

**هەندێ لەئەركی سەرشانی شارەوانی:**

*دامودەزگای بەڕێوەبردن.

*دەزگای كۆمەڵایەتی چارەسەركردنی ئەلكهولیستو كۆمەكی كرێ خانوو .. هتد.

*پاككردنەوەی شەقامەكانو كۆكردنەوەی زبڵو پیسایی.

*وەرزش، كولتوور، پلان، جادەوكۆڵان، باخچەكان.

*یارمەتیدانی خانوو و ژیان بۆ ئەو كەسانەی كەداهاتو دەرامەتیان نییە.

*ئاسانكردنی هاتوچۆكردنی پیرو پەك كەوتە.

لەجێبەجێ كردنی ئەركی سەرشانیاندا، هەر لایەنێكیان بگرێت دەبێت بەپێی یاساو پەرەگرافەكان دەستەڵات بەكاربهێنی (ئەمە ئەو بەكارهێنانی دەستەڵاتە دەگرێتەوە كەموچەخۆرێك لەكاتێكدا وەكو نوێنەری دامودەزگایەك پیشەی ئەبێت لەخزمەت كردندا، ئەگەر ئەم مووچەخۆرە كارێك جێبەجێ بكات، ئەوا ئەركی سەر شانییەتیو پێویستی بەسوپاس كردن نییە. دەزگای راگەیاندنو رێكخراوە پیشەییەكان رۆڵێكی گرنگیان هەیە، وەكو دەزگایەكی كۆنترۆڵكردنو یارمەتیدەری دانیشتوان لەپەیوەندی كردندا بەدامودەزاگاكانەوە. دەسەڵات جێبەجێكردن دوو رووالەتی جیاوازن، یەكێكیان دەسەڵاتی وەزیفەكە خۆیەتی ئەوی تریان دەسەڵاتی شەخسییە. واتە كابرایەكی مووچەخۆر بۆی نییە هەستو نەستی شەخسیی خۆی



تێكەڵ كارەكەی بكات. زۆر جاریش ئەم كارو پیشانە هۆكاری تری ئینسانی وایان تێدەكەوێ، كەهەروا ئاسانو روون نابێت، بۆ نموونە خەمڵو مەزەندە لێدان، كەزۆر جار كورتی دێنێ. شارەوانییەكان زۆرجار بۆ راپەراندنی كاروبارو پرۆژەكانیان دەستی یارمەتیو هاوكاری بۆیەكدی درێژ دەكەن.

**سیستێمی ئابووری لەسوید**

سیستێمیكی تێكەڵاوە لەبازاڕی ئازادو ئابووریی پلان بۆ كێشراو. مەبەست لەئابووریی ناو بازاڕ ئەوەیە كەنرخی بەرهەمەكان لەبازاڕدا دیاری دەكرێتو ئابووری پلان بۆكێشراو دەزگاكانی سەرەوە (بۆنموونە دەوڵەت) نەخشەی بۆ كێشاوەو بڕیاری لەسەر داوە. (كارگەكان بەپێی نرخی بازاڕ كەلوپەلیان دەفرۆشنو خزمەتە گشتیەكانیش لەسەرەوە نرخیان بۆدانراوە). خزمەتی كۆمەڵو كاروبارە گشتیەكان بەچاوی قازانجەوە بۆیان ناڕوانرێتو بەجۆرێكی یەكسان بەگشت لایەكی وڵاتدا دابەش دەبێت. بۆنموونە لەهەر شوێنێك بژیت یارمەتی نەخۆشخانە، پیرو پەككەوتە، بێ ئیشی، پەیوەندیو هاتوچۆكردن مسۆگەركراون. ئەم جۆرە چالاكییە ئابوورییە كە لەسەرەوە پلانی بۆكێشراوە رۆڵێكی ئابووریی كۆمەڵایەتی دەبینێو ئابووریی بازاڕ دابین دەكات. لەپێویستیەكانی: ئەم دووجۆرە ئابوورییە خاڵی یەككگرتنیان زۆرە، بۆنموونە لەنێوان كارگەو كرێكارانداو پیداویستیە كۆمەڵایەتیەكان وەكو باخچەی منداڵان، رێگە بۆكرێكاران ئاسان دەكات چ پیاو بێ چ ژن كەئیش بكاتو منداڵەكەی كاتی ئیش كردن لەباخچەی منداڵان بێ. ئەم دامودەزگا دەوڵەتییانە پێداویستی (بەرهەم) لەیەكتری دەكڕنو بازنەیەكی ئابووریی جوولاو لەنێوانیاندا دروست دەبێت، كەهێزی بەرهەمهێنانی كارگەكان زیاددەكات.

ـ كاتێك بەرهەمی كارگەكان دێتە بازاڕەوە خەڵك دەیكڕێ. پارەكە بەقازانجەوە دەگەڕێتەوە گیرفانی كارگە. پارەی كرێكارو كولفەتی بەركارهێنانی لێدەدات.

لەقازانجەکە کاری تازەی لێ دەبێتەوە. دامودەزگاکان شت بەیەکتری دەفرۆشن، حکوومەت بەشارەوانی لەشارەوانی بۆ هەرێم، لەم دەزگاوە بۆ ئەو دەزگا، لەم کارگەیە بۆ ئەوکارگە لەم گیرفانەوە بۆئەو گیرفان یاخود بە مانایەکی تر لەم بانك بۆ ئەوی تریان.

## لەوبازنە ئابوورییە ئەم وزانە دێتە ناوەوە

| | |
|---|---|
| ئەوانەی کەدەچنە دەرەوە | ئەوانەی کەدەچنە ناوەوە |
| پاشەکەوت کردن | خستنە کارو رەنیوهێنان |
| هاوردن | هەناردن |
| باج دان | ئەو کەلوپەلانەی کە لەلایەن کارگەو دامودەزگا گشتیەکانەوە دەکڕدرێن |

ئەوەی کەبزوێنەری ئەم بازنەیە بێت توانای کڕینی خەڵکەکەیە ئەگەر توانای کڕین بەرزبێت ئەوا بەئاسانی خەڵکی دەتوانێ کەلوپەلی دەرەوەی وڵات بکڕن لێرەدا چوونە دەرەوە بۆ دەرەوەی وڵات زۆرتر دەبێت بۆئەوەی کەئەم توانای کڕینە نزم بکرێتەوە تۆیژاڵێك(باج) پارەی زیادە لەسەر کەلوپەلی بێگانە دادەنرێت (بۆنموونە ئەگەر بچیت بۆبازاڕ بەرهەمێك بکڕی بە١٠٠ کڕۆن، خۆی لەوانەیە بە٨٠ کڕۆن بێت ئەو پارە زیادەیە دەچێتە گیرفانی دەوڵەتەوە). نیسبەتی پارەی زیادکراو لەسەر ئەو کەلوپەلانەی کەهی وڵاتن جیاوازە لەئەوانەی کە لەدەرەوە دێن، هەروەها دانانی مەرجی سەخت لەکاتی قەرزکردنی بانکدایە. ئەگەر توانای کڕینی خەڵکی نزم بوو ئەوا دەوڵەت جاری واهەیە کار ئاسان دەکات مۆمس(تۆیژاڵێك باج) یاخود باج کەم دەکاتەوە، دانی قەرز ئاسان دەبێت،. بەم جۆرە توانای کڕینی خەڵکی بەرزدەبێتەوە.



## پەیوەندی کرێکارو نەقابەی کرێکاران و خاوەن کارگە

Rehn و Meidners: دوو ئابووری ناسی سەر بەسۆسیال دیموکراتبوون. مۆدیلێکی ئابووریان هێنایەکایەوە بە نێوی (رین میدنەش) ئەم مۆدێلە چەند بۆچونێکی چارەسەرکردنی کێشەکانی سیستێمە ئابوورییەکەیە، بۆ نموونە هی بێکاریو هەڵاوسانی دارایی، بەلای ئەم دوو ئابووریناسەوە مسۆگەرکردنی کار بۆگشت دانیشتوانو وەستانی بەرزبوونەوەی نرخی کەلوپەل بەدووجۆر چارەسەر دەکرێت.

یەکەمیان: ئەوەیە کەنوێنەری نەقابەکان داوای زیادکردنی مووچەی کرێکاران نەکەنو کرێکاران گیانی لێبوردنیان بۆیەکتری هەبێت. بەم جۆرە رێگە لەبێکاری دەگیرێو گیرفانی خاوەن کارگە پڕتر دەبێتو قازانجەکەش دەخرێتە گەڕو کاری تازە دێتە کایەوە.

دووهەمیان: زیادبوونی مووچەی کرێکاران بەستراوە بەرادەی گەشەکردنی بەرهەم هێنانو دۆزینەوەی بازاڕەوە بەنیسبەتێك زیاد بکات بۆیان. ئەگەر ئەم زیادبوونە کۆسپ نەبێت ئەوا مووچەی کرێکاران بەکورتییەکەی ئەم مۆدێلە بەردەوامە تاکو خاوەن کار (کارگە) دەوڵەمەنتر نەبێتو قازانجی زیاتر ناکات، ئەوا مەترسی بێکاری دروست دەبێت، چوونکە خاوەن کار سەرمایە ناخاتە گەڕ. بۆیە پێویستە نوێنەرانی نیقابە ئەمەیان لەبیر نەچێت لەکاتێکدا راوێژیان لەگەڵ دەکەن.

### سیاسەتی مووچەی هەرەوەزی solidariska LoNepoliteken:

ئەو کەسەی هەچ کارێك بکات ئەوا عەینەن مووچە وەربگرێت. ئەمە کۆسپدانانە لەڕێی کرێکاراندا، کەبۆیان نەبێت بەئاسانی رووبکەنە ئەو کارگانەی کەمووچەی زیاتر دەدەن، چونکە رێگە نادەن بەوەی کارگەکان بەزەوقی خۆیان مووچە دابەش بکەن. ئەو کارگانەی کەتوانای گیرفانیان ئەوە نییە کەمووچەی زیاتر بدەن بەکرێکارەکانیان، ئیمکانی ئەوەی هەیە کرێکارەکان رووبکەنە ئەو کارگانەی

کەپارەی زیاتر دەدەن (بەکورتییەکەی سیاسەتی مووچەی هەرەوەزی بەشی ڕێگای جوولانی هێزی کارە لەهەرلایەك بێت، دەوڵەتی یاخود تایبەت) ئەمەش لەوانەیە ئیفلاس بەو کارگانە بکاتو بێ کاری بخاتە ناوەوە. لێرەدا دەبێت ئەوە بخرێتە روو پارەی ئەو وەختانەی کەناوەختە زیاترە لەپارەی ئەو وەختانەی کەئاساییە، جیاوازیی هەیە لەپارەی شەو یاخود کاتی پشوو لەگەڵ کاتی ئاساییدا.

زۆر جار باسی ئەوە دێتە ناوانەوە، کەچۆن و لەسەر چ بناغەو پرنسیپێك سۆسیال دیموکرات سیستێمی ئەم وڵاتەی دامەزراندووە؟ ئەوا ئاشکرایە داهێنانو بەرەوپێشەوە چوون لەکاروبار بەڕێوەبردندا کزو لاواز دەبێ، چونکە بوونی چەند پارتێك، خۆی بۆخۆی پێداویستی پەرلەمانو گفتوگۆو پەیوەندیی نێوان پارتەکانو دەمەتەقێی دیموکراتیانەی کاروباری وڵات دێنێتە کایەوە. بۆیە بوونی چەند پارتێك لەهەموو حاڵەتێکدا چاکترە لەبوونی تەنیا پارتێك، بائەو پارتە خودی سۆسیال دیموکرات خۆشی بێت، گومان لەوەشدا نییە، پارتەکانی تریش هەر لەچەپەوە هەتا راست رۆڵی گرنگیان لەرێکخستنو بەرەوپێشەوە بردنی باری وڵاتدا هەبووە. بۆ نموونە ئەگەر دەوڵەمەندەکانی سوید سەرمایەکانیان لەگەڵ خۆیاندا بەرنە دەرەوەو نەیانەوێت لەسویددا بیخەنە گەڕ، لەبەرئەوەی قازانجی زیاتریان لەوڵاتەکانی تردەست بکەوێت، چی لەسویددا روودەدا؟ کاتێك کابرای سەرمایەدار سەرمایەی زۆرتر دەبێو قازانجی چاك دەکا، ئەو بیر لەوەدەکاتەوە لەپرۆژەی تردا، سەرمایەکە بخاتەگەڕ، کار زۆرتر دەبێت، باجی شارەوانی زۆردەبێت، (داهاتی زۆردەبێت)و واتە توانای کڕینی خەڵك زیاد دەبێتو سیستێمەکە دەبوژێتەوە. پارەخستنەگەڕو کاردۆزینەوە دوولایەنن لەهەمان شتو بەیەکتریەوە بەستراونو یەکێکیان بێ ئەوی تریان ناتوانێ گەشە بکاتو ببوژێتەوە. بەمانایەکی تر ئەم سێستێمەی کەئەمرۆ لەسویددا هەیە ئەنجامی هەوڵو تێکۆشانی گشت لایەنەکانە، نەك هەر تەنیا سۆسیال دیموکرات.



## چوونە ناوەوە ـ سیستێمە ئابوورییەکە ـ چوونە دەرەوە

ئەگەر سیستێمەکە هەرلێی دەرچێت ئەو زوو بەتاڵ دەبێتەوەو (هەڵدەوەشێتەوە) بەمانایەکی تر زۆربەی کارگەکان ناتوانن تەحەمولی بێ کەرەسەی خاو بکەنو لەهەمان کاتدا هەقدەستی کرێکارو بەکارهێنانی هێزی کار بدەن، یاخود کەرەسەی خاوو هێزی کارئەوەندە هەرزان بێت هەر بچێتە ناو سیستێمەکەوەو لێی دەرنەچێت، ئەوا بارێکمان بۆدێتە کایەوە، کەسیستێمەکە نزیکی خنکاندن دەبێتەوە. ئەگەر هیچی تێنەیەتو لێی دەرنەچێت ئەوا سیستێمەکە لەجوولان دەکەوێت.

سیاسەتی ئابووریی سوید پەیوەندییەکی راستەوخۆی بەناردنە دەرەوەو سەرمایە خستنەگەڕی بازاڕی جیهانەوە هەیە. ناردنە دەرەوەیش زیاد بێو هاوردن کەم بێت، دیسانەوە کێشە دروست دەبێتو هەموو گۆڕانێك لەنێو سویدو دەرەوەیدا کار دەکاتە سەر سیستێمە ئابوورییەکە. ئەگەر بێتو سەرمایە خستنەگەڕیش کەم بێتەوە ئەوە نیشانەی ئەوەیە کەئیتر قازانجی زۆری تیا نەماوە. بەمانایەکی تر لەوانەیە کارگەکان چالاکیی بەرهەم هێنانیان کەم بێتەوەو خەڵکێکی زۆر لەکار دەربکرێت. گۆڕانو گەشەکردنی ئابووریو تەوازن کردنی، بناغەی مافە دیموکراتییەکانو کاروباری گشتی ئەو خەڵکەیە، بۆنموونە یەك کەس کەبێکار دەبێت رۆژی ٦٠٠ کرون دەکەوێت لەسەر کاروباری گشتی(بەمەرجێك ئەگەر لەهیچ لایەكو ئەندامی نەقابە نەبێت) . بەکورتییەکەی بۆئەوەی مافە دیموکراتییەکان نەکەونە مەترسییەوەو تواناو وزەیان هەبێتو لەمسۆگەرکردنیاندا سیاسەتی دەست گرتنەوە نەیەتە کایەوە دەبێ سیستێمەکە لەبووژانەوەدا بێت، بەمانایەکی تر لێی بچێتە ناوەوە بەهەمان شێوە لێی بچێتە دەرەوە، واتە بەشێوەیەکی زیرەکانە هاوکێشیی سەرمایە خستنە گەڕو کاروبارو خزمەت گوزارییە کۆمەڵایەتییەکان دابین بکرێ.

## کەمو کووڕیی سیستێمە ئابوورییەکە

ـ هەموو شتێك لەسەر بناغەی قانزاجکردن دادەڕێژرێت، کۆمەڵ زۆر هەڵو دەرەفەتی لەکیس دەچێت، کەپێویستەو خەڵك بەدواییدا دەگەڕێن.

ـ گیرگرفتێکی تر بوونو بڵاوبونەوەی بێکاریو کێشە کۆمەڵایەتییەکانی ترە.

ـ کاتێك باری ئابووری ئاڵۆز دەبێتو تووشی کێشە دەبێت، کەرەسەی بەرهەمهێنان، کەمتر بەکاردیو کرێکار بێکار دەمێنێتەوەو دەردەکرێن. چارەنووسی کرێکار بەقانزاجی کارگەکەوە بەندە، چەندێ مەترسی لەوەزعی کارگەکەدا هەبێت، ئەوەندەش کرێکار مەترسیی لەدەس دانی کارەکەی ـ مایەی ژیانی هەیە.

ـ واتە، سیستێمەکە هەر ئەوەندە مافە دیموکراتییەکان دەپارێزێ، تا قانزاج بەرکەمال بێ، ئەگینا ئیتر پێشێل کردنی گران نییە. مانگرتنو هەموو جۆرە چالاکییەکی پیشەیی تر دەبێ نەقابە نەخشەی بۆبکێشێو ئەویش دوای سەرنەگرتنی گفتوگۆی نەقابەو خاوەن کار.

ـ هۆکارێکی تری هاوکێشو سەنگ راگرتنی ئەم سیستێمە، هەناردەیە، چەندێ شت بنێردرێتە دەرەوەو بازار هەبێ، هێندەش دامەزراوی لەسیستێمەکەدا پتەوتر دەبێ.

ـ لایەنی ئەخلاقی هێندەی بایەخ پێ نادرێ، لەکاتی دانانی بوودجەو داهاتی نەتەوەییدا. بۆنموونە ئەگەر یەکێك ئوتومبیلەکەی بدزریو زامنی کردبێ، ئەوا بڵێین سێ هەزار کرۆن وەردەگرێتو ئەمەش دەبێتە زیادەیەك لەبوودجەی نەتەوەییدا، یان یەکێك لەپیاوێکی پیر بدا بەئوتومبێلو کابرا سێ مانگ لەنەخۆشخانە بکەوێ، ئەوا بوودجەی٨ـ٧ ملیۆن زیاد دەبێت. بەکوورتییەکەی دامودەزگاکان سەوداو مامەڵەیان لەگەڵ یەکدی هەیە.



## سیستێمی کۆمەڵایەتی

کۆمەڵ هەمیشە هەوڵی کەمکردنەوەی گیروگرفتەکان دەداتو کار بۆ خۆشگوزەرانیو ژیانی چاکی ئەندامەکانی دەکات. شارەوانییەکان هەنگاوی لەم بابەتە دەنێن. ئەگەر یەکێك لەکارەکەی دەربکرێتو ساڵێك ئەندامی نەقابە بووبێت، ئەوا پارەی ساڵێکی بێکاری وەردەگرێت. (زۆرجار کەخەڵك بێکار دەبنو لەناو چوار دیوارێکدا دادەنیشن، سەری دنیایان لێ دێتەوەیەكو پەنادەبەنە بەر خواردنەوەو بەنگکێشانو گەلێ شی تر ...ئەمەش کوشندەترین نەخۆشیی ئەم کۆمەڵەیەو جگە لەرووە ناحەزە کۆمەڵایەتییەکەی، دەبێتە مایەی زیانی دارایش، چونکە تەنیا رۆژێکی چارەسەرکردنی ئەم جۆرە نەخۆشانە(٣)هەزار کرۆنی تێدەچێت. ئاشکرایە خەڵك لەکاتی کارکردندا باج دەداتو کەتووشی ئەم جۆرە حاڵەتانەش دەبێ، پارەکەی خۆی دەوردەبینێ لەیارمەتیدانیدا ، بۆیە ئەم جۆرە لایەنانە حیسابی قانزاجو زیانیان تێدا ناکرێتو بەشێکی زۆری ئەو یارمەتیە لەسەر کۆمەڵ دەکەوێ.

لێرەدا بەئاشکرا دەردەکەوێ، کەخەڵكو سیستێمەکە توندوتۆڵ بەیەکەوە بەستراون، هەرەها ئەوەش نابێ لەیاد بکەین، کەکۆمەڵ یاساکانی خۆی بەسەر ئەندامانیدا دەسەپێنێ، پەیوەندیی خێزانو منداڵ بەخێوکردنو... هتد بۆنموونە ئەگەر خێزانێك، بەهۆی ناکۆکیو ناتەبایی دایكو باوك، یان ئەلکهولیستو نەخۆشی لەم بابەتانەوە نەیانتوانی وەك پێوەیست منداڵ بەخێوبکەن، ئەوا لەسەرتادا هەموو جۆرە هەوڵێکی ئەوە دەدەن، کەدەستیان بگرن بۆرزگاربوون لەو بارەی تێی کەوتون. خۆ ئەگەر کار گەیشتە ئەوەی، لەمنداڵ بدەنو سەرچەنگو سزای بدەن ئەوا دەزگا کۆمەڵایەییەکان منداڵەکەیان لێ دەسەننو تەنیا هەقی ئەوەیان دەبێ مانگی یەك دووجار بیانبینن. هەموو منداڵێك مافی لەباغچەی منداڵانو قوتابخانە وەرگرتنی هەیەو، دەبێ رێزی لێ بگیرێتو لەرووی لەشو دەروونەوە چاودێری بکرێو ئەزییەت نەدرێت.

## پیرو پەككەوتەكان

شارەوانی لەو پیرو پەككەوتە تەنیابالآنە بەرپرسە، كەلەناو چوار دیواردا تەمەنی پیری‌و تەنیایان بەسەردەبەن. زۆرجار لەشتومەك كرین‌و بازاركردندا یارمەتی دەدەرێن، یان لەهاتووچۆكردندا پارەی تەكسی یان نایدەن، یان شتێكی رەمزی دەدەن.

## خێزان

شارەوانی، ژیان‌و گوزەرانی ئەو خێزانانە مسۆگەر دەكات، كەبێكارن‌و ئەم كۆمەك‌و یارمەتیەش ئەوەندەیە كەژیانی خێزانێك لەهەموو روویەكەوە دەگرێتەوەو لەهیچیان كەم نابێت. خێزانەكە، ئەگەر لای وابوو، كەهەقی تەواوی نەدراوەتی، دەتوانێ رەخنە لەبڕیارەكانی شارەوانی، یان دەزگای كۆمەلآیەتی بگرێت‌و سەیری سكالآكەشی دەكرێت‌و ئەگەر یاسا رێگەی دا، هەقی بۆدەگێڕدرێتەوە. هەروەها كەسانێك ، كەمەترسییەك هەڕەشەیان لێ دەكات، یان مرۆڤێك كەبەجارێ لەبەردەم خواردنەوە، یان تلیاك‌و بابەتەكانی كێشاندا بەچۆكدا هاتووە مەترسی هەیە ژیانی خۆی كۆتایی پێ بهێنێ، یاسا هەیە، كەئەو جۆرە كەسانە بەزۆری دەخاتە نەخۆشخانە، یان خانووی خزمەتكردنی تایبەتییەوە، بۆ دۆزینەوەی چارەسەر بۆیان، لەم رووەوە چەندین یاساو خاڵ هەیە، كەمافی تەنیا كەس‌وكۆمەڵ دەپارێزێت.

## نهێنی پاراستن

هەموو فەرمانبەرێك بەرپرسە لەپاراستنی نهێنی ئەو كەسانەی، كەپەیوەندیی كاروبارو باریان پێوە هەیە، نابێ نهێنییەكە ئاشكرا بكرێ، كەدوور نییە، كەسێك لەڕووی دەروونییەوە یان هەربابەتێكی ترەوە زیانی لێ بكەوێت. ئەگەر كارێكی وا روویدا، ئەوا فەرمانبەرەكە دەبێ هەقی بدا بەو كەسەی، كەبهێنیەكەیی فاشكردووە. بەبێ رەزامەندیی كەسەكە خۆی هیچ جۆرە نهێنییەك نابێ ئاشكرابكرێت (بێجگە لەیاسا ناچارییەكان، كەگوێ بەم مەسەلەیە نادەن).



## رەخنەگرتن‌و نارەزایی‌و سكالآ

لەو دەزگا كۆمەلآیەتییانەو تەنانەت لەدادگاكانیش مرۆڤ بۆی هەیە رەخنەبگرێ‌و بڕیارەكانیان رەت بكاتەوە، ئەگەر لای وابوو نارەوان.

## بڕیارو مافە دیموكراسیەكان

دەبێ پێداویستی دانیشتوان چ لەرووی مەرجەكانی ژیانی رۆژانەوە، وەك زامنكردنی هاتووچۆكردن‌و گەرمكردنی خانووو ئاوو كارەباو...هتد تا پاراستنی مافی تەنیا كەس‌و ئازادیی هەڵبژاردنی ئەلتەرناتیڤە چاكەكان‌و هەروەها هەوڵدانی كەم كردنەوەی جیاوازی چینایەتی لەنێو ئەندامانی كۆمەڵدا ـ مسۆگەر بكرێت‌و ئەمەش لەچوارچێوەی سیاسەتە ئابووری‌و كۆمەلآیەتییەكاندا هەوڵ دەدرێ، چارەسەر بكرێت.

ئەگەر ئەم بڕیارانە ناوەڕۆكیان دیموكراسیانە نەبوایە نەدەتوانرا ئەو هەموو هەنگاوە گەورانە بنرێن لەمەیانی كەمكردنەوەی جیاوازی نێوان شارو دێهاتدا، كە لەسویدا دەتوانرێ بوترێت تەقریبەن نەماوە. پۆست‌و بانك‌و نەخۆشخانەو هەموو جۆرە خزمەتگوزارییەكی تر دابین كراوە، تەنانەت لەحاڵەتی نەخۆشی‌و كاری پێویست زوو راپەڕاندندا، نەك هەر تەكسی، بەڵكو هەلیكۆپتەر بەكار دەهێنرێت.

## كۆمەك كردنی تر

یارمەتی خێزانی خاوەن منداڵ دەدرێت، بۆ نمونە جگە لەهەندێ پارە، كەبۆ منداڵەكە مانگانە دەبڕدرێتەوە، یارمەتیی كرێ خانوو و گەلێ لایەنەكانی تری ژیان دەدرێن .. هەروەها لەكاتی نەخۆشیدا یان لەدەرمان كڕیندا، بۆ نموونە، كەدەچیتە لای دكتۆر نەوەد كرۆن هەقەكەیەتی، ئەگەر سالێكیش لەنەخۆشخانە بكەوێت‌و دووسێ عەمەلیاتیش بكەن، هەرهەمان نەوەد كرۆن دەدەی .. چونكە حكومەت لەو پارەیە دەیدا، كە لەكاتی ئیشكردندا لەمووچەی خەڵكەكە دادەشكێنرێت.

هەروەها شارەوانی بەرپرسی رەخساندنی باخچەی منداڵانو هەموو کاروبارێکی تره، کەپەیوەندی بەمنداڵەوە هەبێت، ئەمیش یەکێکە لەو مەرجە گرنگانەی، کەخێزان بەشداریی پرۆسەی دیموکراسی دەکات.

### مافی پاراستنی کار

یەکێك کە کارێکی لەدەست دەچێت (بەمەرجێك کەخاوەن کار کرێکارەکە دەرکات، یان هەر هۆیەکی تری گونجاو)، ئەوا خاوەن کار دەبێ مووچەی ٦ـ١٢ مانگی بۆ ببڕێتەوە. یان قاسەی بێکاری لەم رووەوە دەتوانێ یارمەتی بێکار بدات و ٩٠٪ی مووچەکەی تا ساڵێك دەداتێ.

### خوێندن

هەموو کەسێك دەبێت نۆ ساڵ لەقوتابخانەدا بخوێنێ، ئەوانەشی، کە لەرووی عەقڵ یان لەشیان نوقسانە، یان بە هەر هۆیەکی ترەوەبێ، ئاسایی نین، قوتابخانەی تایبەتو مامۆستای شارەزایان بۆ دەگیرێت، هەتا پێداویستییەکانیان زامن بکرێت.

### کار

هەرکەسێك لەکارکردندا بەشداری بڕیارو چالاکییەکانی کۆمەڵ بێت، ئەوا بەشداری پرۆسە دیموکراتییەکانی ناو کۆمەڵە. خەڵك هەرجۆرە کارێکی هەبێت، پێی شادمانەو باجی خۆی دەدات. لێرە جۆری کار دەوری نییە لەرێزگرتنی خەڵکدا، رەووتی کارکردنو ئیش لێرە شێوەیەکی تری هەیە. کار هەر کارەو وەکو یەك سەیری دەکرێت، ئەوەندەش باسی خزمەتو شتی لەم بابەتە ناکەن.. کاردەکەیتو لەباتی ئەوە پارەو پاداشت وەردەگرێ.



### شارەوانی

ئەو دێهاتانەی دوورن، لەکاتی گواستنەوە، یان هەناردنە دەرەوەی بەرهەمەکانیاندا، تەنیا سەرو پەنجا کیلومەتر کرێی گواستنەوە دەدەنو ئەوی تری دەوڵەت دەیدا.. جگە لەمەش دەوڵەت بەزۆر شێوەی تر، کۆمەکی جوتیاران دەکات.

### هاتوچۆکردن

لێرە نەخشە بۆ کاری هەموو شێوەکانی هاتوچۆکردن کێشراوە... مرۆڤ دەزانێ، کەی شەمەندەفەر دەڕوا بۆ شارەکان، کەی پاسەکان دەچن .. هەمووی خشتەیان هەیە. ئەمەش دەبێتە هۆی وەخت مانەوە بۆ خەڵكو هەڵپەو قەڵەباڵغیی نەکردن . نرخی بلیتو چۆنییەتی کڕینو دەستخستنیان دیاریکراوە.

### هاوینەکار و مەشق کردنو راهێنان

ئەو لاوانەی دەخوێنن، هاوینان کاریان دەدرێتێ.. ئەوانەشیان، لەبیستو پێنج ساڵ کەمتربن، ئەوا لەمەیانێکی تردا کارێکی پراکتیکیان بۆ دەدۆزرێتەوە. وەك وترا، ئەوانەی بێکارن، تا کاریان بۆ دەدۆزرێتەوە بیرۆی کاردۆزینەوە مووچەیان دەداتێ.

### خانوو

دانیشتوان بەگوێرەی گەورەو بچووکیی خێزانەکانیانو رادەی داراییان داوای خانوودەکەن. ئەگەر خێزانێك منداڵێکیان هەبێت، ئەوا لەفلاتێکی سێ ژووریدا دەژین. ئەم خانووانەش زستانان گەرم دەکرێنو هەموو دەمێك ئاوی گەرمی هەیەو کارەباو ...هتد.

### هەندێ زامنکاریی تری کۆمەڵایەتی

ژیانی ئادەمیزاد لەهاتووچۆو کاروئاگرتێبەربوونو ...هتددا. زامنکراون.. مرۆڤ دەتوانێ ـ ئەگەر بیەوێ ـ ماڵی خۆی زامن بکات.. هەروەها تەقاویتی زیاتر

مسۆگەر بکات.. بە کورتییەکەی، مافە دیموکراسیەکانە، کە کەسانی لاوازی ناو کۆمەڵ دەپارێزێت..

## توێژاڵی باج

کاتێك ئەو باجەی هاووڵاتیان دەیدەن، بەشی زامنکردنی پرۆگرامی دەوڵەت ناکات، لەرەخساندنو هێنانەکایەی ژیانێکی باشدا بۆ خەڵك، دەوڵەت ناچار دەبێ، پارەیەك بخاتە سەر نرخی خواردنو شتو مەك، ئەمیش زیاتر بۆ پشتگیری کردنی پرۆژەو بەرنامەی خزمەتی کۆمەڵایەتیو ژیانی خەڵکەکەیە.

## راستو دروستیی بڕیارەکان

راستو دروستیان لەوەدایە، ئەگەر دامو دەزگاکانی دەوڵەتو ناوچەو شارەوانییەکان توانییان هاوکێشیی بوودجە رابگرن، ئەوا مانای سەرکەوتنو باشی نەخشە کێشانیانە، خۆ ئەگەر کەلێنو کەموکورتیی کەوتە بوودجەو دوایش هەڵسوڕاندنی کاروبارەوە، ئەوا نیشانەی کورت بینیو هەڵنەسەنگاندنی بارودۆخەکەیە.

## هەندێ سەرئەنجام

خەڵك بەشێوەی جیا لەدیموکراسیەت دەگەنو بۆچوونیان جیاوازە. دیموکراسیەتیش لەئەنجامی کاردا، دەبێ بۆ چارەسەر کردنی گیروگرفتەکانی ناو کۆمەڵگا بێت. هەندێ کەس وای بۆ دەچن، کەمرۆڤ چی ویستو چی بەخەیاڵو عەقڵیدا هات بێ گوێدانە ئەنجامی کارشکانەوە بیکا .. جا ئەگەر لەکۆمەڵێکدا، ئازادیی راشکاو و موتلەق هەبێ، بەم شێوەیەی وتمان.. ئەوا کار بەکوێ دەگا،؟! بۆ نموونە بازرگانو قەسابو دادوەرو مامۆستاو پۆلیسو رۆژنامەنووسو کرێکار چی زەوقیان دەگرێ وا جموجووڵ بکەنو لەوە نەگەن، کەتەنیا ئەوانو بەرژەوەندی ئەوان لەو ناوەدا نییە و.. رەنگەو ئەو دەستەی ئەوان بەخەیاڵ بەهەوای ئازاددا



رایدەوەشێنن، لووتی یەکێکی نزیکیان بئانگوێ.. ئەوا جگە لەئاژاوەو بگرە شوێنێکی ئەنجام بۆش زیاتر چیدی سەوز نابێ.

## بەرژەوەندی جیاواز

ئاشکرایە کۆمەڵ لەخەڵكو چینو توێژاڵی جیاجیا پێکهاتووە. هەندێکی نزیك بەیەکنو هەندێکی دژ.. جا لەکۆمەڵگادا، ئەگەر یاساو لێ پرسینەوەیەکی عادیلانە نەبێو دەسەڵاتدار ملی لاواز بادا، ئەوا دەبێ دیموکراسیەت لەهەڵدێری گلۆر بکەینەوە.. بۆ نموونە گیروگرفتەکانی کۆمەڵ یان پەیوەندی نێوان خەڵكو توێژاڵی جیاجیا.. رەوتو، میکانیزمی تایبەتیی خۆیانیان هەیەو هەموویان نابێ بەیەك چاو سەیر بکەینو لەیەك چوارچێوەدا چارەسەریان بکەین.. چونکە ئەوە چارەسەرکردن نابێت.. لەم کێشەو ناکۆکییانەشدا بەرژەوەندی دەور دەبینێ. دەتوانین بۆ روونکردنەوەی ئەم رایەی دەرمان بڕی نموونەیەکی زۆر ساکاری ژیانی رۆژانەی خەڵك بە بەڵگە بهێنینەوە. هاتووچۆی ناوشار.. رەنگە لەسەرەتادا سادە لەوحانە بێتە پێش چاو. بەڵام با بزانین چۆن دەبێ.. چەند لایەن پەیوەندییان بەم گیرو گرفتەوە هەیە.. شۆفیرەکان، هەندێ کەسی پاسکیل ڕان، ئەوانەی پیادەن ـ خەڵکەکە.. شۆفیرەکان بۆ ئەوەی شەقامو ڕێو بان هەراوبێ، داوای کەم بوونەوەی قەڵەبالغیو زۆرکردنی شوێنی ئوتومبیل دەکەن، دووچەرخەدارەکان ـ داوای جادە باریکەلەیەکی تایبەتی، پیادەکان داوای زۆرکردنی شوێنپەڕینەوەو دەرفەتی هاتووچۆی خۆیان دەکەن .. ئەگەرهەربەکەو ئیسترەم لەسەر داوای خۆی کوتو مت بکات،.. ئەوا ناگەنە ئەنجام، دەبێ چارەسەرێك بدۆزرێتەوە، کەرەچاوی بەژەوەندی هەموو لایەك بکرێت ...... ئیتر لەم جۆرە نموونە ساکارانەی ژیانی رۆژانەی خەڵکەوە بیگرە، تا دەگاتە مەسەلە ئاڵۆزو قورسە کۆمەڵایەتییەکانو هەمووش لەژێر چەتری سیستەمێکدا کۆبوونەتەوە، سائەو سیستێمە دیموکراسی یان فاشی ـ

نازی بێ سیستێمەکە بەگوێرەی بینۆگەی خۆی کاروبار ڕێکدەخا.. جا مەسەلەی باشیو خراپی ئەم سیستێمە ئەوە ژیان دەریخستوونو سەلماندوونی.

## سیستێمی فاشی نازی

مۆسۆلینی ساڵی ١٩٣٢ لەگۆڤاری "فاشیزم" دا نووسیویەتی، فاشیزم وەك ئیدیاڵێك وایە، کەدژی بیری دیموکراسیە چ وەك تیۆریو چ وەك پراکتیكو لەبناغەوە رەتی دەکاتەوەو بەربەرەکانێی دەکات. فاشیزم باکی بەدەنگی زۆربەی خەڵكو جەماوەر نییە ئەوان، کەدەنگیان زیاتر بوو، مانای وا نییە لەسەر هەقنو راستن ودەتوانن کۆمەڵ بەڕێوەبەرن. دەوڵەتی دیموکراسی ئەو رژێمانە دەگرێتەوە، کە لەراستیدا سەربەخۆنین. ئەو رژێمەی، کە بەلێهاتوویی راستەقینەی کەسانی خاوەنی هێزی نەناسراوەوە بەڕێوە دەبرێت. هیتلەر لەکتێبی تێکۆشانی مندا .. وتویەتی ئەرکی سەرشانی دەوڵەتی نەتەوەییە، کەسەرکردایەتی هەڵوەشێنێتەوەو دەسەڵاتییان لێ بسەنێتەوەو کەنارگیریان دەکاتو بەواتایەکی تر، لەجێگەی زۆربە، کەسانی سەر باشقەو سەرتەڵو هەڵبژاردە دەور ببینن... هیتلەرو مۆسلینیو سەدام حسەین خەڵكو میللەتیان بەخۆیانەوە گرێداوە .. واتە هەستو چێژو بیروڕای ئەوان چۆنە، دەبێ میللەت بەگوێی ئەوان بکات .. نەك ئەوان بەگوێی میللەت .. ئەم جۆرە کەسانە چۆن پەیدا دەبنو بەملیۆنان کەس دەخەنە ژێربارو رکێفی خۆیانەوە، لەکوێی ئەو کۆمەڵەوە پەیدا بوون؟ ئایا خەسیەتی کۆمەڵەکە خولقاندوونی، یان چۆن؟! ئەی چۆن تاقە کەسێك دەتوانێو هەرچی بوێو بەخەیاڵی نەخۆشیدا بێت بیکات. بینێرێ بۆ جەنگ ئیمڕۆ، سبەینێ بۆ شتێکی تر... چۆن ئاوا بۆی دەلوێو ماوەیەکی زۆریش دەبێ بەسوڵتان قەرەقوشی رۆژگارو سەردەمی خۆی! ئەمانە هەمووی پرسیارنو دەمەتەقێو نوسینی زۆریان دەربارە هەیەو لەپرینسیپی ((دەووری تاكو کۆمەڵ لەمێژوودا)) دا خەست بۆتەوە.



## دەوری دابونەریت

زۆر جار باسی ئەوە دەکرێت. کەخەڵکی رۆژهەڵات بەدیموکراسیەت نامۆنو زەمینەی ئەم بیرە لەرۆژهەڵاتدا کرێنو بێپیتە. ئەگەر دیموکراسیەت میراتگری هەبووایە، دەبوایە یۆنانی ئیمڕۆ، کەدووسەد- سێسەد ساڵێك پێش لەدایك بوونی مەسیح ئەنجوومەنی دیموکراسییانەی هەڵبژاردنو کاروباری کۆمەڵ رێکخستنی هەبووە، بەهەشتی دیموکراسیەتو نموونەو سەرباشقەی ئەم سیستێمە بوایە .. یان عیراقی زێدی حامورابی، کەبۆیەکەمین جار لەمێژووی مرۆڤایەتیدا یاسای هاوبەشی دامەزراند. دەبوایە کوردستانە ستەمدیدەکەی خۆمان، کەبێشکەی یەکەم شارستانێتی مێژووی مرۆڤەو بۆ یەکەم جارو شەش هەزار ساڵ پێش لەدایك بوونی مەسیح ئافرەت تۆوی رووەكو شینایی کۆکردۆتەوە چاندوویەتی.. ئیمرۆ لوتکەی شارستانییەت بوایە.. ئەگەر بەم شێوەیە لەدیموکراسیەت بگەین، بمانەوێو نەمانەوێ، بیروڕاکانمانو هەڵوێستمان دەبێتە ئاو بەئاشی ئەو دیکتاتۆرانەدا کردن کەئیمڕۆ وڵاتەکانی رۆژهەڵاتیان لەخەڵکەکەی کردۆتە زیندانی گەورەو دۆزەخ.

چۆن دەتوانین داوای دیموکراسیەتو ژیانی ئازادی لەمیللەتێك بکەین، کەسەرەتاکانی ئەم بیروباوەڕەی تێدا نییە، بچووکترین مافی مرۆڤایەتیی تێدا پێشێل کراوە. بۆ نموونە دەستوور، کەیەکێك لەکۆڵەکە هەرە سەرەکییەکانی دیموکراسیەتە نییە، یان بەو جۆرەیە، کەدەسەڵاتدار مەبەستییەتی، یان هەر مەرەکەبی سەر پەڕەی کاغەزە. شەقو زەبرو زەنگ، چاو سورکردنەوەو کوشتنو بڕین بووە بەیاساو دەستوور. ئەو سیستێمە هەرەمییە (لەسەرەوە بۆ خوار) بووە بەئایاتی بەیینا تو نابێ کەس لێی لادا، بەجۆرێك رەگی لەناو کۆمەڵدا داکوتاوە، کەهەڵکێشانو بنبڕکردنی هەروا ئاسان نییە.

لەم جۆرە دەورو بەرەشدا هەرکەس خۆی دەناسێو دەزانێ چۆن رەفتار دەکاتو لەو جوغزەی بۆی دیاریکراوە ئاودیو نابێ. (ئەم جۆرە رەفتارو ژیانە تایبەتە

بەئاژەڵ‌و گیان لەبەرانی ئاوەزادا سنوردار). ئەم جۆرە سیستێمانە هەموو دەسەڵاتێکی سیاسی‌و ئابووریيان خستۆتە چنگی خۆیان‌و لەناویەکدا بەشی دەکەن. نزیك بوونەوەو بەرزبوونەوەش هەروا گاڵتە نییەو دەبێ چەردەیەکی باش لەدڕندەیی‌و نائینسانییەتی خۆت پیشان بدەی.. ئەوانەی فەرمانڕەوای عیراقن، ئەگەر قەدەر هەڵی دانایەتە کۆمەڵگایەکی دیموکراسی وەك سویسرا، سوید... هتدەوە کەپلەوپایە تا رادەیەکی زۆرو بەرچاو بەزیرەکی‌و وردی‌و ئارەقی ناوچاوان‌و رەنجی بێ وچانەوە دروست دەبێت ئەوا بێ گومان کۆمەڵی خەڵکی نەخۆش‌و تاوانکارو.. نەفرەت لێکراو دەبوون .. بۆیە نابێت چاوەڕوانی چیی لەوە باشتریان لێ بکەی! هێز کە لەسەرەوە بۆخوارەوەیەو هیچ رەوت‌و پرۆسەیەکی دیموکراسی لەناویاندا جێگەی نابێتەوەو پووچ دەکرێتەوە.

لە وڵاتێکی وەك سویددا، مافی دیموکراسیانەی خەڵك لەتوانای هەڵبژاردن‌و بڕیارو یاسا دانان‌و ئەرکی سەرشان جێ بەجێ کردن‌و سوود لەدەوڵەمەندی‌و سامانی وڵاتەکەدا خۆی دەنوێنێ.. پەرلەمان کەنوێنەرانی میللەتی تێدایە یاساو دەستووره کۆمەڵایەتییەکانی دادەنێ. وەك وترا ئەمەش خەباتێکی بەکاوەخۆو دوورو درێژی بۆ کراوە. هەروەك لەو نموونانەی لەمەوپێشدا لەباسی بەرەوپێشەوە چوونی مافی ئافرەتدا لەنێوان ساڵانی ١٨٤٥ـ ١٩٩٢ دا هێنامانەوە. هەروەها باسی چۆنیەتی هەڵبژاردن‌و دەوری دەزگاکانی راگەیاندن کران، کە چ دەورێکیان لەپرۆسەی دیموکراسیەت‌و ژیانی پەڕلەمانیدا هەیەو باسی لەبەرژەوەندیی جیاوازیی خەڵك‌و پارت‌و رێکخراوەکان کراو چۆن ملکەچی شەرعییەتی هەڵبژاردن‌و دەنگ دانی خەڵکن.

بەکورتییەکەی دەورو جێگەی مرۆڤ لەسیستێمی دیموکراسیدا ئاسمان‌و رێسمانە لەچاو هی فاشی‌و رەفتار فاشیدا، کەتەنیا مەنتیقی ((شەق دەزانێ قۆناغ



لەکوێیە)) پەندی هەرە پیرۆزییەتی .. بەپێچەوانەشەوە لەدنیای دیموکراسیەتدا دەرفەتی هەڕاوی قەناعەت بەیەك کردن‌و گفتوگۆی هێمن‌و دروستکەر باوە..

جا لەبەر ئەوەی لەکۆمەڵانی دواکەوتوودا، زۆرجار هەندێ پێوانەی وا دەور دەبینێ، کەخوودی کەسەکە خۆی بۆی لواوە یان نەلواوە.. بۆ نموونە دەوری بنەماڵەو ناوو شۆرەت، کەبۆ هەندێك دەبێ بەخێرو بێر، یان بەپێچەوانەوە.. یان هەندێ شت دەبێ بەمۆدەو باو.. بۆ نموونە بوون بەدکتۆر یان ئەندازیار.. کەشەهادەو مەهادە دەبنە پێوانە .. لەکۆمەڵگای پێشکەتوودا گرنگ ئەوەیە مرۆڤ کارێکی هەبێ.. ئەگەر سیاسەتی ئابووری لەسەر سەرمایە خستنە گەڕ بوەستێ، دەبێ ئەندامانی کۆمەڵ هاریکاری ئەم نەخشەیە بکەن، چونکە سیستێمی باج، کە لەئەنجام دا بەقازانجی کۆمەڵ دەشکێتەوە، دەبێتە هۆی بووژاندنەوەی ژیانی کۆمەڵەکە.. بەڵام ئەگەر هاتوو سیستێمێکی ((هەرکەس بۆ خۆی بێت)) و کەس ئەرکی سەرشانی جێ بەجێ نەکاو هەر لەبەرژەوەندی تەسکی شەخسی بگەڕێ، ئەوا تواناو مەودای بەرەو پێشەوە چوونی ژیانی کۆمەڵ تەسك دەبێتەوەو ئەمەش کار دەکاتە سەر لایەنەکانی تری ژیانی تاکە کەس‌و دەرفەتی جۆراوجۆری لەبەردەمدا نامێنێ‌و کەئەمەش خۆی لەخۆیدا دەبێتە رازی بوون بەوەی هەیە..

سیستێمی ئابووری نەخشە بۆ دانراو، کە بەناوی بەرژەوەندی زۆربەی گەلەوە سەپێنرابوو .. یان زۆر جار بەندو باوی ئەوەی بۆ بڵاودەکرایەوە، کەمیللەتی سۆڤیەت هەمووی یەکسانەو وەك یەك دەژی، لەوێ‌و لەوڵاتەکانی تری ئەورووپای رۆژهەڵاتدا، ئەم عەقڵییەتە فەرمانڕەوا بوو، بۆیە شەق‌و شەلاق‌و سیستێمی تاکە حیزبی چیتر نەیتوانی خۆی راگرێ‌و بەوەی ئەمڕۆ شکایەوە .. بۆیە هەروا ئاسان نییە لەو وڵاتەدا، کەقەد تەقلیدێکی دیموکراسی تێدا نەبووە، کۆمۆنیست‌و کاربەدەستەکانی تا دوێنێ قەوانی دیکتاتورییەتی پرۆلیتاریایان لێ دەدا.. ئیمڕۆ ببنە دیموکراتێکی دوو ئاتەشی پەڕگیر.. هەر بۆیە ئێستەش لەوێ ڕوویەکی تری

مەسەلەکە لەئارادایەو شوولّ لیّ هەلّکیّشانو دەمارگیری بەجۆریّکی ترو بەناویّکی ترەوە دەکریّت.

لیّرەدا دەمانەویّ لایەنیّکی تری پرۆسەی دیموکراسی باس بکەین، کەرەخنە گرتنە.. بیّگومان رەخنە گرتنیش لەسای ژیانی دیموکراسیو یان نادیموکراسیدا جیاوازە. لەمەی دوواییاندا ئەگەر دەرفەتو ماوای هەبیّت، ئەوا هەر لەو سنورەدایە، کەدەسەلاّتی سەرەوە دیاری دەکات.. بەلاّم لەهی دیموکراسیدا شەقلّیّکی زیاتر بابەتیو قانزاج لەبەر چاوگری دەبیّ.. خۆ ئەگەر لەجیهانی هونەرو نووسیندا لەم باسە بکۆلّینەوە، ئەوا لەکۆمەلّگا دواکەوتووەکانی وەکو ئەوانەی لای خۆماندا، رەخنە مانای شەرِەجنیّو، یان هەر لایەنی خراپ باسکردنی بەرهەمیّك دەگریّتەوە.. کەئەمە خۆی دژی چەمکی رەخنە گرتنە، کەپیّویستە هاریکارو دەسگری نووسەر، هونەرمەندو خویّنەریش بیّت، لەهەمان کاتدا. یان جاری وا هەیە، سرف پەیوەندی شەخسیی ئەم جۆرە کارانە هەلّدەسورِیّنیّو، یان دەبیّت بەمۆزیقەو نەقارِەی مەتحو پیاهەلّدان، یان دەهۆلّی بەدناوی.

## دوا وتە

لەکۆتایی ئەم وتارەدا دەمەویّ بلّیّم، کە بەشیّوەیەکی فراوان زیاتر باسی هەندیّ چەمکی سەرەتاییو بنەرِەتی دوو جۆر سیستیّم کرا، کە لەنیّوانیاندا بابەتی وا هەن، نەهی ئەملانو نە هی ئەولا.. بەلّکو ئەم دیاردە کۆمەلاّیەتیانە ئەوەندە ئالّۆزو بەیەکدا چوون، کەزۆرجار لەچوارچیّوەی یەکیّك لەم سیستیّمانەدا سەریان بەئاسانی لیّ دەرناکریّتو دەرِژیّنە ناو یەکەوە. بەتایبەتیش لەو ولاّتانەدا، کەتازە بەتازە بەرەو دنیای دیموکراسیەت هەنگاو دەنیّن..

نموونەی هەرە دیاری ئەم دیاردەیەش هەلّبژاردنی پەرِلەمانی کوردستانە، کەمایەی شانازیو سەربەرزی نەتەوەیەکی ژیّر دەستەو ئازادی بەخۆوە نەدیوە.. هەموو کەمو کوورِییەکانی سروشتین، هەرچەندە نابیّ لیّیان بیّ دەنگ بین.. ئەمە



نوقتەی گواستنەوەیە.. دەسەلاّت لەدەستی چەند سەرکردەی حیزبیّکەوە بکەویّتە دەست دەزگایەکی فراوانتر، کەخەلّکەکە دەنگی بۆ داون.. هەروەك ئەرکی سەرشانی هەموو کوردیّکی دلّسۆز بە ولاّتو میللەتەکەیەتی کەچی دەتوانیّ بۆ پشتگیری بیکات، ئاواش هی هەموو ئازادیخوازیّکی جیهانو هی ناوچەکەیە،.. کەئەمە بەدیاردەیەکی میّژوویی دەگمەن لەقەلّەم بدا..

**بۆ نووسینو ئامادەکردنی ئەم باسە، ئەم سەرچاوانەم بەکارهێناوە:**

Birqersson Bengt Owe / Westertahl Torgen “Den Uddevalla.،svenska Folk Sty- relsen”. 1987

، 1979،Gustafsson Agne. Kommunal sjlav styrelse Lund.

،Ejvegard Rolf. “Vad ar demokrati”. 1991 Stockholm.

Mathiesen Thomas. “Den dolda disciplineringen”. Goteborg.،1985

Goteborg.،Petersson Olf “MAKT”. 1991

Soder Karin MM. Battre Samhalle tryggare manniskor.

Par-Erik och Gustafsson Agne. “Modern Stockholm.،demokrati”. 1980

Barrinqton Moore Jr. “Demokrati och dikatatur”. Stockholm.،1971

Stockholm.،Eklund Allan. “Var ekonomi”. 1990

Delander Lennart / Edebalk per. “Samhallets Kristanstads.،ekonomi”. 1979

Axelsson Roger och Kari och Lars--Gunnar. “Den svenska arbets Marknads politiken under 1900- talet”. Stockholm.،1983

،Bohman Gosta. “Kors mot Framtiden”. 1981 Stockholm.



Norstrom Carl och Thenved Anders. “Nya Social Stockholm.،Lagarna”. 1990

Wahlstrom och Widstrad. “Barnens rattigheter”. Stockholm.،1991

Intervjue med Eva Stenstrom. “System vetenskap”.

# دەسەڵات MAKT

**" لەهەر جێگایەک زیندەگیم بەرچاوکەوتبێ، خواستم بۆ دەسەڵات تێدا بینیووە"**

**فردریك نیتشه**

دەسەڵات لەوشەیەکی لاتینییەوە وەرگیراوە بەنێوی POSSE، ئەویش مانای بەتوانایی دەگرێتەوە.

دەسەڵات حەقیقەتێکی کۆمەڵایەتییەو گرنگییەکی سەرەکی لەگۆڕانو گەشەکردنو کارتێکردندا هەیە، بەشێکی هەرە زۆری مێژووی مرۆڤایەتی ململانێکردنو ناکۆکیی نێوان خاوەن دەسەڵاتو بێدەسەڵات بووە. بەکارهێنانی دەسەڵات رۆڵێکی گرنگی لەدابینکردنی پێداویستییەکانی مرۆڤایەتیدا هەبووە. نەخۆشی، کارەسات، جەنگ نەیانتوانیوە رێگا لەدەسەڵاتی داهێنان بگرن. کولتووری مرۆڤایەتی لەئەنجامی بەکارهێنانی دەسەڵاتەوە دروستبووە.

دەسەڵات: پەیوەندیی کردنی کەسێك، گرووپێکە لەگەڵ کەسانی دی‌و، گرووپەکانی دیکەدا.

شێوەی پەیوەندی لەگەڵ یەکتربەستن جۆری سیستمە کۆمەڵایەتییە کە دیاری دەکاتو، لەفۆرمی جیاوازدا خۆی دەنوێنێ، بۆ نموونە دەسەڵاتی ئایدیۆلۆگی، ئابووری، ئایینی، دەسەڵاتی پارەو پول، دەسەڵاتی شارەزایی‌و لێهاتوویی،



دەسەڵاتی خێزانو برادەرایەتی‌و خۆشەویستی، دەسەڵاتی فیزیکی (چاو سوورکردنەوەو لێدانو کوشتن)، دەسەڵاتی شاراوە. لەرژێمێکدا کەتەنیا پارتێك، یاخود تاکە دکتاتۆرێك حوکمرانی دەکا: بەکار هێنانی دەسەڵات ئیجبارکردنە، لەرژێمێکی دیموکراتیشدا لەسەر یاساو لێهاتوویی‌و شارەزاییە.

دەسەڵات، لەهەر سیستێمێکدا بێت، بزوێنەری پرۆسێسی ژیانەو، کەم کەسیش هەیە دان بەوەدا بنێ کەعاشقی دەسەڵاتەو بەشوێنیدا وێڵە.

پەیوەندییەکانی نێوانمان لەململانێ کردنو، بەیەکگەیشتنو، گفتوگۆکردنو باسکردن ئامرازێکن بۆ هێنانەدی خواستە تایبەتییەکانمان کەدەسەڵات رۆڵێکی گرنگی تیادەبینێ‌و، هەر کەسیشمان بگریت بەئاسانی دەستبەرداری دەسەڵات نابێت‌و نایەوێت برابەشی زۆر بێت.

بۆ باسکردنو شیکردنەوەی تەوەرەی دەسەڵات پەنا دەبەینە بەر بینینە سیکۆلۆگی‌و سۆسیال سیکۆلۆگی‌و سۆسیۆلۆگی (کۆمەڵناسی)یەکان.

**بۆچوونی دەروونی (سیکۆلۆگی):**

دەسەڵات توانابوونی گرووپێك/ کەسێك لەسزادانی یاخەڵاتکردنی گرووپێك/ کەسێکی ترە. دەسەڵات رۆڵی دەزگایەکی کۆنترۆڵکردنی پەیوەندییەکانی نێوانمان دەگێڕێت. بۆ نموونە لەهەڵبژاردنی هەڵسوکەوتەکانماندا ئەو هەلانەی کەهەڵیان دەبژێرین لەژیانماندا چارەنووسمان دیاری دەکەن، لەوڵاتێکی دیکتاتۆریدا چەندێك لەپارتی پێشڕەوەوە، یاخود لەسەرکردەوە، نزیك بیت، ئەوەندە خەڵات وەردەگرێ، یاخود بەپێچەوانەوە.

گرنگی دەسەڵات لەبەکارهێنانەکەیدایەو، زۆربەی زۆری رەخنەگرەکانی ئەم سەردەمە کەسەبارەت بەدەسەڵات دەدوێن مەبەستیان بەکارهێنانەکەیەتی، کە بەهەزاران شێوەی جیاواز دەردەبڕدرێت ئەمەش لەچوار گرووپدا کۆدەکرێنەوە:

### أ-بەكارهێنانی یاسایی و ئەخلاقییانەی دەسەڵات.

مەبەست ئەو دەسەڵاتەیە کە لەلایەن دامودەزگاکانی کۆمەڵەوە بەکاردێت لەجێبەجێکردنی ئەرکی سەرشانی خۆیان و هاووڵاتیاندا. بۆ نموونە، ملکەچکردنی هاووڵاتیان بۆ کارە هەرەوەزیی و هاوبەشەکان، وەك دانی باج، کەم کەس هەیە بەرەزامەندی و دڵخۆشییەوە نیوەی موچەکەی خۆی سەرفکات لەکارە هەرەوەزییەکاندا کەلەوانەیە رۆژێك لەرۆژان پاداشتی بدرێتەوە. بەکارهێنانی دەسەڵات بەم شێوەیە دابینکردنی کاروبارو رێکخستن و دابەشکردنی دادپەروەرانەی پێداویستیەکانە بەسەر کەس و گرووپە لاوازەکاندا، وەك کۆمەککردنی پیرو پەککەوتە، گیروگرفتی کۆمەڵایەتی، نەخۆشی، بێکاری.. هتد. سەمتی بەکارهێنانی ئەم دەسەڵاتە لەکەس ودەستەکانی سەرووی کۆمەڵەوە ئاڕاستەی کەس و دەستەکانی خوارتر دەکرێت.

### ب ـ بەکارهێنانی نایاسایی و ئەخلاقییانەی دەسەڵات:

زۆربەی زۆری رواڵەتە کۆمەڵایەتییەکان، راپەڕین و خۆپیشاندان و مانگرتن، هەوڵ و تێکۆشانێکە بۆ بەهێزکردنی دەسەڵاتی گرووپەکانی خوارووی کۆمەڵ. سەمتی بەکارهێنانی ئەم دەسەڵاتە لەکەس و دەستەکانی خوارەوە ئاراستەی کەس و دەستەکانی سەرووتر دەکرێت. ئەمەشە بۆتە هۆی ئەوەی کە لەرووی یاساییەوە بەناقانوونی لەقەڵەم دەدرێ و کۆسپی لەرێگادا دادەنرێت، هەرچەندە لەرووی ئەخلاقییەوە بەکارێکی پیرۆزو رەوا دادەنرێت و حسابی بۆ دەکرێت. بەکارهێنانی دەسەڵات بەم جۆرە دەبێتە هۆی شێواندن و تێکدانی ئەو هاوسەنگییەی کە لەنێو پەیوەندییەکانی کۆمەڵدا پەیدا بووەو، نەك هەر لەدەوڵەتە دیکتاتۆرییەکاندا بەتوندی بەرپەرچ دەدرێتەوە، بەڵکو لەدەوڵەتە دیموکراتیەکانیشدا چەندین کۆسپی یاسایی بۆ دانراوە، لەبەکارهێنانی مافی رەخنەو نارەزایی دەربڕین و مل بۆ نەدانەدا بەلای کەمەوە یەك دوو ساڵی دەوێت بۆ ئەوەی بگەیتە ئەنجام. کرێکارێك بەبێ



رەزامەندی نەقابەکەی ناتوانێ خۆبەخۆ مانبگرێت لەکارەکەی. هەروەها هەر خۆپیشاندانێکیش دەبێت پێشتر مۆڵەتی لەپۆلیس بۆ وەرگیرابێت و شوێن و کاتی بۆ دیاری کردبێت و پۆلیس رێنمایی بکات (کۆمەڵێك گەنجی کورد لەسوید لەکاتی رەوەکەدا، بەبێ ئاگای پۆلیس و خۆبەخۆ پەلاماری باڵیۆزخانەی عیراقیان داو ویستیان بیگرن، لەئەنجامدا هەموویان چەند هەفتەیەك گیران.)

بەکارهێنانی دەسەڵات بەم شێوەیە لەبەرژەوەندیی گرووپە بێهێزەکاندایەو، هەوڵدانێکە بۆ کارکردنە سەر گۆڕانی دەسەڵاتی باو (باڵا دەست).

### ج ـ بەکارهێنانی نایاسایی و نائەخلاقییانەی دەسەڵات:

ئەمەیان ترسناکترین هۆکارە لەبەرپابوونی جەنگ و زۆرداری و چەوساندنەوەدا، ئیتر لەتوانای چاوسوورکردنەوەوە بگرە تاکوشتن و لێدان. سەمتی بەکارهێنانی دەسەڵات جێگای یاساو ئەخلاقیی تێدا نابێتەوەو، لەتاکە کەس و دیکتاتۆرەکانەوە ئاراستەی بەرهەڵستکاران دەکرێت بۆ دەمکوتکردنیان. بۆ نموونە چەوساندنەوەی کەمایەتییەکان و هەوڵدانی تواندنەوەیان لەزۆرینەدا، ئەنجامی ئەم بەکارهێنانی دەسەڵاتە زوڵم وزۆر دێنێتە کایەوە، نەك هەر لەئاستی کۆمەڵدا بەڵکو لەئاستی تاکە کەسیشدا، کاتێك دزێك، جەردەیەك، تاوانبارێك یەکێکی دی رووت دەکاتەوە.

### د ـ بەکارهێنانی دەسەڵاتی شاراوە:

ئەم جۆرە دەسەڵاتە بزوێنەری پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانە. بۆ نموونە دەسەڵاتی سەرمایە بەسەرکارکردن و بەرهەمهێنانداو، دەسەڵاتی سەرکردە بەسەر ئەندامەکانیداو، دەسەڵاتی کابرایەکی شارەزاو تێگەیشتوو بەسەر نەزانێکداو، باوکێك بەسەر منداڵەکانیدا کابرایەکی ئایینی و خواپەرست بەسەر دەوروبەرەکانیداو، ئەندامی گرووپ و رێکخراوێك بەسەر کەسێکی بێلایەنداو، دەسەڵاتی پارەو، دەسەڵاتی عورف و عادەت و، پلەو پایەی کۆمەڵایەتی و، دەسەڵاتی خزمایەتی و برادەرێتی.

### دەسەڵاتی تاکە کەس:

هەرکەسێ بگریت کەئەمڕۆ خاوەنی دەسەڵاتەو دەتوانێ بڕیار دەرکاتو کار بکاتە ژیانی خەڵکی تر، یاخود ئەوانەی بێدەسەڵاتن، لەئاسمانەوە نەهاتوونەتە خوارەوە، ئەمانە خاوەنی رابردوویەکن کە لەکاتی لەدایکبوونەوە دەست پێدەکات، کۆمەڵێك هۆی ئاشکراو نائاشکرا کاریان تێدەکات، بۆ نموونە:

### دەسەڵاتی بوون:

تاقیکردنەوەکان سەبارەت بەجیهانی منداڵی ئەوەیان سەلماندووە کەمنداڵان هەر دوای لەدایکبوونیان بەچەند سەعاتێك لەگەڵ دەوروبەرەکەیاندا توانای دروستکردنی پەیوەندی سۆسیالییان هەیە. بۆ نموونە ووردبوونەوە لەدەموچاو، لاساییکردنەوە، ناسینەوە، یەکەمین قیژەی منداڵ، زەردەخەنە کردنی.. بریتیین لەدەسەڵاتی بوونی منداڵەکەو، ئامرازێکن بۆ ئاگادارکردنەوە لەتێرکردنی پێداویستییەکانی.

گەشەکردنی ئەم دەسەڵاتەو کەسایەتی منداڵەکە پەیوەندیی راستەوخۆی بەوەوە هەیە تا چ رادەیەك باوكو دایکەکە توانیویانە تێبگەنو پێداویستیی منداڵەکە جێبەجێ بکەن. منداڵەکە دەسەڵاتی خۆی لەرێگای خەڵاتکردنو سزادانەوە دەسەپێنێ (زەردەخەنە یان گریان). کاتێك منداڵەکە دەگری دەگیرێتە باوەشو ژیر دەکرێتەوە، کاتێك پێدەکەنێ رووی نازی دەدرێتێو قسەی لەگەڵ دەکرێ. ئەو منداڵەی لەم قۆناغەدا ئەم جۆرە دەسەڵاتەی بەکار هێنابێ جیاوازی هەیە لەگەڵ منداڵانی تردا کەم ئەم هەلەیان بۆ نەرەخسابێ. بۆ نموونە ئەو منداڵانەی کە لەدەزگا پەروەردەییەکاندا بەخێو دەکرێن زۆربەی جار بێبەشن لەباوەشی گەرمو، بۆیان نەڕەخساوە گوێ شل بکرێت بۆ داواکانیان، کاتێك دەگرین کەس ناچێت بەلایانەوە (بەتایبەتی لەکاتی خۆیدا).



ئالێرەدا منداڵە ساواکە ئەوەی بۆ دەردەکەوێت کەناتوانێ گریان بکاتە هۆی بەهاناوە هاتنی، ئەگەر گریاش کەس بەدەنگییەوە نایەت، هەر لێرەشەوە وەك ئەنجامێکی سروشتی پشتگوێ خستنی منداڵەکەو پێداویستیەکانی هەستی بێدەسەڵاتی رەگی خۆی دادەکوتێ.

### دەسەڵاتی خود (زات) دەوڵەمەندکردن:

مرۆڤ مەزنترین دەزگای خۆناسینەوەی هەیەو، بایەخدانو باسکردنیشی رۆڵێکی گرنگیان لەگەشەکردنو دەوڵەمەندکردنی زاتدا هەیە، لەتەمەنی دوو مانگانەوە منداڵەکە هەندێ کەس دەناسێتەوەو دەتوانێ جیایان بکاتەوەو جۆرە هەستێکی بۆیان هەیە. هەر لەم قۆناغەشدا منداڵەکە هەستی سەربەخۆیی تێدا دروست دەبێت، بۆیە بایەخ پێدانو قسە لەگەڵ کردنو باوەشی گەرمو سنووردانان گرنگترین پێداویستیی دەسەڵاتی خود دەوڵەمەندکردنە.

### هەستی خۆدەربڕین (تەعبیرکردن لەزات):

لەکاتی دوواندن، باسکردن، بەراوردکردندا، لەکاتی بەئاگاییو بێ ئاگاییدا تەعبیر لەزاتی خۆمان دەکەینو خود خانەیەکی تایبەتو فراوانی بۆ دەکرێتەوەو، بۆ کەسانی دەوروبەریشمان سیگناڵێکە کەخۆمانی لەگەڵدا بگونجێنین، بۆ نموونە دەمان وشك دەبێت لەئاستی کابرایەکی بەدەسەڵاتدا یاخود خۆمان لادەدەین لەیەکێکی گێرەشێوێنو شەڕانی.

تەعبیر لەزات زیاتر بۆ سوودی شەخسی دەگەڕێتەوە. بۆ نموونە یەکێك دەیەوێ لەناو گەڕەكو خێزاندا دەرکەوتووبێ، لەگفتوگۆکردنی رۆژانەدا دەجار هەمان سەرگوزشتە دەگێڕێتەوە: چەند جار پێم وت بەقسەی نەکردم، دەبخوا ئەوە دەردی بێ، دەستی خوا خۆش بێ.. خۆم هەر دەمزانی وای بەسەردێ. یان خۆ بەباشتر زانین لەکاتی بەراوردکردندا. نوسەرێك نایەت توانای خۆی لەگەڵ دستۆفیسکیو ئەبسنو

سترینباریدا بەراورد بکات، بەڵکو لەگەڵ هی نزیکترین برادەرەکانی ناوچەکەیدا ئەو کەسانەی کەدەیناسن.)

ئەرسەر میللەر لەرۆمانی (مردنی بازرگانێك) دا لەسەر زاری یەکێك لەپاڵەوانەکانییەوە دەڵێ: هەرچەندە مێردەکەم توانای دەوڵەمەندێتی نەبووەو نەیتوانیووە پارە کۆبکاتەوەو، نەناسراویش بووەو ناوی لەرۆژنامەکاندا بڵاونەکراوەتەوە، بەڵام مێردەکەم مرۆڤە.. مرۆڤ، رێزی لێبگرن !

ئەگەر مرۆڤ توانای بەکارهێنانی ئەم دەسەڵاتەی نەبوو ئەوا زۆربەی جار تاك دەکەوێتەوەو غەم دایدەگرێت. بۆ ئەوەی بەردەوام بین‌و ناوێك بۆ خۆمان دروست کەین. لەهەڵسوکەوتی رۆژانەماندا شێوەیەکی خۆ دەرخستن‌و دەوروبەر لەخۆ بەئاگاهێنانەوە دەدۆزینەوە.

### زەبروزەنگ:

لەنێو کۆمەڵدا بەکارهێنانی دەسەڵات لەرێگای زەبروزەنگ نواندنەوە کارێکی باوەو، بۆ بەرژەوەندیو خۆپاراستن بەکاردێت. رادەی زەبرو زەنگیش بەستراوەتەوە بەکۆمەڵێك هۆکاری دییەوە، وەکو گەشەکردنی خود، کارتێکردنی ئایینی ئایدیۆلۆگیو عورفو عادەت، خاكو نیشتمان، نەتەوەو...هتد کەمایەتییەکان، سائیتر ئەگەر نەتەوەیی بن یاخود ئایینی یان هی رەگەز، بە توندی دەچەوسێنرێنەوەو مافیان پێ شێل دەکرێت، کەرەسەی مل پێکەچکردنیشیان کوشتن‌و لێدان‌و سوکایەتی پێکردن‌و ژیان لێ تاڵ کردنە. لەئاستی تاکە کەسداو، لەکاتی پەیوەندییەکاندا لەگەڵ دەورو بەریدا، زەبرو زەنگ دەروونییە یاخود فیزیکی، کەزۆربەی جار بەشکاندن‌و گاڵتە پێکردن، یان بەلێدان‌و چاو سورکردنەوە کۆتایی پێ دێ. چ رووددەدا، بۆ نمونە، کاتێك یەکێك لەعورفو عادەتی زۆرینە لادەدا، یاکەسێك رەخنە لەکەموکورییەکانی کۆمەڵ بگرێ. زەبروزۆری دەروونی، لەنێو پەیوەندییە کەسایەتییەکاندا، لەهی فیزیکی سەختترو جەرگبڕترە. بۆنمونە



بیرێ دێ بەخەیاڵماندداو حەزمان بەرەنگێکە، بەهەڵسوکەتێکی دیاریکراوە، بەرێکخراوێکی سیاسییە. ئەوەی کەخۆمان بڕیارمان لەسەری داوە دەمانەوێت خەڵکی دەوروبەرەکەشمان بەلایانەوە چاك بێت‌و پەسەندی بکەن. ئەگینا دەکەوێتە بەر پلارو رەخنەگرتن، بۆ نموونە هەڵبژاردنی خوێندن، هاوسەر... باوکەکە دەیەوێ کوڕەکەی ببێ بەدکتۆر، ئیتر هیچ گرنگ نییە با کوڕەکەشی حەزی لەشتێکی دی بێ. یان دەبێ فلانە کەس بێنێ، با حەزیشی لەکەسێکی تر بێت. دەبێت لایەنگری پارتی A بێت هەرچەندە حەزی لەپارتێکی دیکە بێت. رەوتی بەکارهێنانی دەسەڵات، هەواڵەی دەورو بەرەکەی دەکرێ‌و بەپێچەوانەشەوە، ئەمەش هێزی بەرگریکردن لەخۆ (شێتگیری) بەهێزتر دەکات‌و شورایەکی بڵند بەدەوری خۆیدا دروست دەکات کەسنوری خۆی لەگەڵ دەوروبەرەکەیدا جیاتر دەکاتەوەو بەرژەوەندییەکەی چاکتر دەپارێزێت.

### بۆچوونی سۆسیال سیکۆلۆگی:

پەیوەندی نێوان تەنیا کەس‌و دەوروبەرەکەی (Social miljo) وکارتێکردنیان لەیەکتری بەسۆسیال سیکۆلۆگی ناودەبرێت. لەپەیوەندییەکاندا دەسەڵات بەپایەبەرزیو هاوکاریکردن تەعریفی لێ دەکرێت. یەکێك کەپایەی لەیەکێکی دی نزمتر بێت ئەوا رەزامەندانە بۆ هاوکاریکردن دێتە پێشەوە، بەڵام خاوەن پایە بەرزەکە حساب بۆ ئەوەی خوارووی ناکات‌و بەداشی دەستی خۆی دادەنێت.

لەنێو ئاژەڵاندا دەسەڵات بەشێوەی هەرەمی دروست بووەو هەریەکەیان جێگاو رێگای خۆی دەزانێ. لەزۆربەی زۆری رژێمە کۆمەڵایەتیەکانیشدا دەسەڵاتی بڕیاردان بەدەست ئەوانەوەن کەجێگای خۆیان لەسەرووی هەرەمەکەوە کردۆتەوە. ئەوانەی خوارەوەیان هەر راپەڕاندنی ئەو بڕیارانەیان لەسەرە.

## دەسەڵات ـ پەیوەندییەکان:

دەسەڵات نە بەتەواوەتی دەپێورێتو نە بەئاسانیش پێناسە دەکرێت، چونکە دەسەڵات خۆبەخۆ ئاراستەی کەسێك/ گرووپێك نابێتەوە، بریتییە لەپەیوەندییەکانو لەهەمان کاتیشدا کەسێك، گروپێك، چینێك لەناو کۆمەڵدا هەموو کاتێك دەسەڵاتی بەسەر کەسێك، گرووپێك چینێکی تردا هەیە.

لەپەیوەندییە مەنتیقییەکاندا، بۆ نموونە، A برا یان خوشك B یە. لێرەدا دەتوانین بڵێین A و B خوشك و بران.

دەتوانین بڵێین دوو قایمقام/ مدیری ناحیە، لەبەراووردکردنیاندا لەگەڵ یەکتری، هەمان پلەو پایەو دەسەڵاتیان هەیە، کەچی کەدێنە سەر پەیوەندییە شەخسییەکان لەوانەیە کەسی یەکەمیان شارەزاییو لێهاتووییو رادەی خوێندنی لەکەسی دووەم زیاتر بێت. بەم جۆرە هەرچەندە هەمان پلەوپایەیان هەبێت دەسەڵاتیان جیاوازە. ئەگەر کەسی A دەسەڵاتی بەسەر کەسی B دا بێتو بتوانێ کاری تێبکات، ئەوا دەسەڵاتی A بریتییە لە(دەسەڵاتی A دەسەڵاتی B). دەسەڵاتی پارتێك بریتییە لەدەسەڵاتی ئەو پارتە ـ دەسەڵاتی ئۆپۆزیسیۆن.

دەسەڵات سیمای تر دەبینێ بەخۆیەوە ئەگەر لەگەورەو بچووکییەوە بۆی بڕوانین. کەسیA لەکەسی B پیرترەو کەسی B لەکەسی C پیرترە، لێرەدا دەتوانین بڵێین کە A لە C پیرترە. لەسیستێمی عەسکەری زۆربەی پارتو رێکخراوەکاندا ئەم جۆرە پەیوەندییە باوە، کاتێك A دەسەڵاتی بەسەرBدا هەیە، B دەسەڵاتی بەسەر Cدا هەیە، لێرەدا ئەگەری دەسەڵاتی A بەسەرC دا زۆرە، ئەمەش لەرێگای کارتێکردنەوە لەکەسیB. ئەم جۆرە پەیوەندی دەسەڵاتە لەنێو کۆمەڵێشدا باوە، ئەو کەسەی ناسراوتر بێتو پەیوەندی زیاتر بێت توانای دەسەڵاتی زیاترەو ئیشی باشتر دەڕوات.



دەسەڵات لەنێو پەیوەندییەکاندا لەسەر بناغەی زنجیرەیەو، زنجیرەیەك دەسەڵاتمان بۆ بەدەست دێنێ کە کار لەیەکتری بکەنو، لەهەمان کاتدا ناتوانرێت جێگەو شوێنو کاتیان دیاری بکرێت. ئەم جۆرە دەسەڵاتە زنجیرەییە بەسەرگروشتەیەکی کۆن روون دەکرێتەوە :

(منداڵێك نایەوێت بڕوا بۆ قوتابخانە.. دایکەکە دەڕوا بۆ لای دار کە بێ لەکوڕەکەی بدا بۆ ئەوەی بچێ بۆ قوتابخانە. بەم جۆرە دایکەکە دەڕوات بۆ لای ئاگر، ئاو، گا، قەساب، پەت، مشك، ...تا ئەگاتە پشیلە. پشیلە بەدەم دایکەکەوە دێتو پەلاماری مشکەکە دەدات بیخوا، مشك بۆ پەت... بەم جۆرە زنجیرەکە دەکەوێتە جولان، تا دەگاتە دار، داریش دەیەوێت لە منداڵەکە بدا... منداڵەکە دەڕوات بۆ قوتابخانە ... ئەو پەیوەندییانەی کەبەم جۆرەیەو لەنێو کۆمەڵدا باون زۆربەی جار شێوەیەکی شاراوەیان هەیەو ناتوانرێت دەستنیشان بکرێن.

کێ لەبنەچەدا ئەو دەسەڵاتەی بەلاوەیە کەزنجیرەکە بخاتە جولاندن؟

ئایا دایکەکەیە یاخود پشیلەکەیە؟

ئەوەی ئێمە دەیبینین ئەوەیە کەمنداڵەکە دەبێت بڕوا بۆ قوتابخانە) Rashevsky،1951 .

### کۆنترۆڵکردنی تەواوەتی یاخود نیوەیی:

Kelley و Thibaut دوو سۆسیال سیکۆلۆگن باری پەیوەندییەکانی ناو دەسەڵاتیان شیکردۆتەوە. ئەگەر کەسی A و کەسی B دوو ئەڵتەرناتیڤیان لەبەردەستدا بێت بۆ هەڵبژاردن، ئەڵتەرناتیڤی ١ و ئەڵتەرناتیڤی ٢، ئەوا لێرەدا سێ جۆر پەیوەندیمان لەنێوان کەسی A و B بۆ دروست دەبێت:

أ- کەسی A و B ئازادن چ ئەڵتەرناتیڤێك هەڵبژێرنو کەسیان نەبەستراوەتەوە بەوی ترەوە.

لەکاتی گفتوگۆ کردنی نێوان پارتو ڕێکخراوە سیاسییەکاندا کەهەرلایەکیان خاوەنی قەوارەو شوێنی خۆیانن، بەرژەوەندی خۆیان دەپارێزن، بۆ نموونە راوێژکاری ڤێتنامییەکان لەگەڵ حکومەتی ئەمریکاداو، هی پارتی لەگەڵ رژێمی بەغداد لەساڵی ١٩٧٠ دا. (خوالێخۆشبوو بارزانی لەجێگەی خۆی مایەوە نەچوو بۆ بەغداو وەفدی پارتی نوێنەرایەتییان دەکرد.)

لەئاستی کەسانیشدا ئەم جۆرە پەیوەندییە ئەوەیە کەیەکێك بۆی هەبێ چی بەباش بزانێت ئەوە هەڵبژێرێت بێ ئەوەی کەسی دووەم کاری تێ بکات.

ب ـ کەسی B تارادەیەك بەستراوەتەوە بەکەسی A وە، لێرانەدا کەسی B بۆی نییە چ ئەڵتەرناتیڤێکی بووێت هەڵیبژێرێت. ئەگەر کەسی Aئەڵتەرناتیڤی یەکەمی هەڵبژارد کەسی دووەم دەتوانێت ئەڵتەرناتیڤی دووەم هەڵبژێرێت، بەڵام دەبێت نرخی ئەو هەڵبژاردنە بداتو بکەوێتە مشتومڕو ناخۆشییەوە لەگەڵ کەسی A دا، یا ئەوەتا لەبەر خاتری Aئەڵتەرناتیڤی یەکەم هەڵبژێریت.

بۆ نموونە ئەو ڕێکخراوو پارتییانەی کەوابەستەی سیاسەتی وڵاتێکی ترن دەبێ بەقەدەر بەرەکەی خۆیان پێ راکێشنو نەشیش بسوتێنن، نەکەباب. ئەمەش لەپەیوەندی نێوان بەرەی کوردستانی ئێراندا بەروونی دەرکەوت (لەو سەردەمەدا هەندێ خۆپیشاندان دژی باڵوێزخانەی عیراق ڕێکخراوی کوردی هەموو بەشەکانی کوردستان تێیدا بەشدار بوو. ئەو ڕێکخراوانەی کەخۆپیێشاندانەکەیان ڕێك دەخست تەنیا دڵیان بەهیتافاتی دژ بەعیراقو تورکیا دەکرایەوە، ئەگەر یەکێکیش هیتافێکی دژی حکومەتی ئیسلامی یا سوریایان بکێشایە یەخەو سەرو دڵیان دەگرت.)

لەئاستی تاکەکەسداو، لەژیانی رۆژانەدا، هەر لەشتی سادەوە بگرە تا هی دژوار هەموو بەیەکەوە بادراون. بۆ ئەوەی دڵی باوکت رازی کەیو شوودەکەی بە A ، بۆ ئەوەی ناوی خێزانەکەت کوێرنەبێتەوە دەبیت بەئەندامی هەمان پارتیو هەمان



رۆژنامە دەخوێنیتەوە، بۆ ئەوەی دراوسێی (ئەلف) رازی کەی لەگەڵ دراوسێ(بێ)دا تێکی دەدەیت، بۆ ئەوەی خۆت بەشاری دانێیت حەز بەهاتوچۆکردنی لادێی ناکەیت، زۆر روویان نادەیتێ، کەدێشن بۆ لات زەوقت تێك دەچێتو حەزناکەی دەرو دراوسێ بیانبینێ. بۆ ئەوەی برادەری عەزیزت دڵ زوویر نەبێت پوولێك بەبرادەری دووهەمتەوە دەنێیت.

ج ـ کەسی B بەتەواوەتی بەستراوەتەوە بەکەسی A وە. ئەگەر کەسی A ئەڵتەرناتیڤی یەکەم هەڵبژارد B یش ئەڵتەرناتیڤی یەکەم هەڵدەبژێرێت، خۆ ئەگەر A هی دووەمی هەڵبژارد دەبێت B هەمان شت دووبارە بکاتەوە. پارتە کۆمۆنیستەکانی وڵاتە سۆسیالیستەکانو وڵاتانی تری جیهان ئەو سیاسەتەیان پەسەند دەکرد کەهەمان سیاسەتی پارتی کۆمۆنیستی سۆڤیەت بوو. هەچ رواڵەتێکیش ناوی سۆسیالیستیو سۆڤیەتی پێوە بووایە ئەمان بەهەقو ناهەق داکۆکیان لێ دەکردو، تەنیا ئەو شتانەیان بینیبوو کەبۆیان هەبوو بیبینن‌و، هەموو هەوڵدانێك دژی دەسەڵاتی ناوەندی سۆڤیەتی بەتوندیو بەبەکارهێنانی هێزی سوپایی سەرکوتکراوە. بۆ نموونە لەهەنگاریاو چیکۆسلۆڤاکیا (دۆپچیك ویستی سۆسیالیزمێك دامەزرێنێ کەروویەکی مرۆڤایەتی هەبێ !) گفتوگۆی نێوان دوولا ، ئیتر هەرچۆنێك بێت، ئەگەر لایەکیان کۆنترۆڵی تەواوەتی هەبێ وەکو یاری مندالآنی لێ دەردەچێت، چونکە هەردەم ئەوەی کەدەسەڵاتی تەواوەتی هەیە تەنیا دڵی بەئیجبارکردن دەکرێتەوە، ئەمەش بەڕوونی لەسەرنەگرتنی مفاوەزاتەکەی ١٩٨٤ی یەکێتیی نیشتمانییدا دەردەکەوێت.

لەژیانی تاکەکەسدا ئەم جۆرە کۆنترۆڵ کردنە ترسناکترین گیروگرفتی مرۆڤایەتییەو، ئەو کەسانەی کەکۆنترۆڵ دەکرێن هیچ بەرهەڵستیەکیان تێدا نامێنێ، بەتەواوەتی خۆیان دەدەن بەدەستەوە چیان لێ بخوازرێ پێیان دەکەن، ئیتر لەهەر تاقمێکو دەستەیەك بن (تاقمێکی ئایینی لەشاری ڤاکوی ئەمریکی

لەدەوری داڤید کوروش ناوێك کۆبوونەتەوەو بەپێغەمبەریان داناوەو تەنیا داڤید بۆی هەبووەو پێی رەوابینراوە کە لەگەڵ ژنو منداڵەکانیان بنوێت، رابوێرێتو مەشروب بخواتەوە، تاقمە ئاینییەکەش لەو دنیا بۆیان هەبووە مەشروب بخۆنەوەو رابوێرن . جارێك لەگەڵ پۆلیسدا بەیەکدا هاتنو چوار پۆلیسیان کوشت. ماوەی دوو سێ مانگ پۆلیسو سەرباز ئابلۆقەی خانووبەرەکەیان دانو ویستییان ناچاریان بکەن خۆبەدەستەوەبدەن. بەڵام لەمانگی ئەبریلی ١٩٩٣ دا تاقمەکە گڕی لەخۆیو خانووبەرەکە بەرداو ٨٥ کەس پێکەوە سوتان. کارەسات لەوەدایە کە ئەم تاقمە نەك تەنها ژنو منداڵو هەموو شتێکی دونیایان بەخشیوە بەداڤید بەڵکو لەگەڵیشیدا بەرەو مردن رۆشتوون).

### دەسەڵات ـ سەرکردە:

ئەو توێژینەوەی کە لەم بارەیەوە کراوە سەبارەت بەدووشت بووە:

١ـ چۆن سەرکردە دەتوانێ چالاکییەکانی گروپەکە بەڕێوەبەرێت، چۆن کاربکاتە سەر بیرو هەڵسوکەوتیان.

٢ـ چ جۆرە شێوەیەك هەڵبژێرێ لەچالاکیی گروپەکەدا کەئەندامەکانی پێی رازی بن.

زۆربەی زۆری سۆسیاڵ سیکۆلۆگەکانی ئەم سەردەمە لەو بڕوایەدان کەسەرکردە توند بەبارودۆخەکەوە پێچ دراوە (مەبەست لەسەرکردە تەنیا سەرکردەی وڵاتێك یان پارتێك نییە، بەڵکو سەرکردەی گروپێکی بچکۆلانەی سیاسی، ئابووری، پیشەییو کەلتوریشە) ئەرکی سەرشانی سەرکردەیەك ئەوەیە کەبارودۆخەکە بەسەریدا دەسەپێنێ. نەك خاسیەتی سەرکردەکە، چونکە سەرکردە رۆڵەو وەڵامدانەوەی ئەو پێداویستییانەیە کەبارودۆخەکە هێناویانە بەسەریداو، رادەی زیرەکیو لێهاتوویی سەرکردەش تۆزێك لەراژەی زیرەکیی گروپەکە زیاترە. ئەو سەرکردانەی کەئەمڕۆ لەکوردستاندا دەسەڵاتیان بەدەستەوەیە لەنێو خەڵکەکەوە هەڵقوڵاونو بارودۆخی



ناوچەکە هێناونێتە کایەوەو، زیرەکیو نازیرەکی، شارەزاییو ناشارەزایی، هەڵەو راست گرنگ نییە. گرنگ ئەوەیە کەدەسەڵات لەدەستی سەرکردەیەك یا دەستەیەکدا بێت، ئەندامانی گروپێك، پارتێك، میللەتێك پێویستیان بەسەرکردەیەك هەیە وەك سیمبولێ(رەمزێ) بۆی بڕوانو خۆشەویستیو رقو کینەی خۆیانی بۆ دەربڕنو خۆیانی لەگەڵدا بەراوورد بکەنو، لەرووی دەروونییەوە خودی نیوە مردوویان لەنەرەنەری سەرکردەدا زیندووکەنەوە. خواستو بیرکردنەوەی سەرکردە چۆن بێت بەو جۆرەش ئەندامانی گروپەکەی بیردەکەنەوە، یاخود بەپێچەوانەوە کاتێك سەر بەگروپێکی تربن.

### دەسەڵات ـ تاقیکردنەوەکان:

کاتێك باسی دەسەڵات دەکرێت مەبەست دەسەڵاتی تەنیا کەس یاگروپێك نییە، بەڵکو ئەو دەسەڵاتەیە کە لەکاتی بەکارهێنانیدا دەبێتە هۆی کارتێکردن١٩٦٢.

Emersonکاتێك کەسی A دەسەڵاتی بەسەر کەسی B دا هەیە، مانای ئەوەیە کەدەسەڵاتی A یەکسانە بەو بەرهەڵستییەی کەکەسی B دەیکات دژی کەسیB.

هەر ئەمەشە بۆتە هۆی ئەوەی کەناتوانرێت دەسەڵات بپێورێت. پرۆفیسۆرێکی سۆسیال سیکۆلۆگی فینلاندی بەناوی Eskole لەساڵی ١٩٦١دا تاقیکردنەوەیەکی ئەنجامداوە کەتەخمینکردنی درێژیی چوارگۆشەیەك بووە بەدووجار، یەکەمین جار بەشداربووەکانی بەتەنیا وەڵامیان داوەتەوەو وەڵامەکانیان تۆمارکراوە، لەقۆناغی دووهەمدا دووکەس دووکەس هاتوونەتە ژوورەوەو پێکەوە دوای گفتوگۆکردنو یەك قایلکردن وەڵامێکی هاوبەشیان داوەتەوە. وەڵامەکانیان لەگەڵ وەڵامەکانی پێشوویاندا بەراورد کراوەو، لەئاکامدا دەرکەوتووە کەکام لەو دوو کەسە کاریان کردۆتە سەر ئەوی تریانو، بەوجۆرە دەسەڵاتەکەیان پێواوە.

Robert mickelلەسەدەی بیستەمدا توێژینەوەیەکی قووڵی لەنێو دەستەو رێکخراوی پارتی سۆسیال دیمۆکراتی ئەڵمانیادا کردووە، لەئەنجامدا ئەوەی

بۆدەرکەوتووە کەسەر باشقەیەك لەسەرەوە پەیدابووە کەدەسەڵاتیان لەلا کۆبۆتەوەو جیاوازیان لەگەڵ ئەندامانی خواروویاندا ئەرزو ئاسمانە. Robert بەو ئەنجامە دەگات، کەئەگەر هاتوو لەپارتێکی سۆسیال دیموکراتدا ئەم دەسەڵاتە لەهەڵبژاردەیەکی خەڵکدا کۆبکرێتەوە، ئەوا لەپارت و ڕێکخراوە راستڕەوەکانی تریشدا، بەڵکو بگرە لەنێو کۆمەڵی ئایینیو کەلتووریو پەیوەندییە ئابووریەکانیشدا هەمان سەرباشقە دروست دەبێت کەدەسەڵاتی گۆڕانی بەلاوەیە.

## چەشنە سەرەکییەکانی دەسەڵات:

سادەترینو سەرەتاترین ئەم شێوەی دەسەڵاتە هی ناچارکردنە، واتە بەهێزی فیزیکی (زۆر لێکردن یاخود هەڕەشەکاری) ئەنجامیبدەیت، چاکترین نموونەش لەسەردەمی نوێدا ئەو دەسەڵاتە سیاسییەیە کەدەوڵەت دژی هاوولاتیانی خۆی بەکاری دەهێنێ. ماکس فیبەر١٩٥٨ لەو بڕوایە دایە کەهەر لەپێناسەی خودی دەوڵەتدا مافی توندوتیژی بەکارهێنانی لەسنوورێکی دیاریکراودا، هەیە. هاوولاتیان بۆیان نییە بەتوندوتیژی مافی خۆیان بسێنن یان بەکاری بهێنن دژی خەڵکی تر (جگە لەوەی کە لەزۆربەی زۆری ولاتەکاندا دایكو باوك دەتوانن توندوتیژی بەکار بهێنن دژی منداڵەکانیان) بۆمل پێ کەچکردن .

## دەسەڵاتی ئایین:

ئەو دەسەڵاتەیە کە لەسەر چاکەو خراپەکردن وەستاوە. بۆنموونە کابرایەکی ئایینی شارەزا دەتوانێ کار بکاتە سەر خوورەوشتی خەڵکی دی، کاتێك هەندێ هەڵسوکەوت بەچاك دادەنێو ئەوانی تر بەخراپ، زۆربەی دەوروبەرەکەشی ناچارن خۆیانی لەگەڵدا بگونجێنن، بەم جۆرە بەشێکی زۆری دیدو ئاکاری کابرا وەردەگرنو دەبێتە هی خۆیان. لێرانەدا، لەنێوان دەسەڵاتدارو ئەوانی تردا، پەیوەندییەك دروست دەبێت کەزۆرجار زەحمەتە بێ یەك بمێننەوە، بۆیە زۆرجار ژیانی خۆیان دەکەن بەقوربانی.



## دەسەڵاتی ئابووری:

خاوەن سەرمایەکان کۆنترۆڵی خۆیان هەیە بۆپەیوەندییە ئابوورییەکانو بەو پێیە نەخشەیان بۆدەکێشن کە لەگەڵ بەرژەوەندیەکانیاندا بگونجێو دەسەڵاتیان وەکو ئامرازێکی ناچارکردن بەکاربهێنرێت. لەولاتدا لەسەر بناغەی دەستکەوتی مادی (خەلاتکردنو سزادان )، ئەم دەسەڵاتە بەسنوورەکاندا تێدەپەڕێت. بۆنموونە ولاتەکانی ئەمەریکای لاتینی بەشی هەرە زۆری شمەکی نێردراوەکان بۆدەرەوە دەچێت بۆئەمەریکا، لێرەدا دەسەڵاتی ئابووری ئەمەریکایی بەسووكو ئاسانی وەکو ئامرازێکی مل پێکەچکردن لەو ولاتانەدا دەسەپێنرێ.

ڤێتنام سەرکەوتنی جەنگی بەدەست هێنا، بەلام ئابلۆقەی ئابووریی ولاتە رۆژئاوەییەکان دەستی ناوەتە بینی ئابووری ڤێتنامو نایەڵن گەشە بکات. ئەم دەسەڵاتە بەشێوەی تریش بەکاردەهێنرێت، بۆنموونە، لەرێگای خستنەکارو کۆمەککردنی ولاتانی جیهانی سێهەم، یان بۆمسۆگەرکردنی بەهێزکردنی دیموکراتی لەولاتە سۆسالیستەکانی پێشوودا، بۆنموونە کۆمەککردنی سەرۆك کۆماری ئەمەریکا بەرووسیاو دانی زیاتر لەملیارێك دۆلار بۆئەوەی تای ترازووی دەنگدانە گشتییەکەی ئەو دواییەی رووسیا بەقازانجی یەلتسن بێت.

## بۆچوونی سۆسیۆلۆگی:

لەژیانی رۆژنەدا پێویستمان بەپەیوەندیو دۆستایەتی کەسانی دەوروبەرەکەمان دەبێت، هەڵسوکەتمان پابەندی ئەو جیهانەیە کەتێیدا دەژینو بەجۆرێك لەگەڵی دەجووڵێینەوە کەبۆمان بگونجێتو، لەهەمان کاتدا بەرامبەر هەڵسوکەوتی دەوروبەرەکەمان کاردانەوەی خۆمان هەیە. یواکیم ئیسرائیل١٩٧٩ دەڵێت: مرۆڤ پەیوەندییە کۆمەلایەتییەکانیو ئەو بیروڕایە بەهەڵە دادەنێ کەدەڵێ: مرۆڤ بەرهەمی کۆمەڵەکەیو هەروەها ئەو پەیوەندیە کۆمەلایەتیانەیە کەناچارە لەنێوانیاندا بژی. لێرەدا مرۆڤ بەبێ دەسەلاتو سست دادەنرێت، کەهەر لەژێر

ڕکێفی توندوتیژیدایەو خۆی لەگەڵدا دەگونجێنێ. یواکیم ئیسرائیل دەڵێت: مرۆڤ خاوەنی هەڵسوکەوتی چالاکانەیەو دەتوانێ سنوور بۆخۆیو دەوروبەرەکەی دانێ.

## پەیوەندییە سۆسیالییەکان:

پەیوەندیی نێو یەکتری: ئەو پەیوەندییەیە کە لەگەڵ یەکتردا دەیبەستینو، لەکاتی پەیوەندی بەستنی تایبەتدا لەگەڵ کەسانی تردا چاوەڕوانین کەئەوان چ کاردانەوەیەکیان هەبێت، بۆئەوەی ئێمە بەئاسانی هەنگاوی دووەم بنێینو، لەگەرمەی ئەم جۆرە دووبارەبوونەوەیەدا پەیوەندییەکان گەشە دەکەن، پەیوەندیی کۆمەڵایەتی ئەوەیە کەسەرانسەری کۆمەڵ دەگرێتەوە، بۆنموونە پەیوەندییەکانی نێو یەکتر لەهی ئابوورییەکاندا گەشە دەکات. لەم پەیوەندی کردنەدا دووجۆر دەسەڵات پەیدا دەبێت. کێ لەبنەچەدا خاوەنی دەسەڵاتەو؟ کێ نوێنەرایەتی لێ دەکا؟ ئەمەش دووخەسڵەتی بنەڕەتی کۆمەڵایەتین.

### ١-دەسەڵاتی ئۆبیەکتیڤ:

دەسەڵاتی موڵکایەتیو لەچنگابوونی کەرەسەی بەرهەمهێنان ئەوانی بەرهەمەکە دروست دەکەن جیا دەکاتەوە لەوانی دەبنە خاوەنی. ڕەوایەتیو ڕاستیی سیستێمەکە، بۆنموونە هی سەرمایەداری، پارێزراوە، لەکاتێکدا پارتە نوێنەرەکان، لەچەپەوە تاراست، بەرهەمهێنانی تایبەتیان لارەوایە، ئەمەش لەلایەن دەسەڵاتی سیاسی، پۆلیس، مۆنۆپۆلکردنی دامودەزگاکانی خوێندنو ڕاگەیاندنەوە مسۆگەر دەکرێت.

### ب ـ دەسەڵاتی سۆبیەکتیڤ:

بەڕێوەبەری کارخانەیەك نوێنەری دەسەڵاتی خاوەنی کارخانەکەیە. بەڕێوەبەری کارخانەکە لەڕێی خەڵاتکردنو سزادانەوە دەسەڵاتی سۆبیەکتیڤی خۆی دەسەپێنێو، دەتوانێ کاربکاتە سەر موچەخۆرو کرێکارانو موچەیان بۆ زیادبکات، یان دەریان کا، یان بیانگوێزێتەوە...هتد. ئەمە دەسەڵاتی توانا بوونە لەبڕیاردانو کارتێکردندا. لێرەدا دەبێ ئەوەش ڕوون بکرێتەوە کەدوو بەڕێوەبەر هەرچەندە



پلەوپایەو شارەزاییان وەك یەك بێت، جۆری هەڵسوکەتیان لەگەڵ دەوروبەرەکانیاندا گرنگە. بۆنموونە یەکێکی نەرمو لەسەرەخۆ لەگەڵ یەکێکی ڕەقو قسە ناخۆشدا. هەرچۆنێك بێ دەسەڵاتی سۆبیەکتیڤ داری دەستی موڵکایەتی کردن (دەسەڵاتی ئۆبیەکتیڤ)ە، لەکاتی پەیڕەکردندا.

### دەسەڵاتی ئەکتواریتا:

ئەم جۆرە دەسەڵاتە بەدووشێوە دەردەبرڕێت، لەڕێگای زیرەکیو شارەزاییەوە، یان لەڕێگای بەکارهێنانی توندوتیژەییەوە. باوکێك کەبەمنداڵەکەی دەڵێ ڕۆڵە بنوو" کوڕەکە نایەوێ بنوێ دەڵێ بۆچی؟ باوکەکە چاوی لێ سوور دەکاتەوەو دەقیژێنێ بەسەریداو گوێی ڕادەکێشێو پێی دەڵێ: لەبەر ئەوەی من پێت دەڵێم. باوکەکە وەك دەسەڵاتداری نێو خێزان ئامرازی ناچارکردنی بەدەستەوەیەو بەکاری دەهێنێ کەزۆربەی جار بەلێدان کۆتایی پێ دێ. باوکێکی دی لەهەمان هەڵوێستدا نەرمو لەسەرخۆ بۆ منداڵەکەی ڕوون دەکاتەوە تا قەناعەتی پێدێنێ، بۆ نموونە: (کوڕم ئەگەر ئێستا نەنوویت، تێرخەو نابیت، بەیانی درەنگ هەڵدەستی) لێرەدا باوکەکە وەڵامی منداڵەکەی دەداتەوە، گوێی بۆ ڕادەگرێتو بۆی دەسەلێنێ.

لەنێو سیستێمی کۆمەڵایەتیدا بەکارهێنانی دەسەڵات لەسەر شێوەی ئەکتواریتا دروست بووەو لەسەرەوە بۆخوارەوە دەردەکرێتو، ئەوانەی خوارتر جێبەجێی دەکەن. سیستێمی سوپایی نموونەیەکی تایبەتی بەکارهێنانی دەسەڵاتی زۆرە ملێیە. بڕیار دەردەکرێتو دەبێت جێبەجێ بکرێت( لەوانەیە ئەفسەری وا هەبێت بەزیرەکیو شارەزایی ئەوانی خوارەوەی قەناعەت پێ بێنێ، بەڵام ئەگەر قەناعەتی پێنەهێنان ئەوە زۆری بەدەستەوە ماوە). بۆ بەکارهێنانی دەسەڵات لەسەر بناغەی شارەزایی، لەزۆربەی حاڵەتدا، دەبێ ئەو کەسانەی شایستەییو لێهاتوویی خۆیان بسەلێنن، وەك دیکتاتۆرێك، سەرۆکی پارتێك نییە کەهەرچەندە پەککەوتووبن دەسەڵاتی خۆیان هەیەو بەقسەیان دەکرێت. لەنێوان دەسەڵات

لەرێگای زیرەکی‌و لێهاتوویی‌و دەسەڵات لەرێگای توندوتیژییەوە هەزارەها جۆری تری دەسەڵات ـ پەیدا دەبن کە نەبەتەواوەتی ئەمیانن‌و نەئەویان.

**دەسەڵات/ ئامراز:**

کۆمەڵێك توێژەری سویدی سەبارەت پەیوەندیی دەسەڵات ـ لەسەردەمی نوێدا چەند توێژینەوەیەکیان کردووە، بەشی هەرە زۆریان گەیشتوونەتە ئەو ئەنجامەی کەدەسەڵات ئامرازێکە بۆ گەیشتن بەمەبەست G. Henes.1983

دەسەڵات بزوێنەری راستەوخۆی بڕیاردانێکە کەسەمتێك وەردەگرێت‌و لەرێگەیەوە دەگەینە مەبەستێك. بۆ نموونە دووکەس کەشەترەنج دەکەن، هەردوولایان دەیانەوێ بیبەنەوە. هەر کامیان دەگرێت ئەو جووڵاندنەوانە هەڵدەبژێرێت کەمەبەستیانەو ئەو قوربانیانە دەدەن کەدەیانگەێنێتە ئەو ئەنجامە.

**دەسەڵاتی لامەرکەزی:**

بڵاوکردنەوەو دابەشکردنی دەسەڵات‌و ئەرکی سەرشانە بەسەر دامودەزگاکان‌و ئەندامانی کۆمەڵدا. ئەمەش کەمکردنەوەی دەسەڵاتی ناوەندییە، بۆ نموونە کورتکردنەوەی کاتی بڕیاردان (کاتێك دامودەزگاکانی خوارەوەی کۆمەڵ مافی بڕیاردانیان هەبێت) زیادکردنی دەسەڵات‌و ئەرکی سەرشانی گرووپە بچکۆلانەکان.

هەندێ لەلایەنە باشەکانی دەسەڵاتی لامەرکەزی:

ـ بەهێزکردنی هەڵسوکەوتی دیموکراتییانە لەنێو گرووپەکاندا.

ـ کەسانی لێهاتووو شارەزا بۆیان دەڕەخسێ جێگای خۆیان بکەنەوە.

ـ ئەرکی سەرشانی تاکەکەس زیاتر دەبێت‌و حەزکردن‌و بایەخدانی بەکاری بەڕێوەبردن زیاتر دەبێ، کاتێك دەسەڵاتی خۆی دەبینێ لەگۆڕانسازیدا بڕوا بەخۆبوونی زیاتر دەبێت.

ـ کۆنترۆڵکردن‌و کارتێکردن‌و هاوسەنگییەك وەردەگرێت کە لەرێگایەوە ژمارەیەکی زۆری مافەکان دەپارێزرێت.



هەندێ لەلایەنە خراپەکانی دەسەڵاتی لامەرکەزی:

ـ هەر کەس بۆخۆی بەرژەوەندی خۆی دەپارێزێ، دامودەزگاو دامەزراوەکان خۆپەرستدەبن.

ـ زۆربەی زۆری یاساو بڕگەکانیان وەك یەك شینا کرێنەوەو هەرکەس بەجۆرێك لێیان تێدەگات.

ـ دەسەڵاتی مەرکەزی زامنکردنی کار بەڕێوەبردنە.

ـ هاوکاریکردن‌و گیانی قوربانیدان کەمتر دەبێتەوە.

ـ باری وڵات وەك چەند وڵاتێکی لێ دێت لەوڵاتێکدا.

**دەسەڵات /گرووپ:**

گرووپ کۆمەڵێ خەڵکن کە لەگەڵ یەکتریدا هەڵسوکەوتیان هەیەو یەکتر دەناسن. George Homnas دوو جۆر گرووپیان هەیە:

**گرووپی سەرەتایی** (sekundar)

گرووپی سەرەتایی: کۆمەڵێکی بچکۆلانەیە کەپەیوەندیی نێوانیان زۆر بەهێزەو یەکتری باش دەناسن.

گرووپ selcundan : ئەو گرووپەیە کەسنووری فراوانەو لەکۆمەڵێکی یەکجار زۆر پەیدابووە کەپەیوەندیی بەهێزیان پێکەوە نییە. بۆ نموونە پارت‌و رێکخراوە سیاسییەکان، نەقابەکان، یەکێتی قوتابیان. کارتێکردن لەیەکتری‌و بەکارهێنانی دەسەڵات لەگرووپە سەرەتاییەکاندا کاریگەرترە وەك لەگرووپە گەورەکاندا. Kurt Iewins لەتیۆری مەیدان گرووپی هەڵ‌و دەرفەتێکی دینامیکی داناوە، کەگۆڕانکاری بەشێکی دەبێتە هی سەرانسەری گرووپەکە. رادەی گۆڕانسازی پابەندی ئەوەیە چەندێك ئەندامانی گرووپەکە نزیکن لەیەکترییەوە، گرووپەکەیان لامەبەستەو، چ هێزێك دەیانبەستێت بەیەکەوە، پەیوەندییان لەگەڵ سەرۆکی گرووپەکە، هەروەها گوشاری گرووپەکە خۆی بۆ سەر ئەندامانی کەچۆن

دەبێت بیرکەنەوەو رەفتار بکەن. لەکاتی مەترسیو هەلومەرجی نائاساییدا ئەندامانی گرووپەکە دەسەڵاتیان دەکەن بەیەكو بەرپەرچی مەترسییەکە دەدەنەوە. سەربو کرواتو ئیسلامەکانی یۆگۆسلاڤیا بەیەك زمان قسە دەکەنو، بەهۆی ژنو ژنخوازییەوە تێکەڵاون، کام خێزان دەبینیت لەبۆسنیا لەمانە پێك نەهاتبێ، کەچی ئەمڕۆ دەبینین کەسێ گروپ، سێ رەوتی جیاوازی ئایینیان لێبۆتەوەو چەکدارەکانیان لەیەکتری دەکوژنو گەورەترین تاوان دەکەن.

### ئەنجامەکان:

بەشی زۆری هەوڵو تێکۆشانی مرۆڤ لەدابینکردنی پێداویستیەکانی ژیانیدا شێوەی جۆراوجۆری پەیوەندی کردنە لەگەڵ کەسانی تردا، وەك بەرەنگار بوونەوەی کۆمەڵێك گیروگرفتو ناکۆکیو بەرژەوەندیو خواستو هەڵوێستی جیاواز، هەروەها چۆنێتی دۆزینەوەی چارەسەر بۆ کێشەکانی ژیان، ئەمەش بزوێنەرێکی بایەخدار بووە لەدروستبوونی هاوسەنگییەکی سرووشتی کەپێداویستی کەسو گروپو کۆمەڵەکان بووەو هۆی مانەوەو بەردەوامبوونیان بووە. لەم گەردوونە پانو بەرینەدا بۆهەچ شتێك بڕوانین، گیاندار بێ یاخود بێگانە، دەبینین بوونیانماناو جێگایەکی تایبەتی لەسروشتدا هەیەو هاوکارو پابەندی یەکدینو بووشنەتە هۆی راگرتنی هاوئاهەنگیو هاوسەنگێتی سرووشت، ئیتر هەر لەدەسەڵاتی مرۆڤ و کارەساتە سرووشتیەکانەوە بگرە تادەسەڵاتی مێشوولەیەك!

نەمامێك، دارێك هەر لەبەرئەوەی رەگی قوولتر داکوتاوەو رەگی وردی زۆرترە توانای مژینی کەرەسەی خاوی سەرەتایی زیاترە. بەچکەی باڵندەیەك هەر لەبەرئەوەی رۆژێك گەورەترە لەبەچکەکانی دی توانای گەشەکردنو گەورەبوونی زیاترە لەوانی دی. شێرێك، کەرادەی دەسەڵاتی لەنێو دەستەکەیدا زۆرە، بەچکەکانی دەبێت پێش بەچکەی دایکەکانی تر گۆشت بخۆن. ئەوانەی کەچاکترینو بەهێزترین پێکهاتووی جینتیکیانەیان هەبێت توانای دەسەڵاتو مانەوەیان لەوانی تر زیاترە



کە لەوەبێبەشن. مرۆڤ مەزنترین توانای بەئاگاییو بێئاگایی پێ بەخشراوەو هەر لەسەرەتاوە بەململانێکردن دروست بووە (کام لەسپێرمەکان (تۆو)ەکان دەگەنە هێلکە) کاتێك منداڵێك یەکێکی تری بەدوادا دێ دەسەڵاتیو بایەخپێدانی لەلایەن دایكو باوكو دەوروبەریەوە دەکەوێتە مەترسیەوە، بۆیە بەگریانو وڕکگرتنو سەرپێچی کردن دەوروبەرەکەی ئاگادار دەکاتەوەو نارەزایی دەردەبڕێ بەرامبەر برابەش زۆر بوون (چونکە زۆرجار منداڵەکە وا دەزانێ بایەخدان بەمنداڵەکەی دی لەسەر ئەم دەکەوێت.)

### دەسەڵاتو تاکە کەس

کە لەماڵەوە دەردەچینو روو دەکەینە ناو شار، کاتێك کار دەکەین یان گفتوگۆ لەگەڵ یەکێکی دی دەکەین، شتێك دەگێڕینەوە دەسەڵاتێکی شاراوەمان لەسەرەو پەردەیەکی گرتووە بەڕوومانەوەو ناتوانین بەکەماڵی ئیسراحەت چی لەدڵمانایە دەریببڕین، دەبێت بەجۆرێك باسی شتەکان بکەین کە لەناو کۆمەڵدا گونجاوبێت. بۆ ئەم مەبەستە دەبێت خود خاوەنی دەسەڵاتی خۆگونجاندن بێ لەنێوان خواست (ئەم دامودەزگایە زمانی حاڵی خواستەکانمانەو زۆربەی جار لەجیهانی بێئاگاییەوە سەرهەڵئەدا) و دەزگای خودی گەورە (بریتییە لەدائیرەی پاراستنو توانای بڕیار دەرکردنی هەیە لەسەر راستو چەوتی خواستەکان، پێوەری نرخو نۆرمە کۆمەڵایەتییەکانە) خودیش دەزگایەکە لەنێوانیانداو خەریکی رێکخستنیانە.

دەسەڵاتی خودی کەسەکە بریتییە لەرادەی توانابوون لەگونجاندنی داواکانی (ئەوانەی لەبیرو هەستا دەیەوێت) لەگەڵ واقیعە بابەتیەکاندا. رادەی ئەم دەسەڵاتەش دەبێتە پێوانەی ئەو کەسەو ئایا چەند سەرکەوتووەو توانای بەکارهێنانی دەسەڵاتی لە کاتو جێگای خۆیدایە. بۆ نموونە دزی ناکەیت... لەبەر ئەوەی شەرمە چۆن رووت بێت سەرهەڵبڕی، لەوانەشە سزا بدرێیت. توخنی سیاسەت ناکەویت، چونکە ماڵ وێرانی لەدوایە... نابیت بەجاش، چونکە عەیبە پشت لەمیللەتەکەت

بکەیت... کۆمەکی یەکێك نەکەی لەکاتی پێویستدا...لەپاشملە باسی کەسێك ناکەیت...چونکە هەموو ئەمانە لەگەڵ رەوتی کۆمەڵایەتیدا دەگونجێن. ئەوەی کە (خودی گەورە)ی هێز بێت بەئاسانی دەرگا لەخواستەکانی ئاوەڵا ناکات، وردو چاك دەیانپێوێتو قازانجو زیانیان هەڵدەسەنگێنێت، خۆ ئەگەر لاوازتریش بوو ئەوا بەپێچەوانەوە هەرچی بەخەیاڵیدا بێت دەیکا.

## دەسەڵاتو خێزان

خێزان سیستمێکی بچکۆلانەی کۆمەڵایەتییە کەپەیوەندی دەسەڵات تێیدا لەسەر بناغەی ئەکتواریتارە لەنێوان دایكو باوكو منالەکاندا. دەسەڵات هاوسەنگییەکی سرووشتی لەنێوان خێزانەکەدا دروست کردووە، هەریەکەیان جێگاو شوێنی خۆیان چاك دەزانن. زۆربەی زۆری هەڵوێستو هەڵسەنگاندنی باوكو دایکەکە رەنگی خۆیانی لەمنداڵەکاندا داوەتەوە (بۆ نموونە ئەگەر باوکەکە بەسیاسەتەوە، بازرگانییەوە، وەرزشەوە خەریك بێت ئیحتمالی زۆری هەیە منداڵەکانیشی شوێن پێی ئەو هەڵگرن)و بەرژەوەندی خێزانیش لەسەروو هەموو شتێکەوەیە. ئەم سیستمانە سنوریان هەیە لەگەڵ دەرەوەدا (لەگەڵ کەسو سیستێمەکانی دی)، ئەمەش پەیوەندی راستەوخۆی هەیە بەرادەی هاتنە ژوورەوەو چوونەدەرەوە، ئەگەر جۆرە هاوسەنگییەکی مەعقول نەبێ لەنێوانیاندا ئەوا دەسەڵاتی سیستێمەکە تووشی مەترسیو گێچەڵ دەبێت. دانەنانی سنوورێك بۆ دەوروبەرەکەی دەبێتە هۆی خنکانی سیستمەکە، لەکاتێکدا دانانی سنوور بەجۆرێك کەپەیوەندی لەگەڵ دەرەوەدا بپچڕێ دەبێتە هۆی تەنیا کەوتنەوەو گۆشەگیری. لێرەدا دەبێ ئەوە رونبکرێتەوە کە لەنێوان خێزاندا کۆمەڵێك بەهای کۆمەڵایەتی بەهێز هەن کەکار دەکەنە دەسەڵاتی ئەندامانی خێزانەکە، بۆ نموونە ناوو شۆرەتی خێزانەکەو، رادەی رقەبەرایەتیو گیانی تۆڵە سەندن، خۆشەویستیو برادەرایەتی، ئەو چاوەڕوانییە کەدایكو باوکەکە هەیانە لەمنداڵەکانیان. بەپێی گەشەکردنی



دەسەڵاتی منداڵەکان، لەکاتی گەورە بوونو خۆناساندنیاندا، دەسەڵاتی ناو خێزانەکە گۆڕانسازی تیا دروست دەبێت، کەزۆرجار دەگوێزرێتەوە بۆ خاڵێکی ترو هاوسەنگییەکی نوێ دروست دەکات.

## دەسەڵاتو گروپ

دەسەڵاتی گروپ پەیوەندی ڕاستەوخۆی هەیە بەئەندامەکانییەوە، تا چ رادەیەك بەرژەوەندی گروپەکە دەپارێزنو لایان مەبەستە. لەنێوگروپەکەدا دەسەڵات بەیەکسانی دابەش نەبووە، هەندێکیان دەسەڵاتیان لەراژەی ئەو زیاترەو هەندێکیان کەمترە، لەململانێکردنی نێوان ئەندامانی گروپەکەدا هاوسەنگیەکی سروشتی بۆ خۆی دروست کردووە. گۆڕانی ئەم هاوسەنگییە لەقازانجی دەسەڵاتی ئەندامە لاوازەکانە، کەلەوانەیە رۆژێ لەرۆژان هاوکێشەیەکی نوێ دروست کەن. لەلایەکی ترەوە، دەسەڵاتی گروپە بچکۆلەکان بەسەر ئەندامەکانیانداو، رادەی خۆڕاگرتنو بەرگریکردنیان زیاترە لەوەی لەنێوگروپە گەورەکاندا هەیە.

## دەسەڵات/ کۆمەڵ

کۆمەڵ لەرێگای دامو دەزگاکانییەوە بەئاسانی دەتوانێ کۆنترۆڵی ئەندامەکانی بکات. دەسەڵات لەڕێگای دامودەزگای سیاسیو ئایینی وئابووریو دەسەڵاتی شاراوەی کۆمەڵەوە دەسەپێنرێ بەسەر کۆمەڵەکەداو دەسەڵاتی دژ لەنێوگرووپە لاوەزەکانی کۆمەڵدا دروست دەبێت، ئەم بەرهەڵستی کردنەش لەرێگای دامو دەزگای راگەیاندن، مانگرتن، خۆ پیشاندان، نارەزایی دەربڕین دەخرێتە روو. بەهێزبوونی دەسەڵاتی گرووپە بێهێزەکان مەرجێکی سەرەکییە لەدابەشکردنی عادیلانەی پیداویستیەکاندا.

## دەسەڵات ـ بەکار هێنان:

زۆربەی جار لەنێو برادەرانەوە، لەنێو خێزانو دەوروبەرەکەمانەوە سیگناڵمان بۆدێت، ئێمە بەبێ ئەوەی رەتی کەینەوە، یا شیکەینەوە، یان بەگومان بین لێی دەیکەین بەهی خۆمان. کۆمەڵێك هۆی بەرگریکردنی بۆ دەدۆزینەوە. کاتێك دەبینین بەئەندامی پارتێك هەمووشتێك لەچوار چێوەی ئیدۆلۆگیاکەی ئەودا دەپێوین. بەکارهێنانی دەسەڵاتی بیروڕای ئایینی یاخود ئیدۆلۆگی لەرێگای چاندنیەوە لەمێشکی کەسێك یان چەند کەسانێکی تردا پێی دەوترێ دەسەڵاتی کۆنترۆڵکردن. بۆ نموونە منداڵێك زۆربەی زۆری ئاکارە کۆمەڵایەتیو مرۆڤایەتیەکانیو چۆنێتی بینینی بۆ ژیان لەنێوان خێزانەکەیدا وەردەگرێ. کابرایەکی سیاسی یاخود ئایینی دەتوانێ کار بکاتە سەر ئەندامەکانیو ئەوەی خۆی بەتەنیا بۆی ئەنجام نادرێ لەئەندامەکانیدا زیندووی کاتەوە، ئیتر لەژێر هەر ناوێکدا بێت(بۆ نموونە لەرێگای تۆڵە سەندنو سزادان، بەگوناھ دانانو بەچاکە لەقەڵەم دان...یاخود بەناوی دیکتاتۆرێتی پرۆلیتاریاوە) ئەندامەکانی وەك ئامرازێکی کۆنترۆڵکراو لەمردن سڵ ناکەنەوە بەکێڵگە لوغم چێنراوەکاندا تێدەپەڕن، دەڵێی بۆ سەر دەعوەت دەڕۆن(یەکێك لەسەرکردەکانی پرۆلیتاریا دەقیژێنیو فەرمان دەدا: بکوژن" چونکە دەسەڵاتی کوشتنمان لارەوایە) ئاکامی ئەم دەسەڵاتەش بوو کە لەماوەی ٧٣ساڵی دیکتاتۆری پرۆلیتاریادا ١٥ـ ٢٠ ملیۆن کەس بەکوشت چوونو لەبەندیخانەکاندا رزێنران.

## دەسەڵات ـ بڕیاردان

هەندێ هێزی بەئاگاییو بێئاگایی ناوەوەمان کار دەکاتە سەر چۆنێتی بڕیار دەرکردن. بۆ نموونە مەزاجی شەخسی، یان چۆنێتی کەڵك وەرگرتنو بەکارهێنان یان لۆژیك.



ئەگەر لەیەکێك بپرسیت: کەسی A چۆنە بەلاتەوە لەوەڵامدا ئەگەر کەسەکە لەمەزاجی شەخسییەوە نزیکبێت ئەوا دەڵێ کوڕی چاکە، خۆ ئەگەر دوور بێ لەمەزاجیەوە ئەوا وەڵامەکە بەپێچەوانەوە دەبێت، یان وەڵامەکە لەسەر رادەی قازانج وەرگرتن یان زیان لێکەوتن وەستاوە لەرێگای کەسی A وە . بەڵام بۆ وەڵامێکی مەنتیقیانە زانیاری لەسەرچاوەکەیەوە وەردەگرێت یان پرسیاری خەڵکێکی زۆرتر دەکاتو قسە لەگەڵ خودی کابرادا دەکات.

هەرکەسێك بگری، کەم تا زۆر لەپەیوەندیکردنیدا بەکەسانی ترەوە، ئەم سێ بینینەی هەیە، زۆر بوونی دەسەڵاتی مەزاجی شەخسی کارێکی نەگەتیڤ دەکاتە سەر هەڵبژاردنەکان.

بەکورتییەکەی دەسەڵاتی بڕیاردانی تەنیا کەسو کارتێکردنی کاریگەرترە لەگۆڕانسازیدا(ئیتر بەهەر جۆرێك بێت. پۆزەتیڤ یا نەگەتیڤ)وەك لەبڕیاردانی بنیاد نراو لەسەر بناغەی هەرەوەزیانەوە بەکۆمەڵ بۆ نموونە لەدەوڵەتە دیکتاتۆرییەکاندا کەدەسەڵات شێوازێکی زنجیرەیی هەیەو، هەروەك سەرگوزشتەی (Rashenvsky)، زۆر گرانە ئەڵقەی سەرەکی زنجیرەی دەسەڵات دیاری بکەیت.

هیتلەرو ستالینو فرانکۆو سەدام حسەین لەچاوتروکانێکدا بڕیاری مردنو ژیانیان دەرکردوە، خەڵکە ئاساییەکەش بۆ بەدەستهێنانی پێداویستەکانیان خۆیان گونجاندوە یان کەوتوونەتە بەر شاڵاوی هێزی دەسەڵاتی ئاشکراو نائاشکراوە، ئیتر هەر لەساتی پەیدابوونیەوە لەناو خێزانەکەیداو تا ژیانی لەدەوروبەرو نێو کۆمەڵگاکەیدا.

## دەسەڵاتو حکومەتی هەرێم:

میللەتی کورد لەژێر زەبری دەسەڵاتێکدا ژیاوە کەنە لەڕووی سیاسییەوە نە لەرووی مرۆڤایەتییەوە مافی پارێزراوە. کوشتنو بڕینو ماڵوێرانکردن کاری رۆژانەی ئەو دەسەڵاتە بووە لەدژیانو بەدرێژایی ٣٠ساڵ چاویان لەنێو جەنگو

خەباتی چەکداریدا کردۆتەوە، ماڵ نییە یەك دوو قوربانی نەدابێت‌و کەم شارو دێ هەیە لەگەڵ زەویدا تەخت نەکرابێ. دەسەڵاتی رژێم بەزۆری خۆی هاوسەنگییەکی دەسەڵاتی لەناوچەکەدا دروست کردبوو، ئەم دەسەڵاتە دوای گرتنی شارەکان گوێزرایەوە بۆ دەستی ئەوپارت‌و رێکخراوانەی کە لەکاتی خۆی، لەخەباتی چەکداریدا، توانای بەرێوەبردنی(٣ــ ٤)هەزار پێشمەرگەیان بووە. ئەمڕۆ لەناوچەکەدا ئەمان خاوەنی دەسەڵاتن، ئەمەش خۆی سرووشتی پەیوەندی دەسەڵاتە، کاتێك لایەنێك دەسەڵاتی کەم دەبێتەوە، ئەم کەم بوونەوەیە دەبێتە هۆی زیادبوونی دەسەڵات لەدەستەکەی تردا. جا ئەگەر گوێزانەوەکە بەخێرایی‌و کوتوپڕ بێت‌و خۆی بۆ ئامادە نەکرابێت لەسەرخۆ، ئەوا شیرازەی دەسەڵاتەکە تێك دەچێ، گەڕەلاوژەیەك دروست دەبێت کەهەر کەس بۆ خۆیەتی، هەر لایەکیان دەگری داخ لەدڵەو رقی دنیای لەدڵدایەو دەیەوێت تۆڵە بستێنێت. ئاڵمەو ساتمەکردن‌و تالانکاری‌و ئەم دیوو ئەودیو بردن‌و بڵاوبوونەوەی چەکێکی زۆر خۆی دیاردەی لاوەکی‌و هاوشانی دەسەڵات گوێزانەوەکەیەو، دەسەڵاتە نوێیەکەش ئەستەنگە لەسەرەتاداو، تا ماوەیەکی دورودرێژیش، بتوانێ رێگەیان لێبگرێت‌و ئەمن‌و ئاسایش‌و یاسا بهێنێتە کایەوە، ئەمەش پەیوەندی بەمیکانیزمی دەسەڵاتی تاکە کەسەوەیە. زۆربەی ئەو کەسانە لەقاوغەکەی خۆیان هاتوونەتە دەرەوەو کۆمەڵ‌و دەستەیەکیان دروست کردووە کەبەدوای بەرژەوەندی هاوبەشی پارەو دەسەڵات زۆربووندا دەگەڕێن‌و. گروپەکانی کۆمەڵ جێگۆڕکێ لەگەڵ یەکتردا دەکەن‌و، لەم گۆڕانسازییەدا هەندێ قازانج دەکەن‌و هەندێ زەرەر، هەندێ هەژارەو دەوڵەمەند دەبێت‌و هەندێکیش بەپێچەوانەوە. ئەمەش پەیوەندی زیاتر بەچۆنێتی گۆڕانی دەسەڵات‌و خەڵکەکە خۆی‌و ئەو ئابڵۆقەیەوە هەیە کە لەسەر ناوچەکەیە، نەك بەو تاقم‌و دەستەو سەرکردانەی کەناوچەکە بەڕێوەدەبەن. لەگەڵ ئەوتالانی‌و بێ یاسایی‌و برسێتیەی هاوشان لەپاڵ گۆڕانکاری ناوچەکەشدا هاتۆتە ئاراوە، زۆر لایەنی تری ژیان بەردەوامەو زۆر نیشانەی دڵخۆشکەر هەن کەمژدەی بزووتن‌و گەشەکردن دەبەخشن‌و. خەڵکی لەهەوڵێکی بەردەوامدان بۆ زاڵبوون بەسەر سەختیەکانی ژیانداو، دەتوانین بڵێین کە لەچەندین بواردا سەرکەوتن بەدەست هێنراوەو دەهێنرێ. بۆیە گەر بارودۆخی ولاتەکەمان لەگەڵ ولاتانی تردا. کەدووچاری گۆڕانکاری کتوپڕو گەورەی وەکو ئێمە بوونەتەوە، بەراورد بکەین باری ئێمە لەزۆر روەوە چاکترە. ئەگەر بێت‌و جەخت بکرێتە سەر کەمووکوڕییەکان، خۆم لەم سویدە دیموکراتیەدا، کە٢٠٠ ساڵە جەنگی بەخۆیەوە نەدیوەو کۆمەڵگاکەی لەسەر خۆو ئاساییانە گەشە دەکات، لەیەك هەفتەدا دەتوانرێت هێندە شتی خراپ کۆبکرێتەوە کەقێزت بێتەوە لەنێویدا بژیت.. لەولاتە سۆسیالیستەکانی پێشوودا(بۆ نموونە لەرووسیادا)، پاش ٦٠ـ٧٠ساڵ حوکمڕانی‌و دەوڵەت دروستکردن. هەر دوای گۆڕانی دەسەڵات جیاوازی چینایەتی یەکجار زۆر بووەو، کۆمەڵ‌و تاقمی مافیای بەهێز دروست بوون کەدەسەڵاتیان لەدەوڵەت زیاترەو دەستیان بەسەر بازاڕدا گرتووە. لەکوردستانی خۆمانیشدا نەك هەر کەموکوڕی، بەڵکو خاڵی پرشنگدارو گرنگ‌و دڵخۆشکەریشی تێدایە. بۆ نموونە هەست بەئازادی کردن، زۆربەی زۆری مامۆستایان‌و مووچە خۆران‌و کرێکاران بەبێ مووچە یان بەمەعاشێکی یەکجار کەم خەریکی بەڕێوەبردنی کارەکانی خۆیانن، بەشێکی زۆری لادێ‌و شارە رووخاوەکان ئاوەدان کراونەتەوەو خەڵکەکەیان گەڕاونەتەوە شوێنی خۆیان‌و خەریکی کشتوکاڵن. ئەمن‌و ئاسایش‌و یاسا وردە وردە خەریکە دەگەڕێتەوە بۆ هاوولاتیان. لەکۆتایی ئەم وتارەدا دەمەوێت ئەوە بڵێم کەباس کردنی کەمووکوڕیەکان دەبێ وەك پرۆسیسێکی سروشتی‌و ئاکامێکی گۆڕینی دەسەڵات لەناوچەکەدا باسی لێبکرێت. ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کەدەبێ لێیان بێدەنگ بین، ئەرکی سەرشانی هەموولایەك هەر لەتاکەکەس‌و خێزانەکانەوە تا بەتاقم‌و دەستە سیاسی‌و

پیشەییەکان دەگات، نەك هەر ئەوانەی دەسەڵات بەرێوەبردنیان لەدەستدایە، دەستنیشانکردنو چارەسەرکردنی ئەو کەموکوڕیانەیە. بۆ نووسینو ئامادەکردنی

ئەم باسە، ئەم سەرچاوانەم بەکار هێناوە:


1- Maurice Cronston. Makt och ide från Platon till. Halmstad.1970.
2- Noam Chomsky. Makt och motst ånd.Stockholm.1969.
3- Noam Chomsky. Makt och ideo-logi.Göteborg. 1988.
4- Rollo May.Makt och oskuld. Malmö.1974.
5- Antti Eskola.Social psykologi.Göteborg.1985.
6- Peterson Olof. Makt. Göteborg. 1991.
7- Israel joachim.Socialogi. Stosk- holm. 1984.
8- rosman Eliasson. Forskningse- tik och perspectiv.Lund.1987.
9- Lorens Lyttkens. Den displine- rade manniskan.stoskholm.1987.
10- Anders engqvist.Om konsten att samtala.
11- P.ål. Ropstad. Nårhet och di- stans. Lund.1985.
12- stig Fhaer. Psykologi som förståelse och kritik. Stockholm.1985.
13- philip Hwang. Barnets tidiga relationer.Lund.1987.
14- Åke pålshummar.Barnpsykol- ogisk forskning. Uppsala.1990.

# زەبرو زەنگ (Aggression)

## (( ئەركی سەرشانی مرۆڤ ئەوەیە، كەبتوانێ چاكەو خراپە لێك جیابكاتەوەو هەڵبژێرێ ))

### ئینجیل

ئەگریشوون كردارێكە، كە لەزیندەوەرێكدا ترس یان هەستی هەڵاتن دروست دەكات. ئەو هێزە جوڵێنەرەیە، كە لەتێكشكاندنو رووخاندا ((destruktivtet)) دێتە كایەوە، زیانێكە، رووبەڕووی خۆت یان كەسانی دی دەبێتەوە، ئەو گیانە رووخێنەرەیە، كەئاراستەی خۆت یان خەڵكی دەكەی. ئینسان تەنیا گیانلەبەرێكە كەبەبێ هۆی مەعقوول، زۆر جار ئەندامانی خۆی دەكوژێت، یان ئەشكەنجەیان دەدات. مرۆڤ تەنیا گیانلەبەرێكە، كەدەكوژێ لەپێناوی كوشتندا.

ئەگریشوون، بەشێكی زانستی دەروونناسییە، زاناكانی ئەم مەیدانە زانستییە، لەكلاسیكەكانەوە، تاسۆسیال سیكۆلۆگو ئیتیۆلۆگەكان، هەریەكەو بەپێی بۆچوونو لەروانگەی خۆیانو زانستەكەیانەوە، ئەگریشوونیان شی كردۆتەوە.

١ـ بۆچوونی ئیتیۆلۆگی (Etieologi) (زانستی جمو جووڵی حەیواناتو ئاژەڵ لەناویەكدا، یان سیكۆلۆگی ئاژەڵ). كۆرنس لۆرانس ـ ١٩٦٩، یەكێكە لەرێبەرانی ئەم بۆچوونە.

هێزی بزوێنەر (drift)، كەتەحەكووم لەهەڵسو كەوتی ئاژەڵدا دەكات، هەمان هێزی بزوێنەرە، كەلای مرۆڤیش هەیەو یەكێكە لەو هێزە دنەدەرە گەورانەی،



كەمۆتۆڕی بزواندنی هەڵسو كەوتە، لەرادەی رەگەزدایە، لەو كاتانەدا، كەبەهێزەكان بەرگریی لەلاوازەكان دەكەن.

..... لەمرۆڤیشدا وەك ئاژەڵ، بەرنامەی خۆیی هەیەو دەرفەتی دەرچوون بۆخۆی دەدۆزێتەوە. هەندێ جار بەشێوازێكی وا خۆی دەنوێنێ كە بەرووالەت لەتوندو تیژییەوە دوورە: بۆ نموونە لەهەندێ وەرزشی گرانو پڕ زەبرو سەختدا، یان لەهەندێ چالاكیی تردا، كە لەنێو كۆمەڵدا باوە. بەگوێرەی ئەم بۆچوونەی سەرەوە، جەنگبازیو گیانی رووخاندن، لەبەر ئەوەی لەمێشكی مرۆڤدا پرۆگرام كراوە، هیچ چارەسەرێكی نییە.

٢ـ بۆچوونی تیۆریی فێركردنی سیكولۆگی (inlarning psykologi)ن. میللەرو ج دۆلاردو ب. ف. شینەر رابەرانی ئەم تیۆرییەن. ساڵی ١٩٤٢ ن. میللەرو ج .

دۆلار تیۆریای زەبرو زەنگو تووڕە بوون (Aggression- Frostration) یان داناو بەگوێرەی ئەگەر كەسێك پێداویستییەكی زۆری بەشتێك هەبێت (وەكو خواردن لەبرسییەتیو ئاو لەكاتی تینوویەتیدا.. هتد) و لەمپەرێك لەبەریاندا وەستا بێت، ئەوا یان بەهەڵچوونو پەلاماردانی لەمپەرەكە یان بەهەڵاتنو راكردن لێی كۆتایی دێت. دانەران ویستویانە ئەوە بخەنە روو، كەئەو زەبرو زەنگو توندییەی مرۆڤ بەشێوەی جیاجیا دەری دەبڕێ، پابەندی پێداویستییە فسیۆلۆجیو دەروونییەكانەو پەیوەندییەكی راستەوخۆشی بەدەوروبەرەكەی مرۆڤ خۆیەوە هەیە. زەبرو زەنگو توندیی نواندن بابەتێكیشە كە بەراهێنانو زۆرلێكردن دەتوانرێ مرۆڤی پێ فێربكرێت.

ناوبراوان ساڵی ١٩٥٩ تیۆریای ئەگریشوونی بچكۆلەیان دارِشت. دەقی تیۆرییەكەش ئاوایە:

أ- پلەی هەڵچوونو تووڕەبوون پەیوەندیی بەئامانجەکەو رادەی رێگە لێگرتنی لەمپەرەکەوە هەیە.

ب ـ ئەگریشوونەکە ئاراستەی راستەوخۆی فاکتۆرەکە ـ لەمپەرەکە هۆی تووڕەبوونەکە دەکرێت.

ج ـ ئەگریشوون لەسەر رادەی هەڵچوونو تووڕەبوونەکە دەوەستێ.

د- دانگرتن بەئەگریشوونی ناوخۆدا بەپلەی سزادانەکەوە بەندە.

**تیۆرییەکانی فێرکردن:**

١- فێرکردن (inlarning) بەهەوڵو سەرنەکەوتن. ساڵی ١٩١١ سیکۆلۆگی ئەمریکایی Torn Dike بەتاقیکردنەوەیەکی ئەنجامی داوە" پشیلەیەکی برسیی خستۆتە قەفەزێکەوەو جۆرە تەڵێکی دوگمەداریشی لەناو قەفەزەکەدا داناوە، کەپشیلەکەی بەر بکەوتایە دەرگای قەفەزەکەی دەکردەوە. بێگومان پشیلەکە کەوتۆتە هەڵپەی دەربازبوون (بەهەوڵدانو سەرنەگرتنی)، بەتایبەتیش لەدەری قەفەزەکەوە کەمێك خواردن دانراوە...

پشیلەکە، جارێ. . دوو . . سێ هەوڵی داوەو ئەم پرۆسێسە دووبارە بۆتەوە. کاتی دەربازبوونی پشیلەکە، تا دەهات کورتتر دەبوەوە، تا وای لێهاتبوو هەر کەبەر دوگمەکە دەکەوت، دەرگاکەی دەکردەوەو خواردنەکەی دەخوارد.

٢- فێرکردن بەبەهێزکردنی رووداوەکان (reinforcement): ئەم بەهێز کردنە دوو جۆرە:

یەکێکیان بەهێزکردنێکی پۆزێتیڤانەی وەکو خەڵاتکردنو پیاهەڵدانو بەشانو باهۆدا هەڵگوتنە، ئەوی دیشیان نەگێتیڤیانەیە، وەکو چاو سوورکردنەوە لەمنداڵو سزادانی. بۆ نموونە، منداڵێك حەزی لەجۆرە خواردنێك نییە، بەڵام کەدایکی بەزمانی شیرین لەگەڵیدا دەدوێو باسی باشیی خواردنەکەی بۆ دەکاتو دەست دەکاتە هاندانو ئافەرین کردنی، خواردنەکەی لاخۆش دەبێو دواییش تۆزێك



شیرینی دەداتێ (ئافەرینو پیاهەڵدان لێرەدا گۆڕینی پۆزیتیڤیانەیە). ئەم مەسەلەیە لەسیاسەتدا دەبێ بەپڕوپاگەندە بۆ پارتییەك یان کۆمەڵێکی سیاسی.

لەپەروەردەکردنی منداڵدا، لێدانو چاو سوورکردنەوە چاك نییەو دەورێکی پڕ مەترسیی لەژیانی منداڵدا دەبێ، هەرچەندە لەسنورێکی دیاریکراودا بۆ نەهێشتنی کاری بێ کەڵکی وەکو جگەرە خواردن، یان خواردنەوە بەکار دێت.

ئەگریشوون پەیوەندییەکی بنچینەیی بەجۆری پەروەردەکردنەوەکەوە هەیە. ئایا جۆری فێرکردنەکە (Aktuaritet) هی قەناعەت پێکردن، یان بەر بەرەڵایی و سنوور بۆ دانەنان بێ. هەرچەندە ناتوانرێت پەروەردەکردنو جۆرەکانی بترنجێنرێتە ئەم سێ جۆرە چوارچێوەیەوە، چونکە بەهەزاران شێوەی تر تێکەڵاوی لەم جۆرەدا پەیدا دەبێو تەنیا رێژەی یەکێکیان لەوانی تر زیاتر یان کەمتر دەبێ. لەهەمان کاتدا منداڵەکە ئەوەندە بێ دەسەڵات نییە، کەباوکە چۆنی ویست ئەویش وای لەقاڵب بداو هەردووکیان کار لەیەکتر دەکەن.

**ئەگریشوونو لاسایی کردنەوە**

منداڵێك، کە لەناو خێزانێکی پڕ ئاژاوەو گیروگرفتو لێداندا پەروەردە ببێ، (بەتایبەتیش کەلێدان دەبینێ)، رەنگە، کاتێ دەچێتە کۆڵان بیەوێ لاسایی باوكو دایکی بکاتەوە، زۆر ئاسانیشە منداڵ لاسایی ئەو توندو تیژیو لێدانە بکاتەوە، کە لەتەلەفزیۆن یان لەکۆڵان دەیبینێ.

هەروەها تاقیکردنەوە دەوری لەفێرکردنی باشی منداڵدا. بۆ نموونە لەفێربوونی زمان یان شتی تردا....) هەیە. لەیەکێك لەو تاقیکردنەوانەدا دوو تاقم منداڵیان هێنا بوو، فلیمی سرووشتو جوانییان پێشانی یەکەمو هی کارەتێو توندو تیژیشیان بەتاقمی دووەم نیشان دابوو. دوایی منداڵانی هەر گرووپەو ویستبووی لاسایی ئەوە بکاتەوە کەدیبوی.

لەتاقیکردنەوەیەکی تردا کۆمەڵێ منداڵیان کردووە بەدوو بەشەوە، بووکە شووشەو شتومەکی نەرمیان داوە بەبەشێك‌و تفەنگ‌و دەمانچەو فرۆکەو تانکیش بەبەشەکەی دی... دوایی دەرکەوتووە ئەمانەی دوایی رادەی توندو تیژییان لەوانەی دی زیاترە.

**ئەگریشوونی بەخیلی‌و ئیرەیی بردن‌و تۆڵە سەندنەوە**

یەکێك دەیەوێ خاوەنی شتێ بێ‌و نییەتی یەکێکی تر هەمان شتی هەیە. بۆ نموونە A حەز بەوە دەکات بەڵام B هەیەتی. لێرەدا ئیرەیی لای A لەدژی B درووست دەبێ‌و زۆرجار گیانی تۆڵە سەندنی تیادا دەوروژێنێ. تۆڵەکەش بەکارێکی توندو تیژ (وەستاویشە لەسەر جۆری پێداویستییەکە) کۆتایی دێت. بەکورتی بۆچوونی فێرکردنی سیکۆلۆگی، دەوری بنچینەیی دەداتە دەوروبەرو لایەنە کۆمەڵایەتییەکان.

٣ـ بۆچوونی شیکردنەوەی کلاسیکییانە:

فرۆید لەدووەمین تیۆریی INSTINKT (زگماکی ـ غەریزی) ١٩١٨ـ ١٩٢٢ دا ئەوەی هێنایە دنیای دەروونناسییەوە، کەهەڵسوکەوتی مرۆڤ دوو جۆرە غەریزە زاڵ دەبێ بەسەریداو بەرێوەی دەبا:

أـ ئاروس (هی ژیان).

ب ـ تەناتۆس (هی مردن).

تەناتۆس ئەو گیانە رووخێنەرەیە، کەئاراستەی خۆ دەبێتەوەو شتێکی لەپشتەوە بۆ مرۆڤ ماوەیە (ئۆرگانیزمی ژیان دەیەوێت بگەرێتەوە ئەو نائۆرگانیزمەی لێی دروست بووە).

فرۆید لەتیۆری دووەمیدا لەو روانگەیەوە سەیری هەندێ گیروگرفتی ژیانی کردووە، کەمرۆڤ نەیتوانیوەو زۆر سەختە بەسەریاندا زاڵ ببێ، وەکو جەنگ، خۆکوشتن.. هتد.



فرۆید هۆو سۆنگەی جەنگی بردۆتەوە سەر ئینسیتنکتی مردن، واتە، میللەتێك ئەگەر دەرفەتی شەڕ بەخەڵك‌و میللەتانی تر فرۆشتنی نەبێ، ئەوا دەکەوێتە وێزەو گیانی خۆی‌و لەناوی دەبات.

٤ـ بۆچوونی سۆسیال ـ سیکۆلۆگی:

ئێرك فرۆم ساڵی **١٩٧٣** دوو جۆر تیۆریی لەمەیدانی ئەگریشووندا دارشتووە:

أ ـ هی چاك. ئەم ناوەشی بۆیە لێ نراوە، چونکە لەخزمەتی ژیان‌و تووخمەکەدایە.

ب ـ هی خراپ. ئەمەشی لەسەر بناغەی ئەو ئەزموونانە بنییات ناوە، کە لەبواری (فسلجه الاعصاب Neuro fysiologi) (سیکۆلۆجی حەیوانات Etiologi) و ئەنترۆپۆلۆگیدا کراون.

ئەم بۆچوونە دەیەوێ ئەوە بسەلێنی، کەئەگریشوون لەمێشکدا بەرنامە نەکراوە، بەمەش دەیەوێ بەرپەرچی بۆچوونی Eteologi، Instin بداتەوە.

ئەم تیۆرییە لای وایە، کەدوو جۆر ئەگریشوون هەیە، یەکێکیان چەشن چاکەو لەخزمەتی توخمەکەدایەو لەمێشکدا پرۆگرام کراوە. جۆری دووەمیشیان چەشن خراپەو لەمێشکدا پرۆگرام نەکراوەو مرۆڤ فێری دەبێ.

**Neorofysiologi**

مێشك ئەو بەشە گرنگەیە، کەپەیوەندیی راستەوخۆی بەهێزی بزوێنەری هەڵس‌و کەوتکردنەوە هەیە. ئەوەی لەم بوارەدا مەبەستەو دیاریکراون ئەو جێگایانەیە، کە لەمێشکدا پەیوەندیی راستەوخۆیان بەئەگریشوونەوە هەیەو بەرپرسن‌و توانای راگرتن‌و ئاراستەکردنی لای ئەو دەزگایانەیە.

چەند توێژەرەوەیەك توانیان بەشێوەیەکی سەرکەوتوو لەمێشکدا ئەلکترۆن بچێنن‌و بەهۆی تەلێکەوە هێزی کارەبایی پێدا تێپەرێنن. کە لەدەرەوە سیگنالی بۆ دەنێرێ. کەدەست دەنرا بەدوگمەی ناردنی ئەو هێزەداو دەگەیشتە ئەو جێگایانەی

مەبەستە، هەڵسوکەوتی جیاوازیان بەدوادا دەهات، هەندێکیان پێشاندانی توندو تیژیو هەندێکی تریان هی هێمن بوونەوە بوون: ئەمەش نیشانەی ئەوەیە، کە لەمێشکدا دوو جۆر ئەندام هەیەو هی ئەو دوو جۆرە کارەن کەباسکران.

دیلگا دۆس Delgados تاقیکردنەوەیەکی بەیەکێ لەو گایانەی لەمەکسیك شەڕە قۆچیان پێکراوە ـ کردووە، خۆشی بەئالەتی کۆنترۆڵەکەیەوە لەناو بینەراندا دانیشتووە. کاتێ کە، گاکە بەرەو رووی کابرای پەڕۆی سوور بەدەست دەهات، دیلگادۆس دەستی بەدوگمەی کۆنترۆڵەکەدا دەناو، کەگاکە دەگەیشتە لای کابرا هێمن دەبوەوەو نەیدەزانی چبکا. ئەمەش بەڵگەی هەبوونی دەزگایەکی کۆنترۆڵی ئەگریشوونە لەمێشکدا.

ئەگریشوون لەمێشکدا تەرازوویەکی کێش راگرتنی ناوخۆی هەیە، ئەگەر کارتێکردنی دەرەوەی لەسەر نەبێت. کار لەدەزگا کردن جاروبار بەهەچ هۆیەکەوە بێ ـ بۆ نموونە نەخۆشی یان.. ئەم بالآنسە لارەسەنگ دەکا.

٢ـ هەڵسوکەوتی ئاژەڵ لەگەڵ یەکدا (سیکۆلۆگی حەیوان)

دوو جۆر هەڵسوکەوت دیاریکراوە، لەکاتێکدا حەیوان ئازادە، یان کاتێ دیلی باغچەی گیاندارانە. ئەو زیانو ئازارانەی حەیوان لەراودا بەرەگەزەکانی تری دەگەیەنن بەئەگریشوون ناژمێردرێ. جیاوازیی ئەگریشوونی نێوان حەیوانو ئینسان لەوەدایە، بەدەگمەن حەیوانات زیان بەهاوتوخمی خۆی دەگەیەنێت. ئەو ئەگریشوونەش، کە لەنێوانیاندا پەیدا دەبێ بەهەڕەشەو گوڕەشەیەك کۆتایی دێ. کەچی، پەنا بەخوا: ئەم مرۆڤە دەکەونە گیانی یەکتریو قەسابخانەو زیندانی ئەشکەنجەو یەکتری بڕینەوە بۆ یەك ساز دەکەن. ئەگەر پلەی ئەگریشوونی مرۆڤ بەقەد هی شەمبازییەك بوایە، سەرانسەری ژیانی هێمنیو ئاسایش دەبوو.

ئەگریشوون لەنێو ئەو گیاندارانەدا، کەدیلی باغچەکەیانن.



Sollyzuckerman لەباغچەی گیاندارانی (Monkey Hill) لە لەندەن سالآنی ١٩٢٩ـ١٩٣٠ لێکۆڵینەوەیەکی دەربارەی تایەفە مەیموونی babian کرد، کە لەنزیکەی ٦٠٠م٢ دا دەژیان. ئەگەر ئەم جێگایە بەراورد بکەین لەگەڵ ئەوەدا، کە لەسرووشتی ئازاد دا تیایدا دەژین، یەکجار تەسكو تەنگەبەرە، لەئەنجامدا:

ـ ئەوانەی بەهێزبوون بەشێوەیەکی دڕندانە بێهێزەکانیان ئازار دەدا.

ـ دایك خواردنی لەبەچکەی خۆی دەفڕاند.

ـ مێینەو بەچکەکان قوربانیی ئەم بارە تەنگو ناهەموارە بوونو زۆرجار بریندار دەکرانو ژیینیان لێ تاڵ کرابوو.

ـ لە ١٦ نێرینە هەشتیان لەشەڕو بەیەکدادانداندا کوژران.

هەر بەهۆی ململانێو شەڕی دەسەڵاتەوە هەندێ لەنێرەکانی تریش بەنەخۆشی مردوون.

زۆربەی زۆری ئەو لێکۆڵینەوانەی لەم مەیدانەدا ئەنجام دراون، تەنگیی جێگاو شوێنیان بەهۆی ئەم شەڕو بەیەکدادانە داناوە، چونکە تەنگیی دەبێتە هۆی جمو جوڵ بڕینو بێماوەیی.

ب ـ ئەگریشوونی نێوان ئەو گیانلەبەرانەی بەئازادی لەسرووشتێکی بەربڵاو و بەریندا دەژین. زۆربەی تۆژینەوەکانی ئەم بوارە، سەلماندوویانە، حەیوان لێرەدا پەلاماری هاوڕەگەزی خۆی نادات، چونکە پەیوەندیی دەسەڵات بەشێوەیەکی هەرەمی دامەزراوە، ئەندامانی رەگەز جێگای خۆیان لەنێو شوێنە قەدەغەکەدا دەزانن. هەڵمەتو پەلاماری ناویان تەنیا هەڕەشەو گوڕەشەو بلۆف لێدانەو دەبێتە هۆی بەهێزکردنی نێوانیان (زۆربەی جار ئاگادارکردنەوەو خۆپیشاندانە). کە لەیەکێ لەو تاقیکردنەوانەدا، کە ٤٠٠ مەیموونی (بابیان)یان ماوەی بیست رۆژێك چاودێری کردووە، لەسەر کانیو لەکاتی ئاو خواردنەوەدا تەنیا بۆ ماوەی چەند

سانییەكو هەندێ جار پەلاماری یەكتریان داوە. ئەو سرووشتە بەربڵاوە پلەی ئەگریشوون دێنێتە خوارەوەو تەنیا ئەو جۆرە بایەلۆجییە پرۆگرامەی دەهێڵێتەوە، كەئەویش لەخزمەتی مانەوەی رەگەزەكەدایە.

**٣ـ ئەنترۆپۆلۆگی:**

هەندێ جار خەڵكی لەو بڕوایەدان، كەمرۆڤی ئێستا لەهی سەردەمی كولتوورە سەرەتاییەكان ئەگریشوون. توندو تیژیی كەمترە، هەندێ رای تر بەپێچەوانەی ئەمەوەنو دەڵێن پێشكەوتنی شارستانییەت جۆرو قەبارەی ئەگریشوون زیاتر دەكات. خۆ ئەگەر ئەو ئەگریشوونەی لەهەوڵو تەقەلای راوكردنو نان خواردندا پەیدا دەبێ، بەراوردی بكەین بەوەی شارستانییەت، ئاسمانو رێسمانە.

ئەو بنچینە بیلۆگییەی كە لەكوشتار كردندایە دەبێتە بەشێك لەسیكۆلۆگیی مرۆڤایەتیی، دەتوانرێت لەكاتی یاریی منداڵاندا، كەیاریی شەڕو جەنگ كردنو راوكردن دەكەن، هەست بەمە بكرێت، (كە لەو كولتوورە سەرەتاییانەدا بایەخی زۆری پێدراوە). هەروەها لێهاتوویی لەم بوارانەداو ئارەزووی شەڕو كوشتار گەشەیان پێ دەدرێتو دەبنە هاندەری منداڵ بۆ دابین كردنی جێگا لەداهاتوو و پاشەڕۆژداو بۆ ئەوەی رۆڵی خۆیان ببینن.

1968 S. L. Washhorn راستی پێكاوە، كە گوتوویەتی راستە مرۆڤ ئارەزووی كوشتنو رووخاندنی هەیە، بەڵام ئەمە هەموو مرۆڤایەتیی ناگرێتەوە، (تەنیا ئەو كولتوورە ـ ئەو كەسە سادیستانە دەگرێتەوە، كەدڵیان بەمە بەمە ئاو ناخواتەوەو سوكناییان پێی دێت).

لەناو توێژاڵەكانی خوارەوەی كۆمەڵدا، كەبێدەسەڵاتنو خۆشیی ژیانیان نییە ئەم پەتای سادیزمە بڵاوە، لەڕۆم چینە هەژارەكانی ژێرەوە بۆ ئەوەی كەمو كوڕیو نەدارایی خۆیان پڕكەنەوە شانۆگەریی سادیستانەیان نیشان دەدا. (كەسادیزم بنەڕەتیی ئەو شانۆگەرییانە بوو). هیتلەر لەئەڵمانیا لەنێو چینەكانی خوارەوەو



ناوەڕاستدا فەناتیكترین جەماوەری هەبوو. سادیزم لای چینی دەسەڵاتدارو دەوڵەمەندیش، لەو كاتانەدا دەردەكەوێ، كەماڵو مەڵكیان دەكەوێتە مەترسییەوە، هەر ئەم تەوژمەش چینی ژێر چەپۆكەو گەمارۆدراو وا لێ دەكات تینووی تۆڵەسەندنەوە بێ.

لەكلتوورە سەرەتاییەكاندا، ئاسەواری ئەوە نییە، لەكاتی راوكردندا خەڵكەكە ئازاری نێچیرەكانیان دابێت، بەپێچەوانەوە زۆرجار كەكووشتوونیان دوایی خەمیان بۆ خواردوون. بۆ نموونە ورچیان زۆر لا خۆشەویست بووەو بەباپیری خۆیانیان داناوە، كاتێكیش ناچاری خواردنی بوون، پێش ئەوە ئاهەنگێكیان بۆ ساز كردووەو داوای لێبوردنیان لێ كردووە. (J. Marhring-er 1951).

لێكۆڵینەوەی ٣٠ كولتووری سەرەتایی .

چەند توێژەرەوەیەك ئەم كارەیان كردووە، لەوانە Ruth، كەساڵی ١٩٣١ سێیانی ئەنجام داوە. ١٣ شیان مارگریت مید ساڵی ١٩٦١، ١٥ یان مەردۆك ساڵی ١٩٣٥، دانەیەكیان Cmtornbull ساڵی ١٩٦٥. شیكردنەوەی ئەم سێ كولتوورە بووە هۆی دابەشكردنییان بەسەر سێ سیستێمدا:

أـ دوژمنایەتیو توندو تیژی لەنێوان ئەندامانی ئەم كۆمەڵەدا زۆر كەم بووە. سزادانی سەختو جەنگو شەڕو شۆڕ رووی نەداوە، منداڵو ئافرەت رێزیان لێ گیراوە، سەودای قازانجو چاوچنۆكیو رەزالەت لەنێوانیاندا نەبووە، زۆربەی كات دڵخۆش بوونو مانای خەمو مەراقیان نەزانیوە.

ب ـ جەنگو پەلاماری یەكدانو هەڵچوونو تووڕەبوون لەناو ئەماندا كارێكی ئاسایی بووە، چونكە ململانێی دەسەڵاتی هەرەمیو هەر كەسە بۆ خۆی بووە. هەر چەندە ئەم جۆرە كولتوورانە دیاردەی توندو تیژیان لەناودا باو بووە، بەڵام ناتوانرێت كوتو مت حسابی كولتوورێكی گیانی رووخێنەرانەیان بۆ بكرێت، ئەندامانی ئەم سیستێمە خاوەنی موڵكی خۆیان بوون.

ج ـ بەکۆمەڵگایەکی رووخێنەر دراوەتە قەڵەم، چونکە گیانی رووخێنەر سەروەر بووە تیایداو دەسەڵاتی بەشێوەیەکی هەرەمیی توندو سەخت تێدا دابەشکراوە. بۆڕ بۆڕێن، ململانێو کێ برکێ، دوو دڵیو بێ بڕوایی بەیەکتر، ئارەزووی تاڵانو بڕۆی دەوروبەرو جەنگو هەرا بەرپاکردن خەسیەتی ئەم جۆرە سیستێمە بوون. ئەم لێکۆڵینەوانە ئەوە دەسەلێنن، کەئەگریشوونو گیانی رووخاندن لەمێشکی مرۆڤدا کۆك نەکراوە، کولتوورە سەرەتاییو سادەکانیش لەکلتووری سەردەمی ئێستا ئەگریسیڤ تر نەبوون.

**جۆرەکانی ئەگریشوون**

یەکەم ـ ئەگریشوونی چەشن چاك Godartad Aggression.

دووەم ـ ئەگریشوونی چەشن خراپ ـ Elakar- tad Aggression.

**ئەگریشوونی چەشن چاك**

١ـ Psedoaggression ئەو جۆرەیە، کەزیان بەکەسێکی تر دەگەیەنێو بێ ئەوەی مەبەستی بێ یاخود پێشتر نەخشەی بۆ کێشرابێت.

أـ ئەگریشوونی بێ مەبەست یاخود بەرێکەوت کاتێ بەرێکەوت گوللەیەك لەدەست دەرچێتو یەکێکی تر دەکوژێت، یاخود لەرووداوی ئۆتومبێلدا چەند کەسێك زیانیان لێ دەکەوێ. ئەم رووداوانە بێ نەخشەو بیرکردنەوە دێنە کایەوە (هەرچەندە هەندێ لەدەروونناسان بەجۆرێکی تر بۆی دەچنو لایان وایە، کەبزوێنەری راستەقینەی ئەمانە لەدنیای بێ ئاگاییەوە سەر هەڵدەدا) هەر چۆنێك بێت ئەم جۆرەیان بێ مەبەستە، هەرچەندە کەسانی تر زیانیان لێ دەکەوێ.

ب ـ ئەگریشوونی هەندێ کایەی وەرزشی ئەو جۆرە وەرزشانەی کە بەتوندو تیژی ئەنجام دەدرێنو مەشقیان لەم رووەوە بۆ دەکرێت وەکو شەرەشیرو تیرو کەوان، کەبەرقو کینەوە نینو مەبەستی شکاندنو بریندار کردنی کەسانی تریان لەپشتەوە نییە. ئەمەش زیاتر لەهونەری شەرە شمشێردا بەجوانی دەردەکەوێ.



ئەم بنچینەیەش بەهۆی لێهاتوویيو وردیو خۆڕاگرتنو توانای ماسوولکەکانو هێزی دەروونییەوە هەیە، لەئاهەنگە ئاینییەکاندا ئەم هونەرە باش دەردەکەوێ. لەم هونەرەدا هەر کەس زیانی بەر بکەوێ، ئەوە تاوانی نەزانیو ناکارامەیی خۆیەتی.

**ج ـ ئەگریشوونی سرووشتی زات**

ئەو ئەزموونانەی لەم بارەیەوە کراون، دەریان خستووە، کەهۆرمۆنی پیاو پەیوەندییەکی بەئەگریشوونەوە هەیە. Beeman لەساڵانی چلدا تاقیکردنەوەیەکی لەم بابەتەی کردووەو ئەمەش خەسیەتێکی شێوازی لێکۆڵینەوەی کلاسیکییە. Beeman مشکێکی ٢٥ رۆژ تەمەنیی هێناوەو خەساندوویەتی، دوای ئەمە مشکەکە زۆر هێمنو بێدەنگ بووەو ئەو هەڵسو کەوتە پڕ توندو تیژییەی جارانی نەماوە، بەڵام هەر کەدەرزیی هۆرمۆنی نێرینەیان لێداوەتەوە، دیسانەوە دەستی کردۆتەوە بەشەڕو شۆڕو پەلاماردان. کاتێ کارتێکردنی هۆرمۆنەکەش نەماوە، مشکەکە جمو جوولی لێبڕاوەو داسەکناوە. ئەمەش ئەوەی گەیاندووە، کەهۆرمۆنی پیاو گیانێکی توندو تیژی تێدایەو زیاتریش ئەرکێکی هەیە، کەهاندەری مانەوەو خەباتکردنە، لەکاتی جووت بوونیشدا بەچاکی ئەم دەورە دەردەکەوێت.

هەروەها سەبارەت بەگریشوونی سرووشت تیۆرییەکی تر هەیە، ئەویش ئەوەیە، کەرێژەی بەرزی ئەم هۆرمۆنە لەخوێندا بزوێنەری ئەگریشوونە، زیاتریش لای حەیوان ئەمە سەلێنراوەو لای مرۆڤ وانییە.

تەرکیبی ویراسیی ئافرەت بەدوو کرۆمۆسۆمی XX نیشانکراوەو هی پیاویش بەکرۆمۆسۆمێکی X و یەکێکی بە Y . رێژەی تەرکیبی ویراسیی XYY ، ١٠٠٠٠٠ دا یەك کەسە، ئەمانە یاڵایان زۆر بەرزەو ئەقڵیان کامڵ نییەو لەرووی فیزیکییەوە زۆر بەهێزنو ئارەزووی تاوانکردنیان هەیەو ترسناکن.

سالّی ١٩٦٥ ، لەیەكێك لەزیندانی ئیدنبوورگی ئەمریكادا، ١٦٧ بەندی پڕ مەترسیو تووشی تیابوو. لەمانە تەنیا حەوت كەسیان لەپشتەوە كرۆمۆسۆمی XXY یان، كەدەكاتە ٣,٥٪ بووە، ئەم ڕێژەیە بەبەراورد بەوەی لەنێو كۆمەڵدا هەیە جیاوازیی زۆرە.

ئەم جۆرە لێكۆڵینەوانە ئەنجامێكی تەواو و دیاریكراو بەدەستەوە نادەن، لەبەر ئەوەی هەندێ فاكتۆری تری وەكو دەوری كولتوورو دەوروبەریان تێدا ڕەچاونەكراوە. هەرچەندە ڕەنگە ئەو كرۆمۆسۆمەی هاندەری ئەگریشوونە دەوری ڕاستەوخۆو بنەڕەتیی لەم ڕووەوە هەبێت. شایانی باسە، (ئینسان ٢٣ جووت كرۆمۆسۆمی هەیەو ئەگەر هاتو بیستو یەكەمین جووت كرۆمۆسۆم لەجیاتی دوو كرۆمۆسۆم سێ كرۆمۆسۆم بێ، ئەو كەسەی لەدایك دەبێ مونگولیزم دەردەچێت).

٢ـ Defensiv Aggression ئەگریشوونی بەرگریی لەخۆ كردن، جۆرێكی چەشن چاكەو ڕووخێنەر نییەو لەخزمەتی مرۆڤایەتیدایە.

ئەمەش لەمێشكی هەموو مرۆڤو گیانلەبەرێكدا بەرنامە كراوەو لەكاتی مەترسیدا بەهانایانەوە دێت بۆ پاراستنی خۆیان، جا ئیتر خۆپاراستنەكە پەلاماردانی مەترسییەكە بێ ڕووبەروو، یان هەڵاتن بێ لێی. دووریش نییە، لەهەندێ هەلو مەرجی تایبەتیدا بگۆڕێ بۆ هی چەشن خراپ.

هەر لەڕووی مەسەلەی پرۆگرامكردنی مێشكەوە، دەبێ بوترێ، كەمێشكی مرۆڤ كۆمپیوتەرێكی مەزنەو ٩٠ بلیۆن دەماری تێدایەو هەر یەكەشیان هێزێكی بزوێنەریان پێدا تێدەپەڕێو توانای خۆگونجاندنی هەیە، نەك هەر دەتوانێ بیر لەئێستاو داهاتوو ڕابووردوو بكاتەوە، بەڵكو شیشیان دەكاتەوەو تۆماریان دەكات. هەروەها توانای شۆردنەوەی مێشك هەیە. ئەمەش لەكاتی جەنگدا بەڕوونی دەردەكەوێ، ئەو كەسەی بەشداریی جەنگ دەكات، پێویستی بە بەرگریی لەخۆ



كردن هەیە، زۆرجار سەركردەكان بۆ هەڵخەڵەتاندنی جەماوەر مەترسیی درۆینەیان هێناوەتە گۆڕێو خەڵكیان قەناعەت پێكردووەو ڕەوانەی كوورەی جەنگیان كردوون.

مرۆڤ لەژیاندا پێویستی بەدوو جۆر پێداویستی هەیە. یەكێكیان فسیۆلۆگییە وەكو خواردنو نان، ئاوو جلو بەرگ... هتد دووەمیان دەروونیی، وەكو مەسەلەی ئایینو ئایدۆلۆگیاو نیشتمانو خوو نەریتو ... هتد. ئەگەر هەڕەشەیەك ببێتە هۆی مەترسیی بۆ ئەمانە، دوور نییە بەرگریی لەخۆكردن لەچوار چێوەی خۆی دەرچێتو شەقڵێكی خراپكارانە بگرێتە خۆی.

٢ـ جۆرەكانی ئەگریشوونی بەرگری لەخۆكردن ( Defensiv Aggression).

**أـ ئەگریشوونی ئازادی..**

ئازادی بەنرخترینو گرنگترین بزوێنەری ژیانەو هەڵسوكەوتێكی تۆماركراوە. ئەو مەترسییەی هەڕەشە لەئازادیی مرۆڤ بكا، بەرپەرچ دەدرێتەوەو زۆربەی جار لەدنیای بێئاگاییدا خۆی ون دەكات، كە لە بەئاگاییشدا خۆی بینییەوە ئەوا بەرگریی ڕاستەوخۆ دەكات. ئەمەش ئەو بۆچوونە ڕەتدەكاتەوە، كەدەڵێ: ئازادی ویستن بەرهەمێكی كولتووریی تایبەتە، كەهەندێ فاكتۆری وەكو زوڵمو زۆری نێو كۆمەڵگاكە دروستی دەكات. لەسەرانسەری مێژووی مرۆڤایەتیدا جەنگ دژی زۆرداری هەڵگیرساوە، خوێن ڕشتن تینویەتیی شۆڕشەكانی ئەم جیهانەی شكاندووە، كەچی زوڵمو زۆر هەر لەشوێنی خۆیدایەتیو تەنیا دەسەڵاتێك گۆڕاوە بەیەكێكی تر.

شۆڕشەكانی رووسیا، ئەڵمانیا، فەرەنسا، ئەمریكا، چین، جەزائیر، ڤیتنامو گەلێ شۆڕشی چەكداریی تر جەماوەریان بەناوی هەبوونی چەسانەوەوە كۆكردۆتەوەو بەناوی ئازادییەوە بەرەو كەناری كۆیلایەتیی بەكێشیان كردوون. ئەمەش وەنەبێ، ئازاییو لێهاتوویی سەركردەكان بووبێت، نەء! بەڵكو نەبوونی

ئازایی‌و فاکته‌ره‌کانی تری ژیانی ئه‌و کۆمه‌ڵگایانه توانیویانه کڵاوی به‌رگریی له‌خۆکردن بنێنه سه‌ر جه‌ماوه‌ر، هه‌ر پێویستیان به ئاده‌یه‌ك بووه! ئازادی ڕۆڵێکی گرنگی هه‌یه له‌گه‌شه‌پێدانی ده‌روون‌دا، ئه‌مه‌ش ڕۆڵێکی باش‌و سوودبه‌خشی هه‌یه. نه‌بوونی ئازادی مرۆڤ ده‌کاته په‌ندو سه‌مه‌ره‌ی په‌ك که‌وتووی ناو کۆمه‌ڵ. ئه‌و ئه‌گریشوونه‌ی، که‌ده‌بێته هانده‌ری به‌رگری له‌شه‌ره‌ف‌و ژیان‌و ئازادی کردن، وه‌ك بزوێنه‌رێکی کاره‌بایی وایه‌و ته‌وژمێك ده‌داته مرۆڤو هه‌ر له‌سنووری کرداره بایه‌لۆگییه‌که‌دا ده‌مێنێته‌وه، ئه‌گه‌ر نه‌بێته هۆی کوشتارو رووخاندن. ئازادی مانای ده‌سه‌ڵات گۆڕین نییه، ئازادی مانای ئه‌وه‌یه توانای هه‌ڵبژاردن هه‌بێت. هه‌ڵبژاردن له‌نێو چه‌ند ئه‌ڵته‌رناتیڤێکدا. هه‌ڵبژاردنی دیارده‌یه‌ك، یان دژه‌که‌ی. هه‌ڵبژاردنی شته چاکه‌کان. ئه‌گه‌ر ئه‌گریشوونی ئازادی، له‌سنووری خۆی ده‌رنه‌چێ ئه‌وا شتێکی ڕه‌وایه.

**ب ـ ئه‌گریشوون‌و نارسیزم**( Aggression och Narcissim )

نارسیزم واته ئه‌شقی خۆبوون‌و له‌بیرکردنی ده‌وروبه‌رو په‌یوه‌ندیی بچڕان له‌گه‌ڵیدا.

أ ـ نارسیزمی سه‌ره‌تایی، سه‌ره‌تایی له‌دایك بوونی منداڵه‌که‌یه‌و تاده‌بێته چه‌ند ساڵێك، وه‌کو هه‌ستی سه‌رماو گه‌رما کردن‌و نووستن‌و حه‌ز گرتنه باوه‌ش‌و.... هتد.

ب ـ نارسیزمیSekundar: هه‌وڵدان له‌کاتی په‌یوه‌ندیی له‌گه‌ڵ ده‌وروبه‌ردا، بۆ ئه‌وه‌ی هه‌موو سه‌رنجێ ئاراسته‌ی ئه‌و بکرێت‌و به‌ده‌وری ئه‌ودا بخولێته‌وه. ئه‌گریشوون‌و نارسیزم په‌یوه‌ندییه‌کی پۆزیتڤیان هه‌یه، تاکو راده‌ی نارسیزمه‌که زۆرتر بێ ئه‌وا ئه‌گریشوونه‌که‌ش زیاتر ده‌بێ، به‌شێوه‌یه‌ك ئه‌گه‌ر نارسیسته‌که کۆسپێ له‌رێگه‌ی ئه‌م ئه‌شقه‌یدا بێته رێ به‌توندی به‌رپه‌رچی ده‌داته‌وه. ئه‌م به‌رپه‌رچدانه‌وه‌یه‌ش بنچینه‌یه‌کی بایۆلۆگیی هه‌یه‌و ئه‌رکێکی سۆسیۆلۆگیشه بۆ مانه‌وه‌ی مرۆڤو ئه‌گه‌ر



له‌سنووره بایۆلۆجیه‌که‌یدا بمێنێته‌وه، نابێته هی چه‌شن خراپ. ده‌بێ ئه‌وه‌شمان له‌یاد نه‌چێت، خه‌ڵك که‌م تا زۆر جۆره نارسیزمێکیان هه‌یه. نارسیست لای وایه خۆی بێ وێنه‌یه‌و ئه‌وه‌ی له‌مدا هه‌یه، لای که‌سێکی تر نییه(له‌شی خۆی، پێداویستیه‌کانی، بیرکردنه‌وه‌ی، سۆزی، موڵکی...) واته هه‌رچی ئه‌م خاوه‌نی بێ، ئیتر ئه‌وه نایاب‌و دانسقه‌یه، شتی خه‌ڵکی دیش بێ به‌هاو بێ نرخن. ناسیسته‌کان ئه‌گه‌ر یه‌کێك برینداریان بکات، یان له‌گفتوگۆو یاریکردندا، دۆڕاندی، ئه‌وا تێکده‌چێ‌و هه‌ڵسوکه‌وتی توندو تیژیی پێوه دیار ده‌بێ. ئه‌م جۆره که‌سانه گیانی لێ بووردنیان که‌مه‌و ناتوانن له‌خه‌ڵکی ببورن‌و ترسنۆکیشن، چونکه ترس هانده‌ری تۆڵه‌سه‌ندن‌و ده‌سه‌ڵات زیادکردنیانه. (کاتێ دووره په‌رێز ده‌که‌ونه‌وه، واهه‌ست ده‌که‌ن، که‌گشت دونیا دوژمنیانه. ئه‌وه‌ی ئه‌م مه‌ترسییه‌شیان ده‌ڕه‌وێنێته‌وه، زیاد بوونی ده‌سه‌ڵاتیانه). بۆ نموونه ئه‌م رووداوه باس ده‌که‌ین، جارێك نووسه‌رێکی ناسراو براده‌رێکی منداڵیی خۆی ده‌بینێته‌وه، ماوه‌یه‌ك به‌یه‌که‌وه داده‌نیشتن‌و برالی نووسه‌ر هه‌ر خه‌ریکی له‌خۆ دوان ده‌بێ، باسی نووسین‌و ڕۆمانه‌کانی ده‌کا... پاش ماوه‌یه‌ك، کابرا به‌خۆیدا دێته‌وه‌و ده‌ڵێ، ئه‌وه چییه من هه‌ر باسی خۆم ده‌که‌م، ئه‌ی تۆش باسێکی خۆت بگێڕه‌ره‌وه. قوڕبه‌سه‌ر هێشتا ده‌می نه‌کردۆته‌وه، نووسه‌رم نووسه‌ر قسه‌ی له‌ده‌م ده‌قۆزێته‌وه‌و ده‌ڵێ رات به‌رانبه‌ر ڕۆمانی چواره‌مینم چییه؟ نووسه‌ره ئه‌فه‌ندی ناتوانێ گوێی له‌باسی خه‌ڵکی تر بێ‌و تووشی ده‌رده((من)) بووه.. له‌سیاسه‌ت‌و ده‌سه‌ڵاتیشدا هه‌ر وه‌هایه، ئه‌و سه‌رانه‌ی ده‌سه‌ڵاتی هه‌ره‌مییان گرتۆته ده‌ست، به‌رده‌ست‌و ده‌وروپشت ده‌بێ هه‌ر گوێیان بۆ بگرن‌و ده‌ست له‌سه‌ر سنگی فه‌رمان جێبه‌جێ کردن بن. زۆربه‌ی هه‌ره زۆری خه‌ڵکیش ئاگایان له‌نارسیزمی خۆیان نییه، بۆ وێنه، شانازی کردن به‌بنه‌ماڵه‌و باوباپیرو یان منداڵی ئه‌وان زیره‌کن‌و نموونه‌یان له‌دنیادا نییه، فریشته‌ن... فریشته...! هتد. هه‌رچه‌نده له‌ڕوویه‌کی تره‌وه، ته‌وژمێکی پۆزێتیڤانه‌ی تێدایه، چونکه دڵسۆزی‌و وه‌فا ده‌ربڕینه

بەرانبەر بەخێزانو ماڵو منداڵ. هەروەك دەسەڵاتو سیاسەت لەمەیدانی زانست، هونەر، وەرزش، بازرگانیو كاری تریشدا نارسیزم هەیە. لەكاتی رەخنە لێگرتنیشدا ئەم مەسەلەیە بەئاشكرا دەردەكەوێ. زۆربەشیان پەیوەندییان لەدەوروبەر پچڕیوە، هەرچەندە مانا ئەوە نییە خۆیان لەبیر چوویێتەوە، چونكە جاروبار ئەم باسی خۆكردنو هەڵپەی ناوو شۆرەتە، لەهەست بەنوقسانیو كەمو كورتییەوە كردنە، باكابرا دان بەوەشدا نەنێ.. كەیەكێ باسی بكات، یان ناوی خۆی بەگەورەیی ببینێ، تۆزێ دومەڵو برینە قووڵەكانی ناخی سوكنایییەكیان پێدا دێت. لەئەدەبدا پەیوەندیی نارسیزمو داهێنان چاكەو دەبێتە هۆی داهێنانی ناوازەو هەوڵی بەرهەم بەخشینی دانسقە، هەر لەرێگەی بەرهەمی بەرزییەوەیە. زۆر كەس دەناسرێنو ئەمەش دەبێتە مایەی دڵخۆشییان بەژیان. وەنەبێ هەریەك لایەنەش بێ، زۆرجار نارسیزمەكە بەشێوەیەك زاڵ دەبێت، كە كارو بەرهەمی خەڵكی تر بەبێ نرخ دادەنێن. جادوور نییە، ئەم جۆرە نووسەرانە ئەگەر لەباتی قەڵەم خەنجەریان پێبوایە، لەكاتی رەخنە لێگرتنیاندا ئاراستەی سینگی بەرانبەریان بكردایە.

گرووپ نارسیزم: رۆڵێكی گرنگی لەسۆسیۆلۆگیدا هەیە. دەبێتە هۆی مانەوەی گرووپو بەخۆشەویستی مانەوەو نەشو نماو گەشە سەندنی پەروەردەیان دەكات. ئەمانە بڕوایان بەمەزنیو دادپەروەریو سەرڕاستیی گرووپەكەیان هەیە. ئەم رۆڵە دەتوانرێ رووخێنەر بێ یان بنیاتنەر. ئەم هەستە ئەو بۆشاییە پڕ دەكاتەوە، كە لەدڵو دەروونو دیدی چینەكانی خوارەوەی كۆمەڵدا، بەبۆنەی زروفی ژیانو كولتووری سەختو نالەبارییانەوە دروست بووە. لەسەردەمی هیتلەردا هەست بەم مسەلەیە دەكرا، چینەكانی خوارەوە، بۆ ئەوەی خۆیان بهێننە ریزی ئەوانەی سەرەوە، شانازییان بەوەوە دەكرد، كە هەرچەندە هەژاریش بن بەڵام لەهەمان رەگەزن.

لەگرووپەی گەورەكانیشدا، كەیەك ئایین، زمان، خاك كۆیان دەكاتەوە، گیانی نارسیزم لەنێو گرووپەكەدا بەهێزە، هەستی نیشتمان پەرستی، خاك، نەتەوە،



میللەت دروست دەكات. هەرچەندە جاروباریش هی خۆیان لا لەهی خەڵكی تر پێ چاكترە. جاری واهەیە، ئەم هەستە دەكەوێتە مەودایەكی توندوتیژەوە. بۆ نموونە، داگیر كردنی خاكی كۆمەڵێك خەڵك، یان خستنە ژێر پێو سووتاندنی ئاڵاو درووشمەكانی، یان تانەو تەشەر گرتنە سەركردەو پارتو رێكخراوەكانی... هتد بەدرێژایی مێژوو ئەمانە بوونەتە هۆی گەلێ كوشتارو ئاژاوەو بشێویی سەختو ناهەموار. نەك هەر مەترسیی دەرەكی، بەڵكو جاری وا هەیە لەناو گرووپەكان خۆیانداو لەسەر دەسەڵات دەبێتە هەرایانو شیرازەی پەیوەندیی نێوانیان تێكدەچێو بەردەبنە گیانی یەكدی. ئەم گرووپ نارسیزمەش ئەگەر هەڵسو كەوتی هەر لەسنووری بەرگریی لەگرووپدا بسوڕێتەوەو گیانێكی رووخێنەرانە تێدا پەیدا نەبێ، ئەوا هەر ئاساییە.

**ج ـ ئەگریشوون لەبەرەنگاریكرندا:**

بەرپەرچدانەوەی ئەو هەوڵانەیە، كەنیازی والاكردنەوەی دنیای ناوەوەو بێئاگاییان هەیە. كەسێك زۆر لەخۆی دەكاتو دەیەوێ ئەو شتانە لەیادی خۆیدا بسڕێتەوە. زۆر جار ئەمە لەنێوان پزیشكی دەروونیو نەخۆشدا روودەدات، كاتێ پزیشكەكە بۆبنەوان هەڵگرتنی گیرو گرفتو هۆی باری نائاسایی نەخۆشەكەی پەنا دەباتە بەر پرسیار كردنو بەگیرو گازهێنانی نەخۆشەكە بۆ دۆزینەوەی چارەسەرێك بۆی. . .نەخۆشەكە هەڵدێ لەوەلامدانەوەی راستو رەوانی پرسیاری پزیشكەكە. میكانزم بەرپرسە لەراگرتنی ئەم بالانسە، چونكە زۆربەی ئەو شتانە كەرەسەی دەست لێ نەدراونو بەزۆر ئاخنراونەتە دنیای بێئاگایی. یان لەهەڵدانەوەی تۆماری دەرووندا، هەندێ جار هەندێ فاكتو راستی دەكەونە روو، كەمرۆڤەكە دەخەنە مەترسییەوە، ئەمیش بۆ هەڵاتنو بەرپەرچدانەوەی ئەم كارە، پەنا دەباتە بەر جنێوو قسەی ناشیرین. جارێك نووسەرێك دەچێتە لای دەروونناسێكو باسی خۆی دەكا، كەئەم نووسەرێكی ـ بارەكەڵلا! ـ زۆر بەویژدانو خاوەن هەڵوێستەو پارەو ناوبانگی

لامەبەست نییە. تەنیا هەر خەریکی خزمەتەو هەر لەم روانگەیەشەوە، کۆمەڵێ دەسکاریی لەرۆمانیکیدا کردووە. دەروونناسەکە پێی دەڵی، تۆ بۆ پارەی زیاترو ناوبانگ ئەم کارەت کردووەو لەبەر ئەوەی خۆشت پێ‌هەڵناخەڵەتێو سوور دەزانی، ئەمە کاری کردەنی نییە، بۆیە واپەستیو خەمباری دایگرتووی. نووسەرە دەقیژێنێ بەسەریداو دەڵێ من بەناوبانگمو وەك تۆ هیچو پووچ نیم. لەزۆر لایەنەکانی ژیاندا، بابەتی وامان هەن، بۆ نموونە، ئەگەر بەکابرایەك بڵێی، کەخۆی بەشۆڕشگێر دەزانێ، تۆ بۆقازانجی تایبەتی خۆت خەریکی ئەم بەزمەی، خوێنت حەڵاڵ دەکاو دەیکاتە کاسە، خوانەخواستە! ئەگەر بەسەرکردەیەکت وت، تۆ بەرەو هەڵدێرمان دەبەیت.. یان هەندێ راستیی تری هەقو رەقی بۆ روون بکەیتەوە، ئەوا ئەگەر هەر زۆر راستاڵ بێ، قسەکانت دەداتەدواوە... ئەینا رەنگە هانی دەوروپشتو یەدەکەکانی بدا، کەهەرمێی گوڵاویت بۆ بکەن بەفلسێ...

گەلێك جاریش مرۆڤی قسەی هەق کردوو، لەناو کۆڕو کۆمەڵی سەرلەقێندا ناشیرینو ناحەز دێتە پێش چاو. هیتلەر، ستالین،.... . هەموو دیکتاتۆرەکانی مێژوو ناحەزانو ئەوانەی قایل نەبوون سەڵاواتیان لەدیاری بدەن، کووشتوونیان. توانیویشیانە سووكو ئاسان بەرەڵایان بکەنو ئەو مەترسییەش نەبوون، بەڵام هەر لەبەر ئەوەی میزاجیان تێکداونو ویستویانە نیهادو شەخسیەتیی ناوەوەو راستەقینەیان دەرخەن، لەناویان بردوون.

## د. ئەگریشوونی فەرمان جێبەجێکردن

ئەمەش لەکاتی جێبەجێکردنی فەرماندا بەدی دێو هەستی وێرانکاریی لەخۆوە نییە، هەرچەندە ئەم رووالەتەشی تێدا دیارە ـ بەڵکو هەر ئەرکێکی سەر شانەو دەبێ بکرێ. هەر بەم پێوانەیە ئەرك ئەنجامدان باشەو سەرپێچی کردن بەتاوان لەقەڵەم دەدرێ. ئیسماعیل پێغەمبەر هەر لەبەر خاتری خوا بوو، ئامادە بوو کوڕەکەی خۆی سەربڕێو بیکات قوربانی.(Andigone)(Kreon )ی کوشت



لەبەر ئەوەی لەیاساکانی دەوڵەت یاخی بووبوو. لەکاتی جەنگدا سیمای هەرە دیار هی دیسپلینو لەفەرمان لانەدانە. ئەو سەربازەی، ئەو فڕۆکەوانەی کەدەوری وێرانکارانەو کوشتنو بڕین دەبینێ، ئەگەر خۆی سادیستو نەخۆش نەبێت، ئەوا کارەکەی هەر بەجێبەجێکردنی فەرمانی سەرەوە دەژمێرێ. جیاوازییەکی زۆر هەیە لەنێوان سەربازێکدا، کەبەفەرمان دیلێك دەکوژێت، لەگەڵ سەرکردایەکدا، کەهەمان کار دەکا. ئەوەی یەکەم، فەرمانێکەو پێی دەکرێ، خۆی هیچ ئیرادەیەکی تێدا نییە، بەڵام ئەمەی دووەم بەهۆشیارییەوە ئەنجام دەداو وەڵامی نەخۆشییەکی دەروونییەتی. زۆر جاریش فەرمان جێبەجێکردن بەترسنۆکی دادەنرێ. یان ناتوانین کاری کرێکارانی فابریکەی چەك بەئەگریشوون دانێین. چونکە ئەوان مەبەستیان ئەوە نییەو هیچ بەرژەوەندییان لەو ماڵ وێرانکارییەدا نییە کەبەرهەمەکەیان رەنێوی دەهێنێ. دەتوانرێ ئەمە بخرێتە چوارچێوەی Psedo aggression وە چونکە تەنیا ئەنجامدانی کاری سەرەوەیە.

## هـ. زەبرو زەنگی جێپڕکەرەوە Kompensation Valdet

ئەوانەی سستو خاون، دەیانەوێ بۆ پڕکردنەوەی کونو کەلەبەری ژیانیان پەنابەرنە بەر توندوتیژی. مرۆڤ بۆتە قوربانیی یاسا سرووشتیو سۆسیالییەکانو ئەم یاسایانە یارییان پێ دەکات، هەرچەندە مرۆڤیش ئەوەندە دەستو پێ سپی نییەو توانای خۆی گونجاندنی لەگەڵ هەموو بارو زروفێکدا هەیە. ئەوانەش کەبتوانن چالاکیی بەرهەمدار بێننە ئاراوە، بەلێهاتوو ناودەبرێن. کەسی سستو خاو لەرووی گیانییەوە، پەنا دەباتە بەر توندوتیژیی فیزیکیو رووخێنەر. مرۆڤ هەروا دەستەوسان دانانیشێ، هەندێ جار خەڵك خۆیان دەدەنە پاڵ کەسێکی بەدەسەڵات، یان گرووپو پارتی، بۆ پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییەی لەناخیاندا هەستی پێ دەکەن.

لەو حاڵەتانەدا، کەدەچنەپاڵ گرووپو لایەنە پەڕەگرەکان، شێرگیر دەبنو کارو کردەوەیان دەبێتە توندو تیژیو ماڵ وێران کردن، هەروەك Callagala کەنموونەیەکی ئەم پەککەوتووانەیەو دەیووت((من تابژیم هەر دەکوژم، چونکە بەرزترین دەسەڵاتی رووخاندنم لەچنگدایە))

### و- زەبرو زەنگی ئامێری Instrumentell Aggresson

ئەم ئەگریشوونە بۆ گەیشتن بەئامانجو دابین کردنی حەزو ئارەزوو بەکاردێتو بەردەوام دەبێ تا بەدیهێنانی مەبەست، رووالەتەکەش وای کردووە، کەبەهی بەرگریی لەخۆکردن بژمێردرێت. هەرچەندە بڕوا وایە، لەمێشکی مرۆڤدا بەرنامە نەکراوە، وەك لەهی حەیواناتداو زیاتر بەهۆی دنیا دیدەیيو تاقیکردنەوە وەمرۆڤ فێری دەبێت (وەکو راوکردن لەکۆمەڵە سەرەتاییەکاندا...)، بەڵام شێریك، کەپەلاماری نێچیرێك دەداتو دەیکوژێت بەدەست خۆی نییەو لەمێشکیدا پرۆگرام کراوە.

### پێداویستییە هەرە پێویستەکان

دابینکردنی ئاوو هەواو نانو خواردنو پۆشاكو هەموو پێویستییەکی فسیۆلۆگیی تر لێکدانەوەیەکی تریان هەیە. بۆ نموونە، ئەگەر کەسێك برسی بێت، یان منداڵەکانی برسییان بێت، یان ئەو خێڵەی برسێتی پاڵی پێوەدەنێ، هەڵمەت بەرێتە سەر خێڵێکی تر بۆ مسۆگەرکردنی ئەم پێداویستیانە لەرووی فسیۆلۆگییەوە بەڕەوا دادەنرێت، چونکە دەبێتە هۆی ژیان باش کردنو خۆشی نانەوە لەناو کۆمەڵێ خەڵکدا. هەر چەندە زۆر جار ئاڵوگۆڕیان بەسەردا دێتو زۆر جار ئاودیوی سنووری فسیۆلۆگی دەبن. بۆنموونە، کاتێك سەرکردەی وڵاتێك، رووبەرووی کۆمەڵێ گیروگرفتی ئابووريو کۆمەڵایەتیی ناوخۆ دەبێتەوەو وا هەست دەکات، ئەمە دەبێتە مەترسییەك لەسەر دەسەڵاتی ئەو و باری وڵات ئاڵۆز دەکات، هەڵمەت دەباتە سەر وڵاتێکی تر بۆ لابەلاکردنی ئەم گیروگرفتە ناوخۆییانەو مسۆگەر



کردنی هەندێ دەسکەوت، لەوانەیە هەر بەمەشەوە نەوەستێو بکەوێتە ململانێی ئەو ئەو وڵاتانەی، یان ئەو لایەنانەی لەم رووەوە دەیانەوێ شان بدەن لەشانی. زۆرجاریش ئەم جەنگو کوشتارە، بۆ بەدەستهێنانی کەرەسەی خاو یان بازاڕ دۆزینەوەو... هتد دەکرێ.

### حەز لێکراو Onskavard

بابەتی پێداویستییە دەروونییەکانی مرۆڤ دەگرێتەوە، ئەو خواستو ئارەزووە ئایدیالیانەی هەنی، چونکە مرۆڤ تەنیا بەپێداویستییە فیسۆلۆگییەکانەوە دانامرکێو ناتوانێ بژی. بۆ نموونە، هەبوونی دەسەڵات، رەگەز، موڵکداری، ناوبانگو شۆرەت...) زۆر جاریش ئەم خواست بەدیهێنانە، شەقڵێکی نامرۆڤانەو نابەکارانە دەگرێتە خۆيو لەپێناوی دامرکاندنەوەی خواستو ئارەزوودا هەچ هۆیەك لەمەیدانا بێ دەخرێتە کار. کاتێ یەکێك دەیەوێ ببێتە سەرکردە، یان پلەو پایەیەکی دنیایی دەست بکەوێتو لەرێگای بەدیهێنانی ئەم مەبەستەشدا پێویستی بەخەڵك توقاندنو ئەشکەنجەدانو کوشتو بر هەیە، هیچ سڵ ناکاتەوەو بۆ مەبەستەکەی خۆی دەیکات، یان هەر رووالەتێکی تری لەجەوهەردا ئیجابیی ئەم مەسەلەیە، وەك بەدیهێنانی ئازاديو نەهێشتنی زوڵمو زۆر، ئەمیش هەر پێویستی بەتوندوتیژيو شەقو شەلاق هەیە. تلیاك کێشێك. کەگیانی هاتۆتە سۆلە سۆلەو پێویستی بەمسقاڵێ تلیاکە بۆ شکاندنی خرووی گیانی، تەنیا مەبەستێکی هەیە، ئەویش پەیداکردنی ئەو شتەیە، ئیتر جاری واش هەیە پیاو دەکوژێو دزی دەکا بۆ کڕینی تلیاکەکە. زۆرجار نووسەران بۆ ناوبانگو شۆرەت پەیدا کردن، دەگەڕێن بەدوای هەندێ پێداویستیی دەروونیی رۆژانەی خەڵکداو لەم ئاشە لێدەکەنو گرنگ لای ئەوان گەیشتنە بەمەبەست، بەوەی ناسراو بن.. لەمێژوودا وێنەی ئەم جۆرە نووسەرانە زۆرن کەبوونەتە داردەستی پیاو کوژانو دژمنانی مرۆڤایەتيو رووخێنەرانو بەبالاو شانو باهۆی ئەم جۆرە خەڵکانەیاندا هەڵداوە. لێرەدا

لەلایەکەوە کابرای نووسەر مشەمشێکی ناوبانگی کردووەو بافیشیش کراوەتە ورگی سەرکردەوە.. دەبێ جەختی ئەوەش بکرێت، کەتوندوتیژی تەنیا لەسنووری تەسکی کردارە بایەلۆگییەکاندا ڕەوایە، ئەینا کە لەو سنوورە دەرچوو، ئیتر جەوهەری رووخێنەرانەو داپلۆسینەرانە دەگرێتە خۆی.

## جەنگ گرنگترین نموونەی

(Instrumental aggression)ە بۆچوونی فرۆید لەم ڕووەوە ئاشکرا بوو، بەتایبەتی لەو نامەیەدا، کەساڵی١٩٣٢ ناردی بۆ Einstein بەناونیشانی جەنگ بۆ؟ و تیایدا روونیکردبۆوە کەگیانی رووخاندن لەمرۆڤدا نابێتە هۆی بەرپابوونی جەنگ. هۆی جەنگ، بەلای فرۆیدەوە، ناکۆکیی نێو گرووپەکانە، چونکە یاسایەکی گشتیی جیهانیی نییە، کەسنووریان بۆ دابنێت‌و نەهێڵێ پەنا بەرنە بەر زەبروزەنگ‌و بە شێوەیەکی ئاشتی گیروگرفتەکانیان چارەسەر بکەن. فرۆید گیانی رووخاندن بەهۆیەکی سەرەکی دانانێت، لەو کاتانەدا کەدەوڵەکان جەنگ لەدژی یەکدی بەرپادەکەن. ئەو بۆچوونەش کەدەڵێ، جەنگ کارێکی هەربووەو دەبێ‌و رزگاریمان لێی نییەو رووالەتێکی ئینسانی‌و بیۆلۆگی هەیە، ئەوەیان بیر چۆتەوە، کەئەو لایەنانەی جەنگ دەکەن، پێش ئەوەی دەستپێ بکەن نەخشەی تەواوی قانزانج‌و زیانی خۆیان دەکێشن، کەزۆربەی جار (ئەرز، کۆیلە، کەرەسەی خاوو بازاڕی تازە...) بۆلایەنی سەرکەوتوو دابین دەبێ. لەشەڕە ناوخۆییەکاندا زۆرجار چارەسەریی برایانەو ئاشتیانە وەلادەنرێ‌و هەر کەسە دەیەوێ بەرگریی لەدەسەلاٌت‌و پلەو پایەی خۆی بکات. ئەمەش هۆی ئەوە نییە، ئەو خەڵکە گیانی رووخاندنیان تێدایەو دوڕندەن‌و بێ ئایین‌و مەزەبن، بەڵکو ئەو توندوتیژی‌و کوشتن‌و بڕەی دەنرێتەوە خۆی گیانی تۆڵەسەندن‌و هەق کردنەوە دێنێتە کایەوە.



## جەنگی جیهانیی یەکەم‌و دووەم

جەنگ بەهۆی گیانی زگماکی رووخاندنەوە لەئادەمیزاددا هەڵناگیرسێ، بەڵکو هۆ بنچینییەکانی ئابووری‌و سیاسین‌و دەوڵەتە پیشەسازی‌و پێشکەوتووەکان بۆ دابەشکردنی کۆڵۆنیالییەکانیان لەناو خۆیاندا بەرپای دەکەن.. بۆ نموونە ئەگەر فەرەنسا ئەلزاس‌و لۆرین‌و رووسیا دەردەنێل‌و ئیتالیا لەم میراتییەدا شتێکی بەر بکەوتایە، گیانی ئەو هەموو ملیۆنە لەمردن‌و ناوچوون رزگاری دەبوو. هەر هەموو جارێکیش ئەم شەڕانە بەرگی ئاڵ‌و والای بەرگریی لەشەرەف‌و ئایین‌و کەرامەت‌و نیشتمان‌و چین‌و.. هتدی لەبەردەکرێ‌و پیاوانی ئاینیش لەهەر لایەك بوو بێتن موفەڕك‌و نوێژی سەرکەوتنیان بۆ ئەو لایەنە کردووەو ناوی جەنگی پیرۆزیان لێناوەو بە بەدەنگەوە هاتنی خوایان زانیوە. کاتێ ئەڵمانیا پۆڵەندی گرت، شەڕەکە ناوی بەرگریی لەخۆکردنی لێ نرابوو جەنگی دووەمی جیهانی دەستی پێ کرد.(چەند سەربازێکی SS بەجلی سەربازیی پۆڵەندییەوە بەلای ئیستگەی رادیۆی ((شلیسك))دا تێپەڕین، هەر بۆئەوەی خەڵکەکە بووروووژێنن‌و ئاگری تۆڵە سەندن لەگیانیاندا هەڵگیرسێنن. سەربازانی ئەڵمانیاو بەریتانیاو رووسیا بەزۆری بەکێشی جەنگ کرابوون‌و بەسەریاندا سەپێنرابوو، کەچی هەر لایەنەشیان لایان وابوو، ئەگەر شەڕ بدۆڕێنن، ئەوا دنیا ژێرەو ژوور دەبێتەوە. ئەو کەسەی دەکەوێتە شەڕەوە دەبێ بکوژێ، ئەینا بەرانبەر لەناوی دەبات. یان دەبێ هەڵبێت، هەڵهاتنیش لەشەڕدا زۆرجار سزای کوژرانە، هەرچەندە ئەمە نەبۆتە بەربەستی ئەوەی بەهەزاران رابکەن. مۆتیڤی شەڕ ـ وەك وترا ـ جۆراوجۆرە، وەك وەفاو خۆشەویستی بۆ خاك‌و میللەت، یان پارێزگاریی کردنی خەڵك لەمەترسی. لەکاتی جەنگدا هەندێك پێداویستیی ژیان بۆ سەرباز دابین دەکرێ... هەروەها لەکاتی ئاسایش‌و هێمنیدا هەندێ نەریتی مرۆڤانەی وەکو برایەتی‌و یەکسانی، هاوکاری... هەیە، بەڵام دیسپلینی جەنگ زۆرجار ئەم چەمکانەی فڕێ داوەتە ئاگری نامرۆڤانەی خۆیەوە...

بۆ نموونە لەجەنگی ئەهلیی دوای شۆڕشی ئۆکتوبەردا، برا برای کوشتووە، یان باوك کوڕ...

### نموونەی دووەم ـ شەڕی چەکداریی درێژخایەن

لەزۆربەی زۆری شوێنەکانی ئەم سەرزەمینەدا، ئازادی، دیموکراتی، یەکسانیو برایەتی ژێرپێ خراوە. زوڵمی باوك شایی بەردەوامە. کۆمەڵیش هەر لەسەر ئەم بنچینەیە دامەزراوە. ئازادیو زوڵمو دوو شتی دژ بەیەکنو لەیەك ئاوو هەوادا جێگەیان نابێتەوە. لەسیستەمە پاتریکالیسکەکاندا بەرەو پێشەوە(لەسەرخۆو بێ ئەوەی لەدەرەوە بەسەریدا فەرز بکرێ) رادەی زوڵمەکە کەم دەبێتەوە. هەروەك ئازادیو زوڵم، ئاوەهاش ئازادیو بەکارهێنانی توندوتیژی بەیەکەوە ناگونجێن. چونکە لەڕووی سۆسیۆلۆگییەوە ئازادی وا باسکراوە، کەئەگەر مرۆڤ تا توانای زیاتری هەڵبژاردنی ئازادانەی هەبێت، زیاتر توندوتیژیو ئاڵۆزیی خاو دەبنەوەو لەناو دەچن. لەکاتێکدا زوڵمو توندوتیژی یەکدەگرنەوە، ناوی ئازادی لەناواندا نامێنێ. زوڵم لەولاتێکی یەك میللەتیدا، وەك ئەوە نییە، کە لەمیللەتێك زیاتری تێدا دەژی. هەرچەندە زوڵم بەشێوەیەکی گشتی سیمایەکی دیاریکراوی هەیە، بەلام لەولاتی فرە میللەتدا فاکتۆرێکی تریشی دێتە پاڵ وەك (هەستی نەتەوایەتی، نارسیزمی گرووپ، هی ئایین...هتد) ئەم لایەنەی زوڵم لەولاتانی فرە نەتەوەدا دەبێتە هاندەری گیانی ئازادیو سەرفرازیو رزگار بوون لەدەست چەوسانەوە. هەروەها ئازادیو زوڵم لەناو رۆلانی ئەم دوو میللەتە، یان چەند میللەتەدا دوو شەقلی جیاواز وەردەگرێ، کابرای لەڕووی نەتەوەییەوە دەچەوسێنرێتەوە، سەرچاوەی هەموو زوڵمو زۆرێك دەباتەوە سەر ئەوەی ئەگەر ولاتی ئازاد، دەوڵەتی هەبوایە ... وا نەدەبوو. بەلام مرۆڤی ئەو کۆمەڵەی تر، دەگەڕێ بۆ ناتەواویی رژێمەکەو چۆنیەتی بونیەی سیستێمەکە... هەروەکو رادەی توندوتیژیش لەم دوو کۆمەڵەدا جیاوازە. ئەو توندوتیژییەش کوشتنو بڕینو ماڵ وێرانیی زیادی لێ دەکەوێتەوە.



گواستنەوەی دەسەلاتیش لەکۆمەڵێکەوە بۆ کۆمەڵێکی تر زەبرو زەنگی رووخێنەرانەی زۆری بەدوادا دێت. زۆرجار ئەو هەڵپەو پەلاماری چەك دانەو رێگای توندوتیژیی گرتنەبەرە، هەرچەندە بەڕواڵەت وا دەردەکەوێ، کەکارێکی چاکەو بەزوویی کۆتایی بەکارەساتو زوڵم دێنێ، بەلام لەجەوهەردا کۆمەڵێ گیروگرفتو تەگەرەی گەورە لەرێگای هێمنو پرۆسەی ئاسایی گەشەسەندنی ئەو کۆمەڵەدا دەهێنێ، ئەوە هەر لەوە بگەڕێ، کەدەبێتە مایەی لەناوچوونی ملیۆنان خەڵك... بۆ نموونە ئەگەر گەلی جەزائیر ملیۆنێکی بەکوشت نەدایە یان ڤیتنام ئەو هەمووە، یان کورد دەستی نەدایەتە جوولانەوەی چەکدار رەنگە لەحاڵەتی یەکەمیاندا ڤیتنامو جەزائیرێکی پێشکەوتووتر لەحاڵەتی دووەمیشیاندا، بەلای کەمەوە بارو زروفی کورد لەهی ئێستەی خراپتر نەبوایە، نموونەی واشمان هەیە، وەك یەکگرتنەوەی هەردوو ئەڵمانیا بێ دڵۆپێك خوێن... ئەوە نزیکەی ١٦ـ ١٧ ساڵە ڤیتنام ئازاد بووە، بەلام دەیان کێشەو برسێتیو ماڵ وێرانییو ئاسەواری جەنگ هەر وازی لێ نەهێناوە... توندوتیژی زۆرجار خۆی دەگۆڕێو بەگوێرەی هەلو مەرج بۆیەیەکی تر لەخۆی دەداتو دێتەوە سەر شانۆ، مۆدێلەکەی دەگۆڕێ...! ئەم نەخشەیەی خوارەوە ژمارەی ئەو جەنگە درێژ خایەنە گەورانەمان نیشان دەدا، کە لەنێوان ساڵانی(١٤٨٠ ـ ١٩٤٠) دا روویان داوە. سەیر لەوەدایە، کە لەسەردەمی تازەدا زۆرترن تا کۆن!

| ساڵ | ژمارەی جەنگ |
|---|---|
| ١٤٨٠ ـ ١٤٩٩ | ٩ |
| ١٥٠٠ ـ ١٥٩٩ | ٨٧ |
| ١٦٠٠ ـ ١٦٩٩ | ٢٣٩ |
| ١٧٠٠ ـ ١٧٩٩ | ٧٨١ |
| ١٨٠٠ ـ ١٨٩٩ | ٦٥١ |
| ١٩٠٠ ـ ١٩٤٠ | ٨٩٢ |

## ئەگرێشوونی چەشن خراپ
Elakartad Aggression

ئەو جۆرەیە کەمرۆڤ لەدژی خۆی یان دەوروبەری بەکاری دەهێنێ. ئەو گرو کلێپەیەیە، کەپەنگی خواردۆتەوەو بەشێوەی جۆراوجۆر دەرفەتی دەربازبوون بۆ خۆی دەدۆزێتەوە. ئەمەیان لەمێشکی مرۆڤدا پرۆگرام نەکراوەو لەمرۆڤدا بەفێربوون‌و پەروەردەکردن دەخولقێنرێ. ئەگەر هاتوو دەرفەتی دەرپەڕینی نەبوو، ڕووەو مرۆڤەکە خۆی هەڵدەگەڕێتەوەو جاری وا هەیە بەخۆکوشتن، یان بەخۆخستنە مەترسیەوە دەردەبڕدرێ‌و لەهەردوو حاڵەتەکەشدا، واتە لەدژی خۆی بێ یان دەوروبەر پێویستی بەهاوکێشی پارسەنگ ڕاگرتنێك هەیە. لەو کاتانەدا کەئاراستەی دەوروبەر دەکرێت، دەبێتە ئازاردانی یەکێکی تر(سادیزم)، یان هی ژیان وەکو(نکرۆفیل). زۆرجاریش لەمەیدانەکانی بازرگانی، وەرزش‌و گەلێ لایەنی تردا، ئاراستەی شتومەك دەکرێ، جاری واش هەیە، لەگەڵ جووت بوونی پیشەدا، گونج بۆ خۆی دەدۆزێتەوە، کاتێ مرۆڤ بەردەوام لەدەوڵەمەندبوونایەو هەموو سەرمایەو پارەو پوول زیادبییەك، سەرکوتی ئەگریشوونەکەی دەکات. چاکترە لەپێشدا باس لەهەندێ لەو تاقیکردنەوەو زانیارییانە بکرێت، کەساڵی ١٩٥٠ لەزانکۆی Berkی کالیفۆرنیا، هەندێ لەزاناکان بۆ ڕوونکردنەوەی پەروەردەی تایبەت بەشەخسیەتی ئەکتواریتار کردوویانەو Aktoritar Personality سەبارەت بەهەڵسوکەوتی باوی ڕۆژگاری نازی‌و هیتلەری ئەڵمانیا بووە. خەسیەتە هەرە دیارەکانی ئەو ڕۆژگارە، تووڕەیی‌و هەڵچوون‌و بێئارامی، بەچاوی نزمەوە سەیری ڕەگەزو خەڵکانی تر کردن، مل کەچکردنی کوێرانە بۆ لەخۆ بەرزترو داپڵۆسینی ژێردەستەو لەخۆ خوارتر... هتد هەروەها ئەوەشیان دەرخستووە. کەزۆربەی باوکان ڕەخنەی منداڵەکانیان بۆ قووت نەدراوە. ئەو ڕق‌و کینەیەی، کە لەدنیا بێ ئاگایی منداڵەکاندا پەنگی خواردۆتەوە، لەو جۆرە ڕەنگدانەوەیاندا خۆی نواندووە، کە



لەکۆمەڵدا باو بوو. نازییەکان سەرکەوتووانە، توانیان ئەم جۆرە مرۆڤە ئەکتواریتانەو زەبرو زەنگی پەنگخواردوویان ئاراستەی نەیارەکانی دەوروبەریان (هی جوولەکە، کۆمونیست‌و دیموکراتەکان) بکەن، بەکورتییەکەی، ئەوانەی لەپلەی کۆمەڵایەتیدا لەخواری ئەمانەوەبوون. باوك منداڵی فێری پشت بەخۆ بەستن نەکردووە. منداڵیش، کەگەورە بوو، لاسایی هەمان کرداری باوکی خۆیی کردۆتەوە. بۆ پڕکردنەوەی ئەم بۆشاییە لەشەخسیەتیاندا(پشت بەخۆ نەبەستن‌و بێ بڕوایی بەخۆ)، هەوڵیان داوە، دەستی چەوری هەندێ لاوازیی خۆیان بسڕن بەسەر خەڵکی تردا... (ڕەزیلی، خۆپەرستنی، گێرەشێوێنی... هتد) سەرەڕای بەچاوی نزمەوە سەیری خەڵکی تر کردن‌و ڕەخنەی کەس پەسەندنەکردن. لەرەش‌و سپی جیاکردنەوەشدا، هەر لایەنەی خراپەی خەڵکی تردەبینن‌و هەوڵدەدەن عەیب‌و عاری خۆیان بەسەد کووتە پەڕۆی ڕزیوو چڵکن داپۆشن. ئەگریشوونی چەشن خراپ ئەم جۆرانەی هەیە:

أـ ئەوەی ئاراستەی خودی خۆ دەکرێت وەکو ماسوشیستی، خۆکوشتن، بەنگکێشی... هتد.

ب ـ ئەوانەی ئاراستەی دەرەوە دەکرێن:

سادیزم Sadism
نیکروفیل Nekrofil
نارسیزم Narcissim

سادیزم: بەناوی ڕۆمانووس Margois desade (١٧٤٠ ـ ١٨١٤)ەوە بووە Sadism سادیزم بەلاتینی algolagnia یە algos. واتە ئازار، Lagneia ئارەزوو، لەزەت لەئازاری کەسێکی تر بینین. مەرج نییە، ئەمە هەر پەیوەندیی بەمەسەلەی جنسەوە هەبێت، بۆ نموونە دەسەڵات بەکارهێنانیش جۆرێکە لەسادیزم. دەروونناسەکان ئەمەیان بەترس لەخەساندن ( Kastaration)

Angesلێکداوەتەوە، گوایە کاتێ مندالّی نێرینە هەست دەکا لەمێینە جیاوازەو ترسی خەساندنی لێ دەنیشێ. کاتێ گەورە دەبێو لەگەڵ مێینەدا دەنوێ، بەوە ئەو ترسەی سەروەختی زوو دەڕەوێنێتەوە، کەئازاری مێینەکە بدات، گوایە ئەمە ترسەکەیە لەدنیای بێ ئاگاییەوە سەر هەڵدەدا.

## ئەنالّ سادیزم

دەروونناسان ئەمە بەهەڵسوکەوتێکی سرووشتیی کاتی مندالّی لەقەڵەم دەدەن، کەهەستی بەلەزەتی ماسەلکەکانی کۆمی Anal کردووە. لەپەروەردەی ئەکتواریتاردا ئارەزوویەکی دڕ ئاراستەی باوكو دایکی دەکات (لەبەرئەوەی دەیانەوێ بەئەکتورایتایی گۆشی بکەن). بەتایبەتیش مندالّ خۆی پیس دەکاتو لێدان دەخوات. پەنگخواردنەوەی ئەم جۆرە رووداوانە دوور نییە پەرەبسێنێو لەدنیای بێ ئاگایی مندالّەکەدا کۆببێتەوەو بگاتە پلەی ئەنالّسادیزم. ئەمانە کوژراوی دیسپلینن. کاتێك هیملەری بەردەستو کارگێڕی هیتلەر، فەرمانی گواستنەوەی ئەو هەزاران جوولەکەیەی بەشەمەندەفەر دەدا، وای دەزانی بارە خەڵووز بەڕێ دەکا. باسی ئازاییو لێهاتوویی دەکەنو کەچی خۆشیان لەهەموو کەس ترسنۆکترن.

## Masochism ماسۆشیزم

ئەم نەخۆشییە ناوەکەی لەهی نووسەری ئەڵمانی Von Sacher Masoch (١٨٣٦ـ ١٨٩٥) ەوە هاتووە. ئارەزوویەکی رەگەزیی نائاساییە، کەسەکە ئەگەر یەکێکی تر ئازاری بدات، ئارەزووی هەڵدەستێ. جۆرێکە لەئەو ئەگریشوونەی مرۆڤ ئاراستەی خۆی دەکات، وەنەبێ هەر پەیوەندیی بەجینسەوە هەبێ، خۆخستنە مەترسی، یان بچووکیی خەڵکی تر کردن، جۆرێکە لەرەنگدانەوەی ئەم جۆرە ئەگریشوونە.



## Sado Masochism سادۆماسوشیزم

هەردوو بابەتەکە بەیەکەوە کۆدەبنەوە. کەسەکە مەبەستی نییە ئازار بدرێت، چونکە نۆرەی ئەمیش دێت ئازاری خەڵك بدات. کەسی سادیست ناتوانێ بەتەنیا ئەم ئالۆشەی دامرکێنێ، پێویسی بە بەرانبەرێك هەیە. کەسەکەش دەبێ ژێردەستی بێتو ئازاری بدات. ئەم جۆرە کەسانە ئەگەر باسی خۆشەویستی بکەن، ئەوا هەر لەسنووری ماتریالّیەکەیدایە. نموونەی ئەم جۆرە ئەگریشوونە، ئەوەیە لەنێوان ژنو مێردێکدا روودەدات، مێردە لێی دەداو دەری دەکا بۆ کوێ دەڕوا بابڕوا، کەچی کەدەزانێ ژنە دەڕوا دەکەوێتە نزاو پاڕانەوەو باسی خۆشەویستیو بێ ئەو ژیان دێنێتە کایە.. خۆ ئەگەر خوانەکردە مندالّێکیان بوو، ئەوا بەستەزمانە دەخرێتە قەفەزەوەو ئازاد بوونی نییە. ئەگەر لەرووی کۆمەلایەتییەوە سەیری سادیزم بکەین، سادو ماسوشیزم دەبینین، ئەوانەی دوو دەوریان هەیە، مل کەچو پەڕۆن لەبەردەم سەرکردەکانیانداو دەبنە سەگی هاریش لەوانەی لەبندەستیاندان. ئەمە ناوەڕۆکی بنچینەیی گشت ئایدۆلوگییە فاشییەکانە.. روویەکی تری سادیزم ستالینیش دەگرێتەوە، کە لەکۆمەڵێکی سۆسیالیستیدا سەرکردە بووە. ئەم برادەرە تا خۆی لەژیاندا بوو، کەس نەك هەر نەیدەوێرا لەحوزووریدا بەڵکو لەپەناو پەردەشەوە رەخنەیەکی لێ بگرێ... نەك هەر لەولاتەکەی خۆیدا، بەڵکو لەناو زۆر لەو کەسانەشدا بیروباوەڕی کۆمۆنیستییان هەبوو، بەکابرایەکی نەمرو پیرۆز دادەنرا، تەنانەت، کەگۆرانیی (هاوڕێ ستالین) بوترایە وەك نیشانەی رێزو ستایش لێی خەڵك بەپێوە دەوەستا... ئیمڕۆش ئاشکرا بووە. کە١٥ـ ٢٠ ملیۆن کەس لەسیبریاو جێگاکانی تری سۆڤیەتدا، بوونەتە قوربانیی دەستی ئەو. ئەو کەسانەی ویستویەتی بیانگرێ، هێمنی کردوونەتەوە، دوای دوو سێ رۆژ گرتوونی، لەرووی دەروونیشەوە رووخاون، چونکە بەتەمای ئەوە نەبوون. د. ف. سیردیچ پێش گرتنی بەچەند رۆژێ، کۆبوونەوەی لەگەڵ ستالیندا کردووەو پێکی لەگەڵدا هەڵداوە.

جارێکیان نوێنەرێکی ئەرمەنی دەچێتە لای ستالین‌و ئەمیش بەگەرمەوە هەواڵی کارینی شاعیری لێ دەپرسێ‌و دەڵێ کەس بۆی نییە، لەگوڵ کالێری پێ بڵێ، کەچی پاش چەند مانگێك گیراوەو گوللەباران کراوە. خێزانی سیربروڤکیا گێڕاویەتەوە:《کەئێوارەیەکی ساڵی١٩٣٧، بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو لەلایەن ستالینەوە تەلەفوونێکمان بۆ کرا وتی بەرگوێم کەوتووە، کەبەپێ دەچیتە دەرەوە، ئەمەش بۆ ئێمە گونجاو نییە، ئەگەر ئوتومبیلەکەتان بۆ چاککردنەوە براوە، ئەوە من یەکێکی دیتان بۆ دەنێرم. کەچی دوای دوو رۆژ مێردەکەی بێ سەرو شوێن بووە... نموونەی کارە بەدو دیکتاتۆرییەکانی ستالین لەژماردن نایەن‌و... چەندان کتێبیان لەسەر نووسراوە... بەکورتییەکەی پەیوەندیی نێوان سەرکردەو دەست‌و پێوەندەکانیان لەسەر بنچینەی بەدواکەوتن‌و فەرمان جێبەجێ کردنی کوێرانە دامەزراوە. ئەوانەی بن دەستن، خاوەنی هیچ شتێکی خۆیان نین.

NEKROFILI نیکرۆفیل ـ خۆشەویستی مردوو و شتی بێ گیان. ئەم جۆرە ئەگریشوونە لەهەرە چەشنە خراپەکان‌و لەخزمەتی مردن‌و رووخاندندایە. نیشانەی نیکرۆفیلی:

أـ جووتبوون لەگەڵ ئافرەتی مردوو.

ب ـ سەرنج راکێشان بۆگشت شتێك، کەبۆنی گۆڕستان‌و مردنی لێ بێت.

ج ـ لەشی مردوو پارچە پارچە کردن.

دـ ئارەزووی بۆنی مردوو کردن، یان هەر شتێ بۆنی کردبێ.

خەسیەتی نیکرۆفیل:

لەشەڕی براکوژی ئیسپانیادا، ئاسترای ژەنەراڵ لەزانکۆی Salamansa وتارێکی خوێندۆتەوە، Unmnno ی فەیلەسۆفیش لەهۆڵەکەدا دانیشتبوو دوای ئەوەی ژەنەڕاڵ لێ بۆتەوە، یەکێك لەگوێگران هەستاوەتە سەر پێ‌و قیژاندوویەتی: ((بژی مردن!)). فەیلەسووف هەڵدەداتێ‌و دەڵێ، گوێم لەدەنگێکی نیکرۆفیلی بوو



(( بژی مردن!)) ژەنەڕاڵ ئاسترای کابرایەکی پەککەوتەیەو بەداخەوە! وێنەی لەئیسپانیادا زۆرن‌و ئەگەر خودا نەیەت بەدەمانەوە، وێنەیان لەزۆر بووندایە... مایەی دڵتەنگییە، کەکەسانی وەك تۆ خەڵك دوایان دەکەوێت، لەبەر ئەوەش نییە، کەئێوە توانای قەناعەت بەجەماوەر هێنانتان هەیە سەردەکەون نەخێر! هەر لەبەر زۆریتانە... چونکە ئێوە زۆرن. یەکێکی تر لەخەسیەتەکانی نیکرۆفیلی ئەوەیە. ئەم جۆرە کەسانە ئارەزوویان بەباسکردنی شتێك دێت، کەگیانی تێدا نەبێ، ((مردوو، بۆگەن، پیسی...)) لەم باسانە تێر ناخۆن‌و دەموچاویان پێی دەکرێتەوەو شاگەشکە دەیانگرێ‌و یەکێك لەنموونە درەوشاوەکانی ئەگریشوونی نیکرۆفیلی ـ هێتلەرە. وا دەردەکەوت، کەهیتلەر دەتوانێ دوژمنەکانی بهاڕێ، بەڵام ئەم ئارەزووەکانی لەو وەختانەدا بەدی دەهات، کەسەرانسەری میللەتی ئەڵمانیا لەفەوتان‌و لەناوچووندا بوون. ئەم جۆرە کەسانە حەزیان لەتاریکییەو لەرابووردوودا دەژین. دەموچاویان هەمیشە ترشاوەو حەزیان بەدیسپلین‌و فەرمان دەرکردنە. خۆیان ناتوانن بەدەستی خۆیان خەڵك بکوژن. وەك چۆن لەسێکسەوە ژیان بەدی دێت، ئەم نیکرۆفیلیانەش مردن‌و وێرانکاری دێننە گۆڕێ. کاتێ کەدەکوژن، مەبەست تەنیا خودی کوشتن نییە، دەکوژن، کەئازادیی لەخەڵك دەسەننەوە، دەکوژن کەسووکایەتیی بەئینسان دەکەن، کەتالانی دەکەن‌و دەیسووتێنن‌و جەزرەبەی دەدەن... دەسەڵات لای نیکرۆفیلی، تەنیا رێگایە بۆ بەدیهێنانی ئارەزووەکانی.. دەیانەوێ ژیان بگەێننەوە ئۆرگانیزمی سەرەتایی، کەوەختی خۆی لێی دروست بووە. هیتلەرو ستالین لەکوشتارو ماڵ وێرانی بێسنووردا ئارەزوویان پەرەی دەسەندو دەهاتە دی. کەسانی نیکرۆفیلی تری ناو کۆمەڵیش بۆ جێگا داگیرکردن، هەندێکی تر لەترساندا دەگەڵ کەوتبوون‌و ئاگایان لەدنیا نەبوو.. خەڵکی تریش هەبوون، بەدڵسۆزیی کوێرانەی (باوك‌و سەرکردە)وە تیان دەڕوانین.. ئەم سەرکردانەش ئەگەر زەنگی نیشتمان‌و خاك‌و میللەت‌و بەرگریکردنیان لێ نەدایە، ئەو هەموو جەماوەرەیان یۆ

خڕنەدەکرایەوە. (فیکتور فرانکل)ی دەروونناس، لەکتێبی ((ژیان دەبێ مانا بەخش بێ))دا. هەندێك لەو ئەزموونە تاڵەی خۆی باس دەکات لەزیندانی نازییەکاندا، لەگەڵ کوشتاری بێشوماری جوولەکەشدا، ئەو لای وا نییە، کەهەموو ئەو جوولەکانەی بەند بوون، مرۆڤی بەویژدانو خاوەن بیرو بڕوا بوونو هەمووSS ێکیش خوێنرێژو بێ ویژدان. چونکە هەندێ لەو بەندییانە، کەسەرەگوریسێکی چاودێری کردنیان بەمەبەستی بەکارهێنانی لەدژی هاوەڵەکانیان پێ دەسپێردرا. گەلێ لە(SS )ەکان خراپتر مامەڵەیان لەگەڵ خەڵکدادەکرد، کەچی هەندێ لەلێپرسراوی نازییەکان لەوەختی شەکەت بوونو نەخۆش کەوتنی دوای کاردا، لەگیرفانی خۆیانو بەدزییەوە دەرمانو خواردنیان دەداینێ. مەبەستی فرانکل لەم نموونەیە ئەوەیە، کەخەڵکی سادیی سەر بەو توێژاڵە هەیە، جابا بەندیش بێ، یان ئازادیش بێ، ئەمە بنەڕەتیی نییە. لەشەڕو جەنگی وڵاتاندا زۆربەی ئەو کەسانەی بەشداری دەکەن، خەڵکی ئاساییو ساغو بەزۆر بەکێش دەکرێت. هەر وەك خەڵکی سادیستو نیکرۆفیلیش هەنو حەزیان لەوێرانکاریو کوشتنەو ئەمانەش هێزی بزوێنەری کوشتنو وێرانکارین، جا لەهەچ بەرەو تاقمێکدا بن، فەرقی نییە... ئەوان لەزەت لەوێرانکاریو کوشتن دەبینن... ئازاد بن یان گیراو، لەم بەر بن یان لەوبەر.. چەپ بن یان ڕاست ... بۆ نوسینو ئامادەکردنی ئەم باسە، ئەم سەرچاوانەم بەکارهێناوە:

١ــ هینری گریتمان، سیکولوگی. لەندن. نیویۆرك، ١٩٨٦. (بەزمانی ئینگلیزی)

٢ـ کای دیوکسو لورانس دایتمان، سوسیال سیکولوگی. کالیفۆرنیا ١٩٨٦. (بەزمانی ئینگلیزی)

٣ـ لورانس کورنس، ئەگریشوون. ستۆکهۆلم، ١٩٦٩.

٤ـ ئیریك فرووم، مرۆڤی رووخێنەر، نیویورك، ١٩٧٣. (بەزمانی ئینگلیزی)



٥ـ ئیریك فرووم، دڵی ئینسان. نیویورك، ١٩٦١.

٦ـ فیکتور فرانکل، ژیان دەبێ مانابەخش بێ لووند، ١٩٨٦.

٧ـ یوهانسون، ئەگریشون، ئومیۆ، ١٩٨٢.

**ئاشناتان دەکەم بە ( حەمە دۆستان )ی رۆماننووس**

**سازادنی: نەوزاد عەلی ئەحمەد**

(حەمە قەرەداغی) ناسراو بە (حەمە دۆستان) ساڵی ١٩٥٩ لەشاری هەڵەبجە لەدایکبووە، قۆناغەکانی خوێندنی لە هەڵەبجەو کۆلیژی کشتوکاڵی لەزانکۆی سلێمانی تەواو کردووە، پاشان لەهەمان کۆلیژدا بۆتە موعیدو ساڵی ١٩٧٩ رووی لەوڵاتی سوید کردووەو لەسویدیش لەبوارەکانی سۆسیۆلۆژیادا دەستی بەخوێندن کردۆتەوەو بەکالۆریۆسی وەرگرتووە، ئێستا زیاتر موحازەرە لەبابەتی کۆمەڵناسیو دەروونناسی منداڵان دەڵێتەوەو زۆربەی کاتەکانی خۆی بۆ خوێندنەوەو نووسین تەرخان کردووەو بێجگە لە بڵاوکردنەوەی چەندان شیعرو دەیان وتار لەگۆڤارو رۆژنامە بەناوبانگەکانی سویددا، خاوەنی دوو رۆمانی چاپکراوە، رۆمانی (زریان)ی ساڵی (١٩٩٩) چاپکردووەو رۆمانەکەی تریشی (جێگایەك لەبەهەشت) ساڵی (٢٠٠٣) چاپکردووە، وا چاوەڕوان دەکرێت پاش چەند هەفتەیەکی تر رۆمانی (زریان) لەبەریتانیا بەزمانی ئینگلیزی بڵاوببێتەوەو ساڵی داهاتووش (جێگایەك لەبەهەشت) بەزمانی دانیمارکی چاپو بڵاوبکرێتەوە. (حەمە دۆستان) ئێستا لەشاری (ڤێستەرۆس)ی باکووری ستۆکهۆڵم دەژیو نزیکەی بیست ساڵە ژیانی هاوسەری پێکهێناوەو هاوسەرەکەی سویدییەو کچێکی سیانزە ساڵانەیان هەیە، تا ئێستا هەموو بەرهەمەکانی بەزمانی سویدی نووسیووەو ئەوە چەند مانگێکە دەستی بەنووسینی لێکۆڵینەوەیەك کردووە بەزمانی کوردی کە لەدیموکراتیو مەدەنیەت دەدوێت. بۆ ئاشنا بوونی خوێنەران بەناوەڕۆکی بەرهەمەکانی حەمە دۆستان ـ ی رۆماننووس ئەم چاوپێکەوتنەمان لەگەڵ سازدا.

*** چۆن لەسەرەتاکانی ژیانتدا کتێبو ئەدەبیاتت ناسی؟**

ـ لەخێزانێکی رووناکبیرو باوکێکی خوێندەوار پەروەردە کراوم. هەر زوو باوکم



بەجیهانی بەسەرهاتو هەقایەتی کوردیی ئاشنای کردم، زۆربەی شەوەکان بەسەرهاتێکی نێو کەلەپورو فۆلکلۆری کوردی بۆ دەگێڕایەوە، دوای ئەوەی چوومە خوێندنگەو فێری خوێندەواری بووم، وردە وردە لەگەڵ قۆناغەکانی خوێندندا کتێبی هەمە جۆرەشم دەخوێندەوە، سەرەتا شیعرم زۆر دەخوێندەوەو ئینجا لەرێگای کتێبی عەرەبییەوە زەخیرەی زانیارییەکانم دەوڵەمەند کرد، زۆربەی بەرهەمەکانی گۆرکی، تۆڵستۆی، سارتەر، چیخۆف، دۆستۆیڤسکی. . هتد خوێندۆتەوە، پاش چەندان ساڵ لەخوێندنەوە دەستم بەنووسینی شیعر کرد.

***لەکوردستان کاتی خۆی شیعرت بڵاوکردۆتەوە؟**

ـ شیعرم بڵاونەکردۆتەوە، چونکە زۆربەیان شیعری سیاسی بوونو بەشێك بوون لەواقیعی ئەوسا.

*** پەیوەندیت لەگەڵ هیچ حیزبو رێکخراوێکی کوردیی سیاسی هەبووە؟**

ـ پێویست ناکات باسی بکەم، بەڵام وەك گەنجانی ئەوسا منیش چەپ بووم.

***ئەی لەسوید چۆن پەرەت بەفێربوونو خوێندنەوەو نووسیندا؟**

ـ هەر زوو دەستم بەفێربوونی زمانی سویدیو خوێندنەوە کردو ناوبەناوەش شیعرم دەنووسی، لەبوارەکانی کۆمەڵناسیو دەروونناسیو خەمۆکیو منداڵان، خوێندنم لێرە تەواو کردووە.

***کەی یەکەمین نووسینت لەسوید بەزمانی سویدی بڵاوکردۆتەوە؟**

ـ ساڵی ١٩٨٤ یەکەمین نووسینم وتارێك بوو کە بڵاوم کردەوە، بەڵام پێویستە بۆ مێژوو ئەوە باس بکەم کە لەم وتارەدا هاوڕێیەکی سویدی یارمەتی داوم، هەر ئەو ساڵە یەکەمین شیعرم بەزمانی سویدی بڵاوکردەوە.

*** پاشان دەستت بەنووسینی رۆمان کردو ساڵی ( ١٩٩٩ ) رۆمانی ( زریان )ت بڵاوکردەوە لەم رۆمانە چ دەڵێیت؟**

ـ ئەم رۆمانەم بەحەوت ساڵ نووسیوە، کوڕی مامێکم هەبوو بەناوی (ئەنوەر

محەمەد ئەمین ناسراو بە هیوا) زۆر هاوڕێ بووین، پاش ئەوەی لەسێدارەدرا بڕیارمدا شتێکی بۆ بنووسم، ئەمەو بێجگە لەزێدی مندالێم کە هەڵەبجەیە، ساڵی ١٩٩٢ کە بۆ هەڵەبجە گەڕامەوە دڵم زۆر پڕبوو هەر جارێك کە دەچوومە سەر خانووە رووخاوەکەمان زۆر خەفەتم دەخوارد، ئەوسا پیرەژنێك بەنایلۆن لەچوار دەوری ئەو دیوارانەی کە لەماڵەکەمان مابوو خانووچکەیەکی بۆ خۆی دروست کردبوو، کە سەردانی کەلاوەکەم دەکرد پیرەژنەکە وایدەزانی دەریدەکەم، بەڵام من بەدوای بیرەوەرییەکانی مندالێمدا دەگەڕام، بەڕێککەوت لەسەر یەکێك لەدیوارە رووخاوەکاندا چەند دێڕێکی مندالێی خۆم دۆزییەوە کە بەچەقۆ کڕاندبووم، ئیتر ئەو ژیانەو کاریگەریی مندالێو گەورەبوونو شەهیدبوونی کوڕە مامەکەشم، کە ئەو لەموسڵ لەسێدارە دراو منیش هاتمە دەرەوە، کەرەسەی سەرەکی رۆمانی (زریان)ن، هەر زوو بڕیارمدا ئەو بابەتە بەسویدی بنووسم تا دەوروبەرەکەم بەلای کێشەی نەتەوەکەمدا رابکێشم.

***بۆ بەزمانی کوردی نەتنووسی؟**

ـ رەنگە بابەتێکی لەو جۆرە کاریگەریی زۆر لەسەر تاکی کورد جێ نەهێڵێت، چونکە زۆربەی ئەو رووداوانەی بینیوە یاخود رووبەڕووی بۆتەوە.

***هەڵە بجەی تۆ لەزریاندا تەواو دەبێت؟**

ـ نەخێر، بەرهەمێکی سیانییەو زریان رۆمانی یەکەمینە.

***زریان چەند لا پەڕەیە؟**

ـ چاپی سوییدیەکەی (٤٣٢) لاپەڕەیە، بەڵام وەرگێڕانە ئینگلیزییەکەی بریتیە لە (٥٠٨) لاپەڕە، کە وابڕیارە لەهەفتەکانی داهاتوو لەبەریتانیا چاپو بڵاوبکرێتەوە.

***چەند هەزار دانەی لێ فرۆشرا؟**

ـ نزیکەی (٥٦٠٠) دانە.



***(جێگایەك لەبەهەشت) دووەمین رۆمانی چاپکراوی بەڕێزتانە، ئایا مێژووی رووتت گواستۆتەوە؟**

ـ دەتوانم بڵێم لایەنی مێژوویی گرنگی بەرچاوی پێدراوە، بەڵام من مێژووی رووت نانووسمەوەو مەرج نییە نووسەر هەموو رووداوێك ببینێت ئینجا بیگوازێتەوە، ئاساییە فیکرە لەگێڕانەوەو سەلیقەی کەسی تر وەربگیرێت، یاخود خوێندنەوە ببێتە سەرچاوەی سەرەکی، ئەمانە لەلایەك هونەر کاری نووسینیش مێژوو، واقیع، خەیاڵ، ئەو دیوی شتەکان دەکاتە بەرهەمێکی ئەدەبی، لەم رۆمانەش باسی جەنگ دەکەم کە چۆن ژیان دەگۆڕێتو تا رەوتی ژیانیش گۆڕانکاریی بەسەر دێت.

***لەنێوان شێوەو داڕشتنی پەخشانو شیعردا زیاتر پشت بەکامەیان دەبەستێت؟**

ـ زمانی رۆمان پێویستە ئاسان بێتو زمانی سویدیش کۆنکرێتە، شێوەی داڕشتنی ئەدیبانی ئێرە لەگەڵ داڕشتنی ئەدیبانی ئێمە زۆر جیاوازە، نووسین لێرە نابێت رستەی زیادەو دووبارەو تا رووداوی دووبارەشی تێدا بێت. کارێکی قورسە کورد بێتو باسی رووداوێکی کوردستان بکەیتو بەزمانی سویدی بینوسیتو بەدالانەکەی زمانزانانی سویدیدا تێپەڕێتو بڵاوبکرێتەوە، بۆ نموونە ئەم پەندە کوردیە (خوا کڵاوی بۆ بەڕوو دروستکردووە) چۆن دەکرێتە سویدی، هەروەها بۆ نموونە نووسەر کە باسی پیاوێك بکات چوار کوڕی کوژرابێت، پێویست ناکات ئیزافەی تر بخاتە سەر ئەو رستەیە، چونکە پیاوێك ئەگەر چوار کوڕی کوژرا بێت حەتمەن خەم دەخوات، کەچی لەلای نووسەرانی خۆمان بۆ رووداوێکی لەو شێوەیە چەندان جار وشەی خەمو خەفەت دووبارە دەبێتەوە.

***رۆمانەکانت رەنگدانەوەیان لەدەزگاکانی راگەیاندنی سویدی چۆن بوو؟**

ـ بەجۆرێك باسیان کردن کە لای خۆم چاوەڕوان نەکرابوو، لەبیرمە کە یەکەم

بابەت سەبارەت بەڕۆمانی یەکەمم بڵاوکرایەوەو رۆژنامەکەم کڕی دەستم لەرزی، هەڵسەنگاندنی ئێرەو لای خۆمان زۆر جیاوازن، لێرە کەرۆژنامەیەك سەبارەت بەبەرهەمێك دەنووسێتو بەپۆزەتیڤ باسی دەکات، واتە ئەو بەرهەمە باشە، رەخنەگرانی ئێرە دەق هەڵدەوەشێنن، چەندان قەڵەمی ناسراوی سویدیو چەندان گۆڤارو رۆژنامەی سویدی لەبەرهەمەکانم دواون، تا ئێستا (٤٥)جار سەبارەت بە (زریان)و (٦٠) جاریش سەبارەت بە (جێگایەك لەبەهەشت) نووسراوە، بۆ کەسێکی بەئەسڵ بێگانەی وەکو من گرنگە کە کەناڵی چواری تەلەفزیۆنی سویدی (١١) دەقیقە بۆ لێدوانو گفتوگۆ کردن سەبارەت بەیەکێك لەرۆمانەکانم تەرخان بکات، بۆ نموونە هەموو ئەو نووسینانەی کە لەسەر (جێگایەك لەبەهەشت) نووسراون ئەگەر چاپیان بکەمەوە کتێبێکی گەورەی لێدەردەچێت.

***کتێبی دووەمت چەند هەزار دانەی لێ فرۆشراوە؟**

ـ چاپی یەکەم نزیکەی چوار هەزار دانەو چاپی دووەمیش (٥٨٠٠) دانەی لێفرۆشراوەو ٢٠٠٥ چاپی سێیەمی بە (٥٠٠٠) دانە چاپ دەکرێتەوە.

***ببورە، جێگایەك لەبەهەشت چەند لاپەڕەیە؟**

ـ (٣٥٩) لاپەڕەیە.

***رۆمانی (زریان)ت کراوەتە ئینگلیزیو وابڕیارە ساڵی ٢٠٠٥ لەبەریتانیا چاپ بکرێت، ئایا کرێی وەرگێڕانەکە لەسەر بەڕێزتانە؟**

ـ زیاتر لەبیست هەزار دۆلارم بەوەرگێڕەکە داوە، هەروەها دوو هەزار دۆلاری تریشم بۆ کورتکردنەوەو وەرگێڕانی بۆ سەر زمانی ئینگلیزی سەرفکردووە، تا ئەو کورتەیە بەسەر دەزگاکانی چاپو بڵاوکردنەوەدا بەمەبەستی چاپکردن دابەش بکەم.

***لەم مامەڵەیە زەرەر یان قازانج دەکەیت؟**

ـ وەکو ئاوی دەریایە بەڵام وا پێشبینی دەکەم بازاڕی فرۆشتنی باش بێت، دەزگاکانی چاپو بڵاوکردنەوەیش کتێبێك چاپ ناکەن ئەگەر قازانجی لێ نەکەن.



***تۆ رێککەوتنت لەگەڵ هیچ دەزگایەکی چاپی بەریتانیا سەبارەت بەو کتێبە ئیمزا کردووە؟**

ـ بەڵێ، رێککەوتنمان ئیمزا کردووەو تا پارەکەی خۆم وەردەگرمەوە لەکاتی فرۆشتنی کتێبەکەمدا (٣٠٪) وەردەگرم، پاشان (٢٠٪)م دەدەنێ.

***رۆمانێکی ترت بەناوی (وڵاتەکەی سەدام) نووسیوە، ئەو رۆمانەت کەی چاپ دەکرێت؟**

ـ چەند رۆژێکە بۆ دەزگاکانی چاپو بڵاوکردنەوەم لەسوید ناردووە، لەوە دەچێت پاش ماوەیەکی تر وەڵام بدەنەوە.

***بۆ (زریان) پێشەکی چەند کتێبت خوێندەوە تا رۆمانەکەت نووسی؟**

ـ ئەو رۆمانەم بە هەشت ساڵ نووسیو بۆ هەر رووداوێك لەرووداوەکانی نێو رۆمانەکەم چوار پێنج کتێبم خوێندۆتەوە، بۆ نموونە بۆ رووداوەکانی ئازار کە بەشێکی رۆمانەکەیە چەندان سەرچاوەم سەبارەت بەئازاردانو مێژوو و ئازادی لەکۆمەڵگای مرۆڤایەتیدا خوێندۆتەوە.

***لەرۆمانی (وڵاتەکەی سەدام)دا چیت سەبارەت بەلایەنی دەروونیو کەسێتی سەدام خوێندۆتەوە؟**

ـ بۆ نووسینی ئەم رۆمانە نزیکەی (٧٥) کتێبی هەمەجۆرم بەزمانی کوردیو سویدیو ئینگلیزیو عەرەبی خوێندۆتەوە، پێشەکی چەندان کتێبم سەبارەت بەلایەنی دەروونیو کەسێتی ستالینو هیتلەرو مۆسۆلینی خوێندۆتەوە، بۆ نموونە لەو رووەوە هەموو کتێبەکانی (ئێریك فرۆم)م خوێندۆتەوە.

*** لەزۆربەی کتێبەکاندا لەکارەساتی هەڵەبجەو ئەنفالو میحنەتەکانی تری کورد دەدوێت، ئایا ئەنفالو هۆلۆکۆست دوو رووداوی لەیەکچووی دووناوچەو مێژووی جیاوازن؟**

ـ ئەگەر وەك پرۆسێس هەردوو رووداوەکە بەراوورد بکەین، هیچ جیاوازیی

لەنێوانیاندا نییە، بەڵام لەپراکتیزەکردندا جیاوازن، جوولەکەکانیان بەسەر چەند گروپێکدا بەشکرد، زۆریان یەکسەر کوشتن، بەڵام بەشێکی تریان هێشتنەوەو کاری قورسیان پێ دەکردنو بەئازار دەیان کوشتن، ئەنفالی ئێمە وەك ئەو بەشەی هۆلۆکۆستەکە بە غاز دەیانکوشتن، من شوێنی رووداوەکەی هۆلۆکۆستم بینییووەو سەردانم کردووە، لەچەندان دیمەندا ئەنفالو هۆلۆکۆست لەیەك نزیکنو لەیەك دەچن، لەو شەش ملیۆن جوولەکەیەی کە بەر کوشتن کەوتن، دەبینین لەچەندان خێزاندا منداڵێك رزگاری بووە، ئەو دیمەنە لەپرۆسێسی ئەنفالیشدا هەیە.

***تۆ رۆژانە چەند کاتژمێر دەنووسیتو چەند کاتژمێریش دەخوێنیتەوە؟**

ـ پێش ئەوەی دەست بەنووسینی رۆمانێك بکەم، نزیکەی شەش حەوت مانگ بەردەوام تەنیا دەخوێنمەوە، کە دەستیش بەنووسین دەکەم، کاتەکەم بۆ نووسین تەرخان دەکەم، بەڵام لەحاڵەتی نووسیندا ئەگەر شتێك لێی بەگومان بم هەوڵدەدەم سەرچاوەی تر بخوێنمەوە، بۆ نموونە کەرۆمانی دووەم (جێگایەك لەبەهەشت)م نووسی لەشوێنێك باسی منداڵبوون دەکەم پێویست بوو زانیاریم سەبارەت بەحاڵەتی منداڵبوون هەبێت، ئەوەبوو چەندین سەرچاوەم خوێندەوە.

***دوا بەشی (رۆمان) ـە سیانییەکەت ناوی (باڵشکاوەکان) ـە، ئەم رۆمانەت کەی تەواو دەبێت؟**

ـ کەرەسەکانی ئامادەنو زۆربەی سەرچاوەکانی پەیوەست بەناوەڕۆکی رۆمانەکەم خوێندۆتەوەو دەستم بەنووسینی کردووەو ساڵی (٢٠٠٥) تەواو دەبێت.

***ئەی رۆمانی (تاوان)؟**

ـ ئەو رۆمانەم تەواو کردووە، بەڵام ئێستا ناتوانم بۆ دەزگاکانی چاپو بڵاوکردنەوەی بنێرم، کتێب کە چووە بازاڕ پێویستە بخوێندرێتەوە، واتە بفرۆشرێت، من ناتوانم لەدوو ساڵ کەمتر کتێبێك بخەمە بازاڕەوە، رۆمانێکیشم بۆ منداڵان نووسیوەو بۆ چاپکردن ئامادەیە، بەڵام ناتوانم ئەمڕۆ ئەویش بۆ چاپکردن بنێرم،



چونکە ئەگەر یەکێك لەکتێبەکانم بازاڕی فرۆشتنی فەشەل بێنێت، زەرەرێکی زۆرم لێدەدات، واتە زەرەر لەناوبانگ.

***لەو رۆمانەی بۆ منداڵانت نووسیووە وەك بەرهەمەکانی تر لەوێش باسی کورد دەکەیت؟**

ـ لەو رۆمانەمدا زیاتر سوودم لەو هەقایەتە کوردییانە وەرگرتووە کە باوکم بەمنداڵی بۆی دەگێڕاینەوە، رۆمانەکە لەناوەڕۆکدا رۆمانێکی کوردییە.

***شیعرت بەزمانی سویدی نووسیوە؟**

ـ بەڵێ، چەندان شیعریشم بڵاوکردۆتەوە، ئەگەر دەرفەتم هەبێتو کۆیان بکەمەوەو رێکیان بخەم، هەوڵدەدەم لەکتێبێکی سەربەخۆدا چاپیان بکەم.

***لەشیعرەکانیشتدا تا چەند لەکورد دواویت؟**

ـ زۆربەیان بەشێکن لەجەستەو رۆحی مرۆڤی کورد، بۆ نموونە شیعرێکم بۆ هەڵەبجە نووسیوە تا ئێستا لەحەڤدە شوێن، بڵاوبۆتەوە.

***پرسیارێکی تر، ئەگەر وتارێکی یەك لاپەڕەیت لەرۆژنامەیەکی سویدی بڵاوبکەیتەوە، چەند پارە وەردەگرێت؟**

ـ نزیکەی (٨٠٠) دۆلار وەردەگرم، بەڵام ئەو پارەیە لەرۆژنامەیەك بۆ رۆژنامەیەکی تر دەگۆڕێت، وتارم هەیە چەندان جار بڵاوکراوەتەوەو هەرجارێك پارەی خۆم وەرگرتووە.

***لەئەوروپاو وڵاتە پێشکەوتووەکاندا نووسەری دووەم هەیە، ئایا دەکرێت لەروانگەی نووسینەکانی خۆتەوە لەنووسەری دووەم بدوێیت؟**

ـ نووسەری دووەم بریتییە لەو کەسەی کەدەستنووسی نووسەر دەخوێنێتەوەو رەخنەی لێدەگرێتو هێڵی راستو چەپ بەسەر وشەو دێڕو پەرەگرافو لاپەڕە زیادەکاندا دەهێنێت، واتە پێش ئەوەی دەقێك بۆ دەزگاکانی چاپو بڵاوکردنەوە بنێردرێت، پێویستە کەسێك یان دوو کەس دەقەکە بخوێنێتەوەو مەسروفی نووسەری

دووەمیش نووسەری یەکەم واتە من پارەکەی دەدەم، نووسەری دووەم هەڵەکانی نووسەر دەست نیشان دەکات، من تا ئێستا کاریگەریی نووسینی کوردیو نووسەرانی خۆمانم لەسەرە، کتێبی (جێگایەك لەبەهەشت) وەردەگێڕدرێتە سەر زمانی دانیمارکی تازە بەتازە دوای ئەوە بەسویدی هەڵەی لێگرتووم بەتایبەتی لەو شوێنەی کە باسی خۆشەویستیو رۆمانسی دەکەم وەك کوردێك رستەکەم دارشتووەو چەمکەکەم نووسیوەتەوە، هیچ نووسەرێك ناتوانێت بەیەك هەناسەو هێز تەواوی لاپەڕەکانی کتێبەکەی دابڕژێتو بەلانسی نووسینەکەی رابگرێت، نووسەری دووەم لەکتێبی یەکەمدا نزیکەی (٨٠ ـ ٩٠) لاپەڕەی لێ لابردووە.

***چۆن دەڕوانیتە خەڵاتی نۆبڵ؟**

ـ ئەگەر مەبەستت منە، پێویستە هەر لەتەلەفزیۆن سەیری بکەم، بەڕای من بەخشینی خەڵاتەکە زیاتر پەیوەندی بەسیاسەتەوە هەیە، پێشەکی بڕیار دەدەن ئەمساڵ چ ناوچەیەك لەجیهان خەڵات بکەن.

***تۆ پێشبینی دەکەیت لە پاشەڕۆژدا یەشار کەمال نۆبڵ وەربگرێت؟**

ـ ساڵێك لەساڵەکان کاندید کرا، بەڵام نەچووە سەرەوە، نووسەرێکی گەورەیەو نووسینەکانی بەهەموو زمانەکانی جیهان بڵاوکراونەتەوە، ئەو بۆ من قیبلەیە، یەشار کەمال هەر ئەوەی هەیە ئەو خەڵاتەی پێ رەوا ببینرێت، بەڵام بەداخەوە نەیتوانیوە بەرامبەر بەکارەساتەکانی کورد خاوەنی دەنگی خۆی بێتو قسەی خۆی بکاتو وەك یەکێکی چالاك لەگۆڕەپانەکەدا دیار بێت بەتایبەتی لەبوارەکانی سیاسەتو گۆڕانکارییەکاندا.

***بۆ مەسەلەی پاراستنی مافی نووسەر، چۆن سەیری نووسەرانی کوردستان دەکەیت؟**

ــ بەداخەوە مافیان خوراوەو بەرهەمی هیلاکی خۆیان ناخۆن. لای خۆمان سیاسەتمەدارو پزیشكو چەند توێژێکی تر بەرهەمی ماندووبوونەکەیان دەخۆن،



بەڵام نووسەرەکانمان تا ئێستا مافیان نەپارێزراوە، بۆ نموونە من لێرە هەموو مافێکم پارێزراوە.

***بێجگە لەو بەرهەمە ناوبراوانەت کە بەزمانی سویدی نووسیوتن، ئایا هیچ بەرهەمێکی خۆت بەزمانی کوردی نووسیوە؟**

ـ ئێستا کتێبێك بەناونیشانی (دیموکراتی تەنیا رێگەیەکە) بەزمانی کوردی دەنووسم کە وابڕیارە لەسلێمانی چاپبکرێت.

***لەکۆتاییدا چی بەخوێنەری کورد دەڵێیت؟**

ـ هیوادارم کە بابەتێك دەخوێننەوە بەچاوی رەخنەگرانە بیخوێننەوەو زیاتر حیساب بۆ ناوەڕۆكو داڕشتنەکە بکەن نەك ناوی نووسەر.